**باس و توێژینەوە بڵاوکـــراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کـــوردی دەربـــڕی بیـــر و بۆچوونـــی توێژەرانـــن نەک دەستەی نووســـەرانی گۆڤار**


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەسازی: عیسام موحسین.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
شیلان جەلال.
- چاپ: چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر.
- تیراژ: ٧٥٠ دانە.

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی – القسم العربي



### English part

# ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوە
# لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

١- گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی، گۆڤارێكی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی كورد و كوردستان، بڵاودەكاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێكی دیكە بڵاو نەكرابێتەوە یان بۆ بڵاوكردنەوە وەرنەگیرابێت.
٢- زمانی كوردی زمانی سەرەكی بڵاوكردنەوەیە لە گۆڤارەكە، بەڵام لێكۆڵینەوەی زانستی بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاودەكاتەوە.
٣- هەر بابەتێك كە بۆ گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی دەنێردرێت، دەبێت ناونیشانی باسەكە، ناوی نووسەر، شوێنی كارەكەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەكەی لە سەر لاپەڕەی یەكەمی لێكۆڵینەوەكە نووسرابێت.
٤- نووسەر دەبێت پوختەی باسەكەی بە هەردوو زمانەكەی دیكە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەكە لە كۆتایی توێژینەوەكە بنووسێت، كە نابێت لە یەك پەڕەی (A4) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەكییەكانی توێژینەوەكە بخرێنەڕوو.
٥- لە دوای پەسەندكردنی باسەكە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستیەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوكردنەوەی بە توێژەر دەدات.
٦- بۆ ئەوەی بابەتەكە لەگەڵ ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوەی گۆڤارەكەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێك بیرۆكەی سەرەكی توێژینەوەكە نەگۆڕێت.
٧- ئەگەر باسەكە لە بارەی ساخكردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەكە بە پێی بنەما زانستییەكان بێت و چەند لاپەڕەی كۆپیكراوی دەستنووسەكە و شوێنی وەرگرتنی، كۆد و جۆری دەستنووسەكە (دەستنووس، چاپ، مایكرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.
٨- ئەگەر ڕێبازی لێكۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناونیشانی باسەكە،

توێژینـەوەی بابـەت، شـێوازی بەکارهێنانـی سـەرچاوە و ڕێکخسـتنی پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێتن، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێتن فەرامۆش دەکرێن.

٩- دەبێـت باسـەکە دانەیەکـی لەسـەر (CD) لەگـەڵ (٣) دانـەی چاپکـراوی سـەر کاغـەز (A4) بـە فۆنتـی (١٥) ی یۆنیکورد بێت، بـە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانـی بـە لیسـتی پەراوێـز و سـەرچاوەکانەوە لـە (٢٥) لاپـەڕە زیاتر نەبێت و پەراوێزەکانیشی لە کۆتایی باسەکە دابندرێت.

١٠- ئەگـەر بابەتەکـە وەرگێـڕدراو بوو، دەبێت لە زمانی یەکەمەوە بێت و دەقە ئەسڵییەکەشی لەگەڵدا هاوپێچ کرا بێت.

١١- گۆڤـاری ئەکادیمیای کوردی ناسـاندن و هەڵسـەنگاندنی ئـەو کتێبانەی لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرە زانستییەکانی ئەم بوارەی کردبێت.

١٢- بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# وشە ئەركییەكان
# لە ئاستی سینتاكسدا[1]

**م.ی. ئەمیر محەمەد محەمەدئەمین**
زانكۆی ڕاپەڕین – فەكەڵتی پەروەردە– قەڵادزێ
بەشی زمانی كوردی

**پ. د. یوسف شەریف سەعید**
زانكۆی سەلاحەددین – كۆلێژی زمان
بەشی زمانی كوردی

## پێشەكی

ئەم لێكۆڵینەوەیە بەناونیشانی (**وشە ئەركییەكان لە ئاستی سینتاكسدا**)یە، **هۆی** هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بۆ لێكۆڵینەوە كردن لەسەری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، كە لە زۆربەی زمانەكاندا لێكۆڵینەوەی لەسەر كراوە و دەستنیشانی وشە ئەركییەكان كراوە، بەڵام تاكو ئێستا لێكۆڵینەوەیەكی سەربەخۆی لە زمانی كوردیدا لەسەر نەكراوە، هەر بۆیە وامان بە پێویست زانی، كە لێكۆڵینەوەیەك بەم ناونیشانە ئەنجام بدەین، بە مەبەستی خستنەڕووی ڕۆڵ و گرنگیی وشە ئەركییەكان لە ئاستی سینتاكسدا.

ڕێبازی لێكۆڵینەوەكە ڕێبازێكی وەسفی ئێستاییە لە چوارچێوەی ڕێزمانی بەرهەمهێن (Generative Grammar)ی چۆمسكی، چونكە بەم پێیە جگە لە شیكردنەوەی كەرەسە زمانییەكان لە سنووری فرەیز و ڕستەدا، ئەركی وەسفكردنیش دەگرێتە ئەستۆ، دێتاكان لە دیالێكتی ناوەڕاستی زمانی كوردی وەرگیراون.

ئامانجی ئەم لێكۆڵینەوەیە خستنەڕووی وشە ئەركییەكانە لە چوارچێوەی بواری سینتاكسدا، چ وەكو كەرەسەیەكی سەرەكی یاخود وەكو كەرەسەیەكی ناسەرەكی ڕۆڵ و ئەرك لە فرەیزو ڕستەدا دەبینن، دواتر لێكۆڵینەوەكە بە چەند ئەنجامێك گەیشتووەو لە كۆتاییشدا لیستی پەراوێزو سەرچاوەكان لەگەڵ كورتەی لێكۆڵینەوەكە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراونەتەڕوو.

### ١_١_ دەروازە:

زمانەوانان تاکو ئێستا چەندین پێناسەی جۆراوجۆریان بۆ وشە کردووە، یەکێك لەو پێناسانە ئاماژە بەوە دەکات، کە (وشە بچووکترین پێکهاتەی سەربەخۆی زمانە)[٢]. واتە هەر فۆرمێك لە زمان لە چوارچێوەیەکی سەربەخۆ بەکاربهێنرێت، وشە پێکدەهێنێت و دەبێتە کەرەسەیەکی سەربەخۆی زمان. لەگەڵ ئەوەشدا زمانەوانی رووسی (شێربا)[٣] باوەڕی وایە، کە پێناسەی وشە دەبێت، لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر بگۆڕێت، چونکە ئەو پێیوایە وشە وەکو ئەو دیاردە زمانییانە نییە لە هەموو زمانێکدا بە یەك شێوە ڕەفتار بکات.[٤] واتە بەپێی ئەم بۆچوونە وشە لە زمانێکدا بۆ زمانێکی تر جیاوازییان، لەگەڵ یەکتریدا هەیە، بەم شێوەیە وشەکانی هەر زمانێك تایبەتێتی خۆی هەیە، کە تایبەتە بە سیستەمی ئەو زمانەوە، هەر لەبەر ئەمەیە لە کاتی ناساندنیان، دەبێت لەسەر ئەم تایبەتییەوە بناسێندرێن. کەواتە لە ناو خودی زمانێکیشدا هەر یەك جۆر وشە نییە، بۆ ڕێکخستنی کەرەسەکانی ناو ڕستە، تاکو ئاخێوەر ئەو بیرەی، کە هەیەتی بە شێوەیەکی روون بیگەیەنێت. جا بۆیە لە هەر زمانێکدا وشە لە دوو جۆر پێکدێت، ئەوانیش وشەی فەرهەنگی و وشەی ئەرکین.[٥] وشەی ئەرکی بەرامبەر بە (Faction words) ی زمانی ئینگلیزی و (الكلمة الوظفية) ی زمانی عەرەبی دەوەستێت، کە بەرامبەر وشەی فەرهەنگییە، ئەم دوو جۆرە وشەش هەر یەکەیان تایبەتێتی خۆیان هەیە و جیاوازییان لە نێواندا هەیە.

### ١_٢_ وشەی ئەرکی[٦]:

وشەی ئەرکی (وشەیەکە واتای فەرهەنگی نییە، ئەرکەکەیان تەنها بۆ دەربڕینی پەیوەندییەکی ڕێزمانییە).[٧] واتە وشەکان لە خودی خۆیاندا واتایان نییە، بەڵکو ئەرکیان هەیە، ئەم ئەرکەش پەیوەندییەکان بە شێوەیەکی سیستەمی لە نێو کەرەسەکانی ڕستەدا ڕێکدەخات. هەر بۆیەشە وشە ئەرکییەکان (واتای فەرهەنگی ئاشکرایان نییە یان چەمکێکی یەکگرتووی روونیان پێکەوە نییە).[٨] واتە واتایەکی ڕوون و ئاشکرا بە تەنیا نادەن بەدەستەوە، لە دەرەوەی ڕستەدا ناتوانن واتایەکی ئەوتۆ بگەیەنن، کە تێگەیشتنی هەبێت. چونکە وشەی ئەرکی (لە

بنچینەدا ئەرکی ڕێزمانیان هەیە، یاخود پەیوەندییەکی لۆجیکییان بە ڕستەوە هەیە).[٩] وشە ئەرکییەکان ئەرکی ڕێزمانی جێبەجێ دەکەن و پەیوەندییەکی کەتواری لە بەیەکەوە بەستنەوەی کەرەسەکانی ڕستەدا دروست دەکەن. هەروەها (هەر یەك لە وشە ئەرکییەکان، واتا لەگەڵ کەرەسەی تر دەدەن بە دەستەوە، لێکدان و بەستنەوە لە نێوان بەشەکانی گوتن دروست دەکەن و لە فۆنیمێك یاخود زیاتر لە فۆنیمێك پێکدێن)[١٠]. هەر بۆیەشە وشە ئەرکییەکان لە ڕۆنانی جیاواز پێکدێن و لە دەرەوەی ڕستەدا هیچ واتایەکی ڕوون ناگەیەنن، بەڵام کاتێك لەگەڵ وشەی فەرهەنگی و فرەیز یەکدەگرن یاخود بە هۆی ئەوانەوە ڕستە دروست دەکەن، واتایەکی ڕوون و ئاشکرا بە ڕستەکە دەگەیەنن. یاخود وشەی ئەرکی بێژەیەکە واتا ناگەیەنێت، مەگەر لەگەڵ کەرەسەی تردا نەبێت بۆ بەستنەوەی بەشەکانی ڕستە بەکاردەهێنرێت و نیشانەکانی ناو و کار وەرناگرێت.[١١] کەواتە وشە ئەرکیەکان لە ناو ڕستەدا لەگەڵ کەرەسەکانی تری ناو ڕستەدا، لە پەیوەندی بەردەوامدان بۆ گەیاندنی واتا، لە هەمان کاتیشدا سەربەخۆیی خۆیان دەپارێزن، بە هیچ شێوەیەك نیشانەکانی ناوو کاریان ناچێتە سەر، چونکە بەردەوام لە دەرەوەی ڕستەدا لە فۆڕمێکی سەربەخۆی بێ واتادان.

### ١_٣_ جۆرەکانی وشەی ئەرکی:

بەشێك لە وشەکانی زمان، لە جۆری وشەی ئەرکیدایە، ئەم وشە ئەرکییانەش بە شێوەی وشەی سەربەخۆ خۆیان دەنوێنن و لە پۆلێك وشە پێکدێن. پۆلی وشە گرووپێکە لە وشە، کە سیما و تایبەتێتی سینتاکسی و مۆرفۆلۆژییان تێدایە، بە شێوەیەکی ئاسایی بە بەشێك لە بەشەکانی ئاخاوتن دادەنرێن.[١٢] هەر بۆیە ئەم وشانە بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە زماندا بە کاردێت، تایبەتمەندی ڕستەسازی و وشەسازی لە خۆ دەگرن، دەکرێت ئەم وشانە هەر وەك لە زمانەکانی تری مرۆڤ بەرچاو دەکەوێت، لە بازنەیەکی داخراو بەدی بکرێن، چونکە ئەم وشانە لە (پۆلی داخراو)[١٣]ن. ((بەشەکانی ئاخاوتن ، کە باسی هەرە سەرەکی مۆرفۆلۆژین، لە زمانانی جیاوازدا، جیاوازی لە ژمارەیاندا هەیە و خاوەنی تایبەتێتی سەربەخۆن)).[١٤] هەر زمانێك کاتێك بەشەکانی ئاخاوتنی خۆی دیاری

دەكات، ئەم دیاریكردنە بە پێی یاسا و ڕێساكان و تایبەتێتی ئەم زمانە دەبێت، واتە ڕەنگە هەندێك وشە، كە سەر بە بەشێكی ئاخاوتنن، بەڵام لە زمانێكی تردا وا نەبێت و سەر بە بەشێكی تری ئاخاوتن بێت ، ئەمەش پەیوەندی بە خاسیەت و تایبەتمەندیی ئەم زمانەوە هەیە. وشەكان دابەش دەبن، بۆ سەر كەتیگۆرییە سینتاكسییەكان: (ناو، كار، ئاوەڵناو، ئاوەڵكار، پێشناو، كاری یاریدەدەر، مۆدەل، دەرخەر، ئامرازی چەندێتی، ژمارە، جێناو، وشەی پلەدار، ئامراز[١٥]ی لێكدەر)، ئینجا كەتیگۆرییە سینتاكسییەكان بەسەر دوو پۆلی وشە دابەش دەبن: وشەی فەرهەنگی، وشەی ئەركی.[١٦] واتە بەشەكانی ئاخاوتن دوای ئەوەی لە زمانێكدا دەستنیشان دەكرێن، دابەشی سەر دوو پۆل دەبن، كە پێكهاتوون لە وشەی ئەركی و وشەی فەرهەنگی، كە لە ڕیزی وشەی سەربەخۆدا پۆل دەكرێن، بەپێی ئەم پۆلكردنە وشەی فەرهەنگی پێكدێت لە: (ناو، ئاوەڵناو، كار، ئاوەڵكار، ژمارە)، وشەی ئەركی پێكدێت لە: جێناو، كە ئەویش پێكهاتووە لە: (جێناوی كەسی سەربەخۆ، جێناوی خۆیی، جێناوی ئاماژەكردن، جێناوی دیار، جێناوی نادیار، جێناوی هەیی، جێناوی پرس، جێناوی نەرێ، جێناوی چەندێتی، جێناوی هاوبەش)، پێشناو، ئامرازی سەرسوڕمان، ئامرازی بانگكردن، ئامرازی لێكدەر.

**١_٤_ ژمارە و ڕیزكردنی وشە ئەركییەكانی زمانی كوردی بە پێی ئەلفبایی:**

وشە ئەركییەكانی زمانی كوردی– دیالێكتی ناوەڕاست، لەم لێكۆڵینەوەدا بە شێوەیەكی ستاندارد ژمارەیان دەگاتە (٤٩) وشەی ئەركی، بێجگە لە ئەلۆمۆرفەكانیان، لێرەدا بە پێی سیستەمی ئەلفبایی ڕیزیان دەكەین. (ئاخ، ئایا، ئەگەر، ئەمە، ئەمەندە، ئەو، ئنجا، ئۆخەی، ئێمە، ئێوە، بە، بەشكو، بەڵام، بریا، بۆ، بێ، پەك، تا، تۆ، چەند، چونكە، چۆن، چی، خۆ، دەی، دی، زۆر، فلان، كام، كە، كەم، كەی، كوێ، كێ، لە، من، نەك، هەر، هەم، هەموو، هەندێ، هۆ، هی، هیچ، و، وەك، وەی، یان، یەكدی).

وشە ئەركییەكان ڕۆڵیان لە ئاستی سینتاكسدا هەیەو ئەركی جیاجیا لە ڕستەدا دەبینن، بەشێكن لە كەتیگۆرییە سینتاكسییەكان، ئەم كەتیگۆرییانەش

پێکهاتوون لە: فرەیزی ناوی، فرەیزی جێناوی، فرەیزی پێشناوی، فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی، فرەیزی دەرخەری، فرەیزی تەواوکەری، فرەیزی لێکدەر، فرەیزی کاری) کە شوێنی (بکەر، بەرکار، تەواوکەر، سەربار، کار) لە ڕستەدا پڕ دەکەنەوە و ئەرکە سینتاکسییەکانیان لە ڕستەدا دەبینن.

**١_٥_ پێکهاتەی سینتاکسی ڕستە:**

ڕستە پێکهاتەیەکی سینتاکسی هەیە، هەر بۆیە تاکو ئێستا گەلێ پێناسەی جۆراوجۆری بۆ کراوە، بەڵام ئەوەی زیاتر جەختی لە سەر دەکرێتەوە، ئەم پێناسەیەیە، کە دەڵێت: ((هەر فۆرمێکی زمانی سەربەخۆ بێت، نەبێتە بەشێك لە کەرەسەی گەورەتر و پەیوەندی ڕێزمانی لەگەڵ کەرەسەی تردا نەبێ، ئەوا ڕستە پێك دێنی)).[١٧] وشەی ئەرکی وەکو یەکەیەکی زمان بەشدارییەکی ڕاستەوخۆی لە داڕشتنی ڕۆنانی ڕستەدا دەکات، جا ئەم بەشداریکردنە ڕەنگە بە شێوەیەکی سەرەکی، یان ناسەرەکی بێت. پێکهاتەی سینتاکسی ڕستە بە گوێرەی گونجاندنیان لەگەڵ یەکتریدا ئەم کەرەسانە لە خۆ دەگرێت، کە بە شێوەیەکی ڕیزبەند لە ڕستەدا بە دوای یەکترییەوە دێن و ئەرکی ڕێزمانی و واتایەکی دروست دەبەخشن. بۆ نموونە:

_ من ئێوەم لە کتێبخانە بینی.

ئەم درانەپاڵیەکەی کەرەسەکان بە شێوەیەکی ڕیزبەندی، کە لەم ڕستەیەدا هاتووە، واتە لێکدانی وشە لەگەڵ فرەیز بۆ پێکهێنانی ڕستەیەکی دروست، ئەمە وا دەکات ئەو بنەما و یاسایانەش، کە ئەم ڕستەیەی پێ لێکدراوە دیاری بکرێت. هەر بۆیە ڕێزمانی بەرهەمهێنی چۆمسکی ڕستەی لە ڕیزی پێشەوەی پێکهاتە سینتاکسییەکان داناوە، بەم شێوەیەش پێناسەی کردووە، ڕستە پێکدێت لە فرەیزی ناوی و فرەیزی کاری. بۆ نموونە:




لە لێكۆڵینەوەكانیشدا لە كەرەسەی گەورەوە بۆ بچووك دەست پـێ دەكـەن، كە بەم شێوەیە ڕستە پاشان فرەیز، وشـە .... هتـد. ڕیزبـوونی كەرەسـەكان لـە زمانێكـەوە بـۆ زمـانێكی تـر جیاوازییـان هەیـە، بـۆ نموونـە لـە زمـانی ئینگلیـزی ڕیزبـوونی كەرەسـەكانی بـە شـێوەی بكـەر _ كـار _ بـەركار (SVO ) ە، كەچـی زمانی كوردی ڕیزبوونی كەرەسەكانی بە شێوەی بكەر _ بـەركار _ كـار ( SOV) ە، گەلێك شێوەی ڕیزبوونی تریش وەكو بـەركار _ بكـەر _ كـار و كـار _ بكـەر _ بەركار هەیە.[18] ڕەنگە هەندێ جار ڕیزكردنی ڕۆنانی ڕستە گۆڕانی بە سـەردا بێـت و شێوەی ڕیزكردنەكەی بگۆڕێت، بە تایبەتی كاتێك ڕسـتەیەك كـورت دەكەینـەوە.
بۆ نموونە: _ گرتمت (كار + بەركار + بكەر)

یاخود جۆری كارەكە كاریگەری هەیە، لە سەر ڕیزبوونی كەرەسەكانی نـاو ڕستە، هەر بۆیە كار ژمارە جێكەوتـەكان و شـێوەی ڕیزكردنـی جێكەوتـەكانی لـە ڕسـتەدا دیـاری دەكـات، بـۆ نموونـە ئەگـەر كارەكـە تێپـەڕ بێـت، ژمـارەی جێكەوتەكانی جیاوازە لەگەڵ ئەوەی، كـە كارەكـە تێنەپـەڕ بێت. بـە شـێوەیەكی گشـتی دوو ڕیزكردنـی وشـە لـە ڕسـتەدا بـەدی دەكرێـت، ئـەویش: (چەسـپاو، ئازاد)ە.[19] بەم شێوەیە دەگەینـە ئـەوەی، كـە ڕسـتە لـە زمـانی كوردیـدا دابـەش دەبێت، بۆ سەر دوو پێكهاتە، ئەوانیش: (پێكهاتەی چەسپاو، پێكهاتەی ئازاد)ن.

### ١_٥_ ١_ پێكهاتەی چەسپاو:

قاڵبەكانی پێكهاتەی ڕستەی چەسپاو بە پێی كەرەسە سەرەكییەكانی ڕستە دیاری دەكرێن. لە زمانی كوردیدا دەكرێت، شەش قاڵبی بنجی ڕستە دەستنیشـان بكـەین.[20] كەرەسـە سـەرەكییەكانی وەكـو: بكـەر، (بـەركار، تەواوكـەر، كـار)،

کەرەسەی بە خورتیین و ئەرکی سینتاکسیی لە ڕستەدا دەبینن، بەم شێوەیە قاڵبەکانی ڕستە و نموونەکان بە هێڵکاریی درەختی دەخەینەڕوو:

١_ بکەر + کار ⟵ ئەو هات.

٢_ بکەر + بەرکار + کار ⟵ کابرا ئەوی ناویّ.

٣_ بکەر + تەواوکەر + کار ⟵ بۆیەکە بە دەستیەوە نووسا.

٤_ بکەر + کار + تەواوکەر ⟵ ئەو بوو بە مامۆستا.

٥_ بکەر + بەرکار + کار + تەواوکەر ⟵ ئێمە ئەوانمان خستە ئاوەکەوە.

٦_ بکەر + بەرکار + تەواوکەر + کار ⟵ من ئەوان بە زیرەك دەزانم.

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم شەش ڕستەیە دەبینین، پێکهاتەیەکی چەسپاویان هەیە و کەرەسە سەرەکییەکانی پێکهاتوون لە: (بکەر، بەرکار، تەواوکەر، کار)، بەم شێوەیە کەرەسە سەرەکییەکان ڕیزبوونێکی چەسپاو لە خۆدەگرن. مەبەست لە ((ڕیزبوونی چەسپاو ئەوەیە، کە هەر گۆڕانێك لە ڕیزبوونی کەرەسەکان، لە سنووری گرێکاندا، ڕووبدات، دەبێتە هۆی گۆڕانی ئەرکی سینتاکسیی ڕستەکە و هەروەها لێکدانەوەی واتایی کەرەسەکان دەگۆڕێت)).[21] واتە لە پێکهاتەی ڕستەی چەسپاودا کەرەسەکان نابێت لە شوێنی خۆیاندا جێگۆڕکێیان پێ بکرێت، چونکە بەهۆی جێگۆڕکێی کەرەسەکان ئەرکی سینتاکسی و واتای ڕستەکە دەگۆڕێت. بۆ نموونە:




**١_٥_ ٢_ پێکهاتەی ئازاد:**

ڕیزبوونی وشەکان لە پێکهاتەی ئازاددا، پێکهاتووە لە: ((ڕیزبوونی وشەکان لە ناو ڕستەدا بە چەند شێوەیەکی جیاواز، بێ ئەوەی کار لە واتای ڕستەکە بکات)).[22] واتە کەرەسەکان لە ناو ڕستەدا، ئازادانە جێگۆڕکێیان پێ دەکرێت، بەبێ ئەوەی ئەرکی سینتاکسی یان واتایان بگۆڕێت. ئەو کەرەسانەش پێکهاتەی

ئـەو فرەیـزە پێشـناوی و ئـاوەڵگوزارەیی و ڕادانـە دەگرێتـەوە، کـە جێکەوتـەی سەرباریان لە ڕستەدا پڕکردۆتەوە.[٢٣] کەواتە سەربارەکان لە ڕستەدا دەتوانرێت، جێگۆڕکێیان پێ بکرێت. بەم شێوەیە:

١_ فرەیزی پێشناوی لە پێکهاتەی ئازاددا. بۆ نموونە:

_ نامەکەم بە ئەو نارد.          _ بە ئەو نامەکەم نارد.

٢_ فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی (کاتی، شوێنی، چۆنیەتی). بۆ نموونە:

_ من بە شەو دەخوێنم.          _ بەشەو من دەخوێنم.

_ ئەو لە ژێر دارەکە نووستووە.          _ لە ژێر دارەکە ئەو نووستووە.

_ ئەوان بە پەلە ڕۆیشتن.          _ بە پەلە ئەوان ڕۆیشتن.

٣_ فرەیزی ڕادە. بۆ نموونە:

_ منداڵەکە کەمێك شیری خوارد.          _ منداڵەکە شیری کەمێك خوارد.

_ کەمێك شیر منداڵەکە خواردی.

هەر بۆیە دەبینین، لە پێکهاتەی ئـازاددا سـەربارەکان شـوێنێکی تایبـەتییان نییە و تـا ڕادەیـەکیش ئازادانـە جێگـۆڕکێ دەکـەن، ئەرکیشـیان پێـدانی زانیـاریی زیاتره لە ڕستەدا.

**١_٦_ پەیوەندیی ستوونی و پەیوەندیی ئاسۆیی[٢٤] لە وشەی ئەرکییدا:**

پەیوەنـــدیی ســـتوونی (Paradigmatic) و پەیوەنـــدیی ئاســـۆیی (Syntagmatic) یەکێکـە لـە داهێنانـە زمانەوانییـەکانی، زمانـەوانی سویسـری فردینانـد دی سۆسـێر (١٨٥٧_ ١٩١٣)، کـە دەتوانێـت پەیوەنـدی لـە نێـوان کەرەسـەکانی زمـان لـە سـەرجەم ئاسـتەکاندا پێکبهێنێـت. ئەمـەش وا دەکـات، پەیوەندی ستوونی و ئاسۆیی لە ئاسـتی ڕستەسـازیدا بـۆ دەستنیشـانکردنی وشـە ئەرکییەکان وەك پێوانەیەك سوودی لێ وەربگیرێت.

**١_٦_١_ پەیوەندیی ستوونی:**

وشـــە ئەرکییـــەکان بەشـــێکن لـــە کەرەســـەکانی زمـــان، بـــە پێـــی ئـــەو تایبەتمەندییەی، کە هەیانە دەتوانن لە شوێنی یەکتردا لە پەیوەندیی ستوونیدابن.

پەیوەندیی ستوونی لە بونیادگەریی سۆسێردا، ئەو جۆرە پەیوەندییە لەجیاتییە دەگەیەنێت، کە کەرەسەکانی زمان لەگەڵ کەرەسەیەکی تری زمان لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا هەیەتی.[٢٥] واتە لە پەیوەندیی ستوونیدا جەخت لەسەر لەجیاتی دانان دەکرێتەوە، بە شێوەیەك، کە ئەو وشانەی لە دەرەوەی ڕستەکەدان، دەتوانن شوێنی هاوپۆلەکەیان لە ڕستەکەدا بگرنەوە و ڕستەیەکی تر پێکبهێنن. وشە ئەرکییەکان دەتوانن لە پەیوەندیی ستوونیدا ئەو ڕۆڵە بنوێنن، کە لە ڕوانگەی سۆسێرەوە ئەم جۆرە پەیوەندییە بە پەیڕەو (System) ناودەبرێت.
بۆ نموونە:

_ من ئەمە لە قوتابخانە دەناسم.

کەرەسەکانی ئەم ڕستەیە پێکهاتوون لە وشەی ئەرکی (من) وەکو بکەر، وشەی ئەرکی (ئەمە) وەکو بەرکار، فرەیزی پێشناوی (لە قوتابخانە) وەکو سەربار، (دەناسم) وەکو کار، بەم شێوەیە دەکرێت، ژمارەیەکی تری ڕستە لەسەر بنەمای (بکەر، بەرکار، سەربار، کار) دروست بکرێت، کە هەر کەرەسەیەکی ناو ڕستەکە لە پۆڵی خۆی کەرەسەیەکی تری لەجیاتی دابنرێت، واتە بکەر لە جیاتی بکەرو بەرکار لەجیاتی بەرکار و سەربار لەجیاتی سەربار و کار لەجیاتی کار، بەم شێوەیە کەرەسەکانی زمان پەیوەندیی ستوونی دەنوێنن، پێشناوەکانیش وەکو وشەیەکی ئەرکی بە شێوەیەکی ستوونی لە ڕستەدا لە جێگەی یەکتریەوە دێن و شوێنی یەکتر دەگرنەوە. بۆ نموونە:




دەبینین وشە ئەرکییە پێشناوەکانی وەکو (لە، بە، بۆ، بێ، وەك) لەم ڕستانەدا جێکەوتەی یەکترن، ئەمەش وەك پێوانەیەکە، کە هاوپۆلەکان بە شێوەیەکی ستوونی تا ڕادەیەك لە توانایاندا هەیە، شوێنی یەکتر بگرنەوە. بەم شێوەیە پەیوەندیی ستوونی لە سەر بنەمای لەجیاتی دانان بنیاتنراوە، دەکرێت

هەر وشە و فرەیزێك شوێنی هاوپۆلەکانیان لە ڕستەدا بگرنەوە، ئەرکی سینتاکسی و واتایی خۆیان بنوێنن و ڕستەی تر بەرهەمبهێنن.

**١_٦_٢_ پەیوەندیی ئاسۆیی:**

وشە ئەرکییەکان لە پەیوەندیی ئاسۆییدا بە شێوەیەکی زنجیرەیی بە دوای یەکتریەوە دێن، لەگەڵ کەرەسەکانی تردا ڕیز دەبن و ڕستە پێکدەهێنن. کەواتە ((پەیوەندیی ئاسۆیی بریتییە لە پەیوەندییە ئامادەبووەکان، کە پشت بە دوو کەرەسە یان زێتر دەبەستێ، کە لە زنجیرەیەکی ڕاستەقینەدا هاتوون)).[٢٦] ئەم دوو کەرەسەیە یان زیاترەی لە ڕستەدا بە شێوەی هێڵێکی ئاسۆیی بەیەکەوە دێن، پێیان دەگوترێت پێکهاتە (Structure ). بۆ نموونە:

_ من بەیانی تۆ لە زانکۆ دەبینمەوە. ←――――― پەیوەندیی ئاسۆیی

لەم ڕستەیەدا وشە ئەرکییەکانی (من، تۆ، لە) لەگەڵ کەرەسەکانی تر لە پەیوەندییەکی ئاسۆییدان، ڕیزبوونێکی تایبەتییان هەیە، لە سەر بنەمای (بکەر + ئاوەڵکار + بەرکار + سەربار + کار) بە دوای یەکترییەوە هاتوون و بەیەکەوە لە پەیوەندیدان و پێکهاتەیەکیان لە نێو خۆیاندا دروست کردووە، کە بۆتە هۆی بەرهەمهێنانی ئەم ڕستەیە. هەروەها وشە ئەرکییە لێکدەرەکان لە پەیوەندییەکی ئاسۆییدا ڕستە سادەکان بەیەکتر دەگەیێنن و ڕستەی لێکدراو پێکدەهێنن. لە ناو ڕستە سادەکانیشدا وشەی ئەرکی لەگەڵ کەرەسەی تردا بەشداری لە پێکهێنانی ڕستەکەدا دەکەن. بۆ نموونە:

_ من لە خەو هەڵسام و چووم بۆ قوتابخانە ئینجا نیوەڕۆ گەڕامەوەماڵەوە.

سەرجەم کەرەسەکانی ئەم ڕستە لێکدراوە، بە شێوەیەکی ئاسۆیی بەدوای یەکترییەوە هاتوون، کە ئەرکی سینتاکسی و واتایی خۆیان لە ڕستەکەدا جێبەجێ کردووە. هەربۆیە ئەم ڕستە لێکدراوە ((لە ڕیزبوونێکی لۆژیکی و ڕێزمانیدان، هەر گۆڕانکارییەك لە جێگۆڕکێکردنی وشەکاندا تەواوی واتای لۆژیکی و ڕێزمانی ڕستەکە دەگۆڕێ)).[٢٧] واتە ئەم ڕیزبوونە ئاسۆیییەی ئەم ڕستە لێکدراوەی پێ بەرهەمهاتووە، ناکرێت پاش و پێش و جێگۆڕکێیان پێ بکرێت، چونکە دەبێتە هۆی ناتەواویی ڕستەکە لە ڕووی ڕێزمانی و واتاوە. بۆنموونە:

_ مـن لـە خـەو هەڵسـام و نیـوەڕۆ گەڕامـەوە ماڵـەوە ئینجـا چـووم بـۆ قوتابخانە.*

_ مـن نیـوەڕۆ گەڕامـەوە ماڵـەوە و چـووم بـۆ قوتابخانـە ئینجـا لـە خـەو هەڵسام.*

_ مـن چـووم بـۆ قوتابخانـە و لـە خـەو هەڵسـام ئینجـا نیـوەڕۆ گەڕامـەوە ماڵەوە.*

بەم شێوەیە وشە ئەرکییەکان لەگەڵ کەرەسەکانی تری زمان لە پاڵ ئەوەی، کە دەتوانن لە شوێنی هاوپۆڵەکانیان لە ڕستەدا پەیوەنـدیی سـتوونی بنـوێنن، لـە هەمان کاتیشدا بـە شـێوەیەکی زنجیرەیـی لەگـەڵ کەرەسـەکانی تـری ڕسـتەدا لـە پەیوەندیی ئاسۆییدان.

**١_٧_ ئەرکی فرەیزی ناوی لە ڕستەدا:**

فرەیزی ناوی[٢٨] ئەرکی جیاواز لە ڕستەدا دەبینێت، جا ئەم فرەیزە ناوییـە، ناو یاخود جێنـاو بێـت. جێناوەکـان، ئامـاژە بـە پۆڵـە داخراوەکـانی کەرەسـەکان دەدەن، وەك جێگرەوەیەك لە بری ناوو فرەیزی نـاوی بـەکار دەهێنـرێن و هـەمان جێکەوتەی گۆکراوە ناوییەکانیان لە ڕستەدا هەیە.[٢٩] هەر بۆیە جێناوەکان وەکـو وشەی ئەرکی دەتوانن لە بەشی ناو ئەرکی (دیاریکار، بکەر، دەرخەر) ببیـنن و لـە بەشی کاردا ئەرکی (بەرکار، تەواوکەر) ببیـنن. دواتـر ئـەم ئەرکانـەش لـە ڕسـتەدا دەنوێنرێن. لە ڕێزمانی بەرهەمهێندا، هـەموو ڕسـتەیەك بـە فرەیـزی گـەردانی (Ip) شـیدەکرێتەوە، ئـەم فرەیـزە پێکـدێت لـە کەرەسـەیەکی گـەردانی، کـە سـەرەی ڕسـتەکەیە و ڕسـتەکەش جێکەوتـەی مـەزنی فرەیـزە گەردانییەکەیـە Ip، بـەڵام فرەیــزی کــاری تەواوکــەری گەردانەکەیــە، بکەرەکــەش دیاریکارەکەیــەتی Specifier.[٣٠] وەك لەم هێڵکارییە درەختییە ڕوونکراوەتەوە.



هەر بۆیە فرەیزی ناوی ئەرکی لە بەشی ناو و بەشی کاری ڕستەدا هەیەو بە شێوەیەکی جیاواز لە یەکترییەوە ئەرك دەبینن، کەواتە ڕستەی سادە یەکسانە بە فرەیزی گەردانیIp، واتە دوای ئەوەی هەر کەرەسەیەك ئەرکەکەی لە ڕستەدا ڕوون دەکرێتەوە، پاشان بە هۆی فرەیزی گەردانی لە هێلکاری درەختیدا دەنوێنرێت.

**١_٧_١_ بەشی ناو:**

**١_٧_١_ ١_ فرەیزی ناوی بکەری:**

فرەیزی ناوی بکەری وەکو کەرەسەیەکی سەرەکی لە جێگەی بکەردا دێت و ئەرکی بکەر لە ڕستەدا دەبینێت. هەر بۆیە ((هەموو ڕستەیەك لە کوردیدا دەبێت گرێیەکی ناوی تێدا بێت وەکو بکەر و لەگەڵ گرێیەکی کاری وەکو گوزارە)).[٣١] واتە بکەر بە یەکێك لە بنچینە سەرەکییەکانی ڕستە لە زمانی کوردی دادەنرێت، فرەیزی ناویش ئەرکی بکەر لە ڕستەدا دەبینێت، کە دەکرێت ئەم فرەیزە ناوییە وشەیەکی ئەرکی وەکو جێناو بێت، کە جێکەوتەی بکەر پڕ بکاتەوە. بەم شێوەیە، گەر کاری ڕستەکە ( تێپەڕ، تێنەپەڕ) بێت، جێناو وەکو فرەیزی ناوی ئەرکی بکەر دەبینێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە بەر ئەوەی زمانی کوردی زمانێکی بکەرخراوە، دەکرێت بکەر لە ڕستەدا لابرێت و شوێنی بکەر بە پرۆ (pro)[٣٢] پڕ بکرێتەوە، بکەرەکە خۆی لە شێوەی مۆرفیمی ڕێزمانی بە کۆتایی ڕەگی کارەکەوە دەلکێت.

**١_٧_١_ ٢_ئەرکی دیاریکار :**

دیاریکار (Spec) وەکو بەشێکی ناسەرەکی بۆ زیاتر دەرخستن و ڕوونکردنەوەی فرەیزی ناوی بکەرییە و بەشداری لە ڕۆنانی ڕستەدا دەکات و دەکەوێتە پێش فرەیزەکە، بە بێ مۆرفیمی خستنەسەری (ی، ە)و ئەرکی سەربار (Adjunct) دەبینێت، هەر بۆیە بە لادانیان لە ڕستەدا کار لە واتای ڕستەکە ناکەن و ڕستەی ناڕێزمانی لێ ناکەوێتەوە. هەندێ لە وشە ئەرکییەکان بەمەبەستی خستنەڕووی زانیاریی زیاتر لە بارەی فرەیزی ناوی بکەری ئەرکی سپێك دەبینن،

ئەم وشە ئەرکییانەش پێکهاتوون لە: (وشەی سەرسوورمان، وشەی بانگکردن، جێناوی پرسی: (کام، چ...ێك، چەند)، جێناوی ئاماژەکردن، جێناوی دیار (هەر)، جێناوی نەرێ، جێناوی چەندێتی). بۆ نموونە:

_ ئافەرین تۆ بە یەکەم دەرچوویت!

_ هۆهۆ کابرا، وەرە لای ئێمە.

_ هەر هەموو گوڵەکان جوانن.

_ هیچ مامۆستایەك ئامادە نییە.

_ کام گۆڤار بۆ کتێبخانەیە؟

_ چ کتێبێك لە سەر مێزەکەیە؟

_ چەند گوڵ بۆ دیارییە؟

ئەم خانووە گەورەیە.




ڕەنگە دوو سێ سپێك بتوانن بەیەکەوە بێن، بەڵام ئەم سپێکانە: ((بە پێی ڕێزمانی کوردی لە ژێر سایەی گەلێ کۆتبەند و گونجاندن کاردەکەن)).[٣٣] واتە دەبێت سپێکەکان بە پێی سیستەمی ڕێزمانی لەگەڵ یەکتر ڕێك بکەون، گەرنا ڕێگە پێنەدراون. بۆ نموونە:

_ چ ئەم خانووە گەورەیە.*

**١_٧_١_ ٣_ ئەرکی دەرخەر:**

دەرخەر Modifier بە پێی ئەرکی سینتاکسی وەکو بەشێکی ناسەرەکی بەشداری لە ڕۆنانی ڕستەدا دەکات و دەکەوێتە دوای فرەیزی ناوی بکەری، بە یارمەتی مۆرفێمی خستنەسەری (ی، ە) پەیوەندیی سینتاکسی نێوانیان بەیەکتری

دەبەستریتەوە.((لە ناو دروستەی فریزی ناویدا ناویک سەریکە و ئەوانەی لە دەوروبەریدا دەردەکەون، دەرخەرن بۆ ئەو ناوە، دەرخەریش بەپیی ریسای سەرکۆتایی دەکەویتە دواوە و ناوەکە لە سەرەتادایە)).(٣٤) هەر بۆیە دەرخەر ئەرکی سەربار لە رستەدا دەبینیت، بە لادانیان لە رستەدا کار لە واتای رستەکە ناکەن و رستەی نارێزمانی لێ ناکەویتەوە. هەندێ لە وشە ئەرکییەکان بەمەبەستی خستنەرووی زانیاریی زیاتر لە بارەی فرەیزی ناوی بکەری ئەرکی دەرخەر دەبینن، ئەم وشە ئەرکییانەش پێکهاتوون لە: ((جێناوی کەسی، نیشانە، پرسیاری، چەندێتی، خۆیی، نادیار، دیار، نەرێ)).(٣٥) بۆ نموونە:

_ برای ئەمە خانوو دەکرێت. _ بارانێکی زۆر باری.

_ کوڕی کێ دێت؟ _ کوڕەکەی تۆ زیرەکە.




لەم رستانەدا هەریەکە لە وشە ئەرکییەکانی (ئەمە، کێ، زۆر، تۆ، ئێمە) بوونەتە دەرخەری فرەیزە ناوییەکانی پێش خۆیان و بە یارمەتی مۆرفێمی خستنە سەری (ی) بە یەکترییەوە گرێدراون.

**١_٧_٢_ بەشی کار:**

**١_٧_٢_ ١_ فرەیزی ناوی بەرکاری:**

فرەیزی ناوی بەرکاری بەشێکە لە بەشی کار، وەکو کەرەسەیەکی سەرەکی لە جێگەی بەرکار واتە لە پێش کار دێت و ئەرکی بەرکار (Object ) لە ڕستەدا دەبینێت. هەر بۆیە ((بەرکاری ڕاستەوخۆ خۆی لە دووەم گرێی ناوی ڕستەدا دەنوێنێ لە ژێر گرێی کاری ڕستەدایە)).(٣٦) واتە بەرکار بە یەکێك لە بنچینە سەرەکییەکانی ڕستە لە زمانی کوردی دادەنرێت، پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ کاردا هەیە، بە تایبەتی بۆ ئەو ڕستانەی، کە کارەکانیان تێپەڕە. کاری تێپەڕیش: ((ئەو کارەیە، کە جگە لە بکەر پێویستی بە بەرکار هەیە بۆ ئەوەی واتایەکی تەواو بگەیەنێت)).(٣٧) واتە لە ڕۆنانی سەرەوەدا، ئەگەر کاری ڕستەکە کارێکی تێپەڕ بوو، پێویستی بە فرەیزی ناوی بەرکاری دەبێت، بۆ ئەوەی ڕستەیەکی تەواو دروست بێت. دەبێت ئەم فرەیزە لە ڕستەکەدا هەبێت، چونکە کەرەسەیەکی بە خورتییە. بە شێوەیەکی گشتی فرەیزی ناوی ئەرکی بەرکار لە ڕستەدا دەبینێت، کە دەکرێت ئەم فرەیزە ناوییە وشەیەکی ئەرکی وەکو جێناوی (کەسی سەربەخۆ، ئاماژەکردن، خۆیی، هاوبەش، چەندێتی، دیار، نادیار، پرس، نەرێ) بێت، کە چاڵی بەرکار لە ڕستەدا پڕ بکاتەوە. بۆ نموونە:

_ دارا چی نووسی؟ _ ئارام هەمووی خوارد.

_ منداڵەکە زۆر دەخوات. _ ئێمە ئەوە دەناسین. _ من ئەوەندە دەکرم.

نازەنین تۆ دەبینێت.



هەر یەك لە وشە ئەرکییەکانی (تۆ، چی، زۆر، هەموو، ئەوە، ئەوەندە) ئەرکی فرەیزی ناوی بەرکاریان بینیوە، لە شوێنی بەرکار لە ڕستەدا بەدیار کەوتوون و لە ژێر کاریگەریی کارە تێپەڕەکانیاندان. هەروەها جێناوی خۆیی و جێناوی هاوبەشی جۆرێکن لە فرەیزی ناوی ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەدا دەبینن، بەڵام بەرکار هاوئاماژە (ئەنافۆر)[٣٨] دەبێت لەگەڵ بکەردا واتە بۆ بکەر دەگەڕێتەوە و وەکو پێویستییەکیش جێناوی خۆیی و جێناوی هاوبەش وەکو بەرکار ئەرك دەبینن و لە شوێنی بەرکار لە ڕستەدا جێگیر دەکرێن. بۆ نموونە:

ئێمە یەکدی دەناسین.




ئەو خۆی سووتاند.



هــەروەها جێنــاوی نــەرێ جۆرێكــە لــە فرەیــزی نــاوی ئــەركی بــەركاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەدا دەبینن، بەڵام كارەكە سـەرەڕای تێپـەڕێ، دەبێت لـە بـاری نەرێدابێت. بۆ نموونە:




**١_٧_٢_ ٢_ فرەیزی ناوی تەواوكەر:**

وشەی ئەركی وەكو فرەیزی ناوی تەواوكەر دەبێتە بەشێك لـە بەشـی كـاردا ئەركی سـەرەكی لـە ڕسـتەی كـاری (بـوون)[٣٩] دا دەبینێـت و ((ئـەو كەرەسـانەی دەكەونە پێش كاری (بوون) و دەبنە تـەواوكار لـە داڕشـتنی گرێـی كـاری ڕسـتەی (بوون) دا)).[٤٠] واتـە فرەیـزی نـاوی ئـەركی تەواوكـەر( Coplement) لـە ڕسـتەی كاری (بوون)دا دەبینێت و پەیوەندی لـە نێـوان بەشـی نـاو و بەشـی كـار دروسـت دەكـات، بـە هاتنیـان لـە ڕسـتەدا ئـەركێكی سینتاكسـی جێبـەجێ دەكـەن، كـە ڕستەیەكی ڕێزمانی و واتایەكی دروست بەرهەم دەهێنن، هەر بۆیە هاتنی تەواوكەر لە ڕستەی كاری (بوون) كەرەسەیەكی بەخورتییە و هەر دەبێت هـەبێت. دەكرێـت فرەیــزی نــاوی تەواوكــەر، وشــەیەكی ئــەركی وەكــو جێناوەكــانی (خــۆیی، ئاماژەكردن، نەرێ، نادیار، كەسی، پرس، چـەندێتی) بێـت، ئـەركی تەواوكـەر لـە ڕستەی كاری (بوون) ببینێت. بۆ نموونە:

_ ئەوە خۆم بووم، دزەکەم گرت .　　　_ گۆڤارەکە ئەمە بوو.
_ ئەو هیچ نەبوو.　　　_ ئاوی کانییەکە کەم بوو.
_ ئەوە کتێبی منە.　　　_ئەم ئافرەتە کێیە؟




بەم شێوەیە ئەم وشە ئەرکییانە (خۆم، ئەمە، هیچ، کەم، ئەو، کێ، ئەوەندە)، کە ئەرکی فرەیزی ناوی تەواوکەریان لە ڕستەی کاری (بوون) بینیوە، بە هیچ شێوەیەك نابێت لە ڕستەدا لابرێن، چونکە دەبێتە هۆی ناڕێزمانی ڕستەکە و تێکچوونی پەیوەندیی سینتاکسی نێوان بەشی ناو و بەشی کار و نادروستیی لایەنی واتایی ڕستەکە، یاخود واتای ڕستەکە بە ئاڕاستەیەکی تر دەگۆڕێت.

**١_٨_ ئەرکی فرەیزی پێشناوی و فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی لە ڕستەدا:**

**١_٨_١_ ئەرکی فرەیزی پێشناوی:**

فرەیزی پێشناوی لە ڕووی سینتاکسییەوە پەیوەندی لەگەڵ کاردا هەیە. هەر بۆیە فرەیزی پێشناوی کۆمەڵێك ئەرکی سینتاکسی جیاواز دەبینێت وەك سەربار و تەواوکەری فرەیزی کاری.[٤١] بەم شێوەیە ئەرکی فرەیزی پێشناوی تەواوکەر و فرەیزی پێشناوی سەربار لە ڕستەدا دەخەینەڕوو.

### ١_٨_١_١_ فرەیزی پێشناوی تەواوکەر:

فرەیزی پێشناوی ئەرکی تەواوکەر لە ڕستەدا دەبینێت، سەر بە بەشی کارە، لە پێش یان لە دوای کاردا دێت. هەر بۆیە ئەو کەرەسانەی، کە لە ڕووی داڕشتنەوە لە ڕۆنانی فرەیزی پێشناوی دەکەن، واتە لە پێشناو و تەواوکەر پێکدێن، دەبن بە تەواوکەر.[٤٢] بەم شێوەیە فرەیزی پێشناوی تەواوکەر کەرەسەیەکی بەخورتییە و هاتنی لە ڕستەدا بەپێی جۆری کارەکە دەبێت. پێشناو و وشەکەی دوای بەیەکەوە دەبن بە تەواوکەر بۆ وشەکانی پێشیان.[٤٣] هەر بۆیە ئەرکی سەرەکی لە ڕستەدا دەبینێت، بەڵام ناتوانێت لە شوێنی بکەر و کاردا بێت، بە هاتنیان لە ڕستەدا پەیوەندییەکی سینتاکسی لە نێوان بەشی بکەر و بەشی کار دروست دەکەن. بۆ نموونە:

_ ئێمە ئەو بە شاعیر دادەنێین. _ نامەکە بۆ من بوو.

ئەو دەبێت بە مامۆستا.




لەم ڕستانەدا فرەیزە پێشناوییەکانی (بە شاعیر، بۆ من، بە مامۆستا) هەر یەکەیان ئەرکی تەواوکەریان لە ڕستەکانیاندا بینیوە.

### ١_٨_١_٢_فرەیزی پێشناوی سەربار:

فرەیزی پێشناوی ئەرکێکی تری سینتاکسی وەك سەربار لە ڕستەدا دەبینێت. مەبەست لە سەرباریش ئەو کەرەسانەن، کە لادانیان هیچ کارێك ناکاتە سەر لایەنی واتا و ڕێزمانی ڕستە، بەڵکو ئەرکیان تەنیا پیشاندانی زانیاریی زیاترە دەربارەی لایەنەکانی ڕووداو.(٤٤) کەواتە فرەیزی پێشناوی سەربار لادانی لە ڕستەدا کار ناکاتە سەر لایەنی واتا و ڕێزمانی ڕستە، بەڵکو هاتنی لە ڕستەدا پەیوەندی نێوان بکەر و کار و شێوەی ئەنجامدانی کارەکە لە لایەن بکەرەوە زیاتر ڕوون دەکاتەوە. بۆ نموونە:

_ ئێمە بێ ئێوە گەشت ناکەین.
_ ئەو هەواڵەکەی بە ئێمە گەیاند.
_ هۆنراوەکە وەك خۆی بخوێنەوە.
_ کراسێکم بۆ تۆ هێناوە.




لەم ڕستانەدا فرەیزە پێشناوییەکانی (بێ ئێوە، بە ئێمە، وەك خۆی، بۆ تۆ، لە تۆ) ئەرکی سەرباریان لە ڕستەکانیاندا بینیوە، هەر بۆیە گەر لە ڕستەدا لابدرێن یان جیگۆڕکێیان پێ بکرێت، کاریگەرییان لە سەر لایەنی واتا و ڕێزمانی ڕستە نابێت، چونکە لە ئەرکی فرەیزی پێشناوی سەرباری دان. هەروەها لە

ڕستەیەكدا دەتوانرێت، دوو فرەیزی پێشناوی سەربار، یان فرەیزێكی پێشناوی سەربار لەگەڵ فرەیزێكی پێشناوی تەواوكەر یان زیاتر بەیەكەوە بێن. بۆ نموونە:

_ دارا نامەكەی لە ئازادەوە بۆ تۆ هێناوە. _ ئەو لە هیچەوە بوو بە شت.

فرەیزی پێشناوی سەربار — فرەیزی پێشناوی سەربار — فرەیزی پێشناوی سەربار — فرەیزی پێشناوی تەواوكەر

### ١_٨_٢_ ئەركی فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی:

فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی لە ڕووی سینتاكسییەوە پەیوەندی لەگەڵ كاردا هەیە: ((فرەیزە ئەدڤێربڵییەكان[٤٥]، سێ ئەرك بەجێ دەهێنن، كە بریتین لە: سەربار، یاریدەدەر، تەواوكەر)).[٤٦] واتە فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی ئەرك لە ڕستەدا دەبینێت و هەندێك لە وشەی ئەركی دەتوانن بە تەنیا ئەم ئەركە ببین. فرەیزە پێشناوییەكانیش ڕۆڵێكی گرنگ لەپڕكردنەوەی جێكەوتەی فرەیزە ئاوەڵگوزارییەكان دەبینن و چەندین جۆری فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی، وەك (كات، شوێن، چۆنیەتی،.... هتد) دەنوێنن.[٤٧] كەواتە فرەیزی پێشناوی دەتوانێت لە چاڵی فرەیزی ئاوەڵگوزاریدا بێت و ئەركی تەواوكەر، سەربار و یاریدەدەر ببینێت.

### ١_٨_٢_١_ فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی تەواوكەر:

هەندێ جار لە زمانی كوردیدا، ڕستە بێجگە لە بكەر و كار، پێویستی بە كەرەسەی تر دەبێت بۆ ئەوەی ڕستەكە لە ڕووی ڕێزمانی و واتاوە تەواو بێت. یەكێك لەو كەرەسانە فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی تەواوكەرە، هەر بۆیە هەندێ كار لە زمانی كوردیدا، بە پێی پێویستی خۆیان داوای فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی تەواوكەر دەكەن، كە گرنگییەكەی لە بەركارێكی راستەوخۆ لە ڕستەدا بۆ كارەكە كەمتر نییە. ئەمەش وا دەكات، كە ببێتە كەرەسەیەكی سەرەكی و هەبوونی لە ڕستەدا بە خورتی بێت. بۆ نموونە:

_ كەلاوەكەیان بە خانوو لە قەڵەم دا. _ باوكم لە ماڵەوە بوو.
_ ترێ لە هاویندا پێدەگات. _ ماسی بێ ئاو ناژی.




لەم ڕستانەدا هەر یەك لە فرەیزە پێشناوییەكانی (بە خانوو، لە ماڵەوە، لە هاویندا، بێ ئاو، بە شاخەكەدا) ئەركی فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی تەواوكەریان لە ڕستەكانیاندا بینیوە، واتە جۆری كارەكە داوای كردوون و ناكرێت لە ڕستەدا لابدرێن، بە لادانیان لێڵ واتایی یاخود ڕستەی ناڕێزمانی و بێ واتا دروست دەبێت. بۆ نموونە:

_شاخەوانەكە هەڵگەڕا.*

_ ترێ پێدەگات. (لێڵ واتاییە)

### ١_٨_٢_٢_ فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی سەربار:

كاتێك فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی لە ئەركی سەرباردا لە فرەیزی پێشناوی پێكدێت، زانیاریی زیاتر لە بارەی كات و شوێن و چۆنیەتی.....هتد ڕوودانی كارەكە دەخاتە ڕوو، واتە هاتنی فرەیزی ئاوەڵگوزارەی سەربار لە ڕستەدا كەرەسەیەكی ناسەرەكییە، هەر بۆیە لادانی لە ڕستەدا بە ئارەزووە(Optinal)، هەبوونیشی پەیوەندیی سینتاكسی و واتایی نێوان بكەر و كار زیاتر ڕوون دەكاتەوە. بۆ نموونە:

_ ئەوان تا بازاڕ چوون.

_ ئۆتۆمۆبێلەكە بەخێرایی دەڕوات.

_ چاکەم لە ژێرپیاڵەکەدا خواردەوە.

_ ئەوان تا بەیانی دێن.

لەم ڕستانەدا هەر یەك لە فرەیزە پێشناوییەکانی (تا بازاڕ، بەخێرایی، لە ژێرپیاڵەکە، تا بەیانی) ئەرکی فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی سەرباریان لە ڕستەکانیاندا بینیوە، بەم شێوەیە دەتوانین هەر یەك لەم فرەیزە ئاوەڵگوزارەییە سەرباریانە لە ڕستەکانیان لابدەین، بەبێ ئەوەی کار لە لایەنی ڕێزمانی و واتایی ڕستەکە بکەن. بۆ نموونە:

_ ئەوان چوون.

_ ئۆتۆمۆبێلەکە دەڕوات.

_ چاکەم خواردەوە.

_ ئەوان دێن.

_نازەنین دەخوێنێت.

هەروەها دوو فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی یاخود زیاتر دەتوانێت لە ڕستەیەکدا بەیەکەوەبێن، بەلام ئەگەر فرەیزی ئاوەڵگوزارەی کاتییان لەگەڵ بوو، ئەوا دەبێت فرەیزە ئاوەڵگوزارییە کاتییەکە لە پێش فرەیزە ئاوەڵگوزارییەکانی ترەوە بێت. بۆ نموونە:

_ نازەنین لە بەیانییەوە لە کتێبخانە دەخوێنێت.

فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی کاتی — فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی شوێنی

_ لە کەرکووك تا هەولێر بە پێ هاتووین.

فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی شوێنی — فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی شوێنی — فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی چۆنیەتی

**١_٨_٢_٣_ فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی یاریدەدەر:**

وشە ئەرکی سەرسوڕمان وەك (خۆزگە، کاشکی، بریا... هتد) دەتوانن لە شوێنی فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی لە ڕستەدا بێن، ئەرکی فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی یاریدەدەر ببینن. فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی یاریدەدەر پێویستی دەردەبڕن،

شێوازی داڕشتنی کار داوای ئەم جۆرە فرەیزە دەکات.[٤٨] بۆ نموونە:

_ خۆزگە شەڕ لە جیهاندا نەمابووایە.

_ بریا خوێندنم تەواو کردبا.

هەروەها وشە ئەرکییەکانی (وا، زۆر، کەم، ئەوەندە، هێندە، چەند... هتد)، بە تەنیا دەتوانن لە شوێنی فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی لە ڕستەدا بێن، ئەرکی فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی ببینن. بۆ نموونە:

_ کراسەکە کەمێک سووتاوە.

_ ئەمساڵ باران زۆر بوو.

من وا دەڕۆم.




**١_٩_ ئەرکی وشەی لێکدەر لە ڕستەدا:**

وشەی لێکدەر لە پێکهێنانی ڕستەی ئاڵۆز[٤٩] و ڕستەی لێکدراودا ئەرکی سینتاکسی جیاواز دەبینن، بە شێوەیەك، کە چۆنیەتی لێکدانی بەش و جۆرەکانی ڕستە بە مەبەستی جیاواز بە یەکەوە دەگەیێنن.

**١_٩_ ١_ لە ڕستەی ئاڵۆزدا:**

وشەی لێکدەر وەکو کەرەسەیەك ڕۆڵی سینتاکی لە پێکهێنانی ڕستەی ئاڵۆزدا هەیە: ((ڕستەی تێکەڵ بە تێکەڵبوونی دوو ڕستە لە ڕووی سینتاکسەوە جیاواز دەگوترێت، کە یەکێکیان سەرەکییە و ئەوی دییان ڕستەی شوێنکەوتووی ڕستە سەرەکێکەیە. پەیوەندیی ڕستەی شوێنکەوتوو بە ڕستە سەرەکییەوە، باری

شوێنكەوتنی بە كۆمەڵە هۆیەكی سینتاكسی پێویستە، كە لە هەمووان گرنگتر و بایەختر ئامرازی گەیەنەرە، ئەم ئامرازە دەچێتە نێو پێكهێنان و داڕشتنی ڕستەی شوێنكەوتووەوە)).(٥٠) واتە ڕستەی ئاڵۆز بەلایەنی كەم دوو ڕستە لە خۆ دەگرێت، یەكێكیان سەرەكییە پێی دەوترێت (شاڕستە)، ئەویتریان لاوەكییە پێی دەوترێت (پاڕستە)، ئینجا وشەی لێكدەر لە ڕستەی ئاڵۆزدا، كە لە ناو پێكهاتەی پاڕستەدایە ئەركێكی سینتاكسی جێبەجێ دەكات، ئەویش گەیاندن و لێكدانی شاڕستە و پاڕستەیە بە یەكترییەوە. پاڕستە لە وشەیەكی لێكدەر وەك سەرەو ڕستەیەك Ip وەكو تەواوكەرێك پێكدێت، بە پێی ڕێزمانی بەرهەمهێن ڕستەی ئاڵۆز بە فرەیزی تەواوكەر Cp شیدەكرێتەوە، هەر بۆیە فرەیزی تەواوكەری یەكسانە بە ڕستە هەر وەكو لەم هێڵكارییە درەختییەدا خراوەتە ڕوو.




بەپێی ئەم هێڵكارییە درەختییە ڕستەی ئاڵۆز خاوەنی دیاریكار و فرەیزی تەواوكەرییە، فرەیزە تەواوكەرییەكەش خاوەنی وشەیەكی لێكدەر وەكو سەرەو Ip یەك وەكو تەواوكەرە، بەم جۆرە ڕستە ئاڵۆزەكان دەتوانیین بە فرەیزی تەواوكەری شی بكەینەوە. بۆ نموونە:






لەم ڕستە ئاڵۆزەدا، من دانیشتبووم (دیاریکار)ە و پاڕستەکەش لە سەرەی (کە) و تەواوکەری (ئەو هات) پێکهاتووە. پاڕستە (فرەیزی تەواوکەری) لە ڕستەی ئاڵۆزدا زۆر جۆری هەیە. هەر بۆیە وشەی لێکدەر جۆری پاڕستە دیاری دەکات، خۆی وەکو سەرەی ڕستە دەنوێنێت.[٥٢] ئەمەش وا دەکات، کە هەندێك لە جۆرەکانی پاڕستە بە پێی وشەی لێکدەر دەستنیشان بکەین و لە هێڵکاریی درەختیدا بیانخەینە ڕوو:

### ١_٩_١_١_ وشەی لێکدەری (کە)

وشەی لێکدەری (کە) بەشداری لە پێکهێنانی پاڕستەدا دەکات و ژمارەیەك پاڕستە پێکدەهێنێت، لەوانەش: پاڕستەی دەرخەری بکەر، پاڕستەی دەرخەری بەرکار، پاڕستەی دەرخەری بەرکاری ناڕاستەوخۆ، پاڕستەی دەرخەری دەرخەری، پاڕستەی دەرخەری کات.

١_ پاڕستەی دەرخەری بکەر: وشەی لێکدەری (کە) دەبێتە هۆی دروستبوونی ئەم جۆرە پاڕستەیە، پاڕستەکەش زانیاریی زیاتر لە بارەی بکەری ناو شاڕستە دەخاتە ڕوو، پەیوەندییەکی واتایی پێك دەهێنێت. پاڕستەکە سەرەی ئەو فرەیزە ڕوون دەکاتەوە، کە ڕۆڵی بکەر لە شاڕستەدا دەگێڕێت و دەچێتە ناو ڕۆنانی شاڕستەکەو فراوانی دەکات.[٥٣] بۆ نموونە:

_ کارزان، کە لە زانکۆ دەخوێنێت، خێزاندارە.

لەم ڕستەیەدا فرەیزی ناوی (کارزان) ئەرکی بکەری شاڕستەی بینیوە و (کە لە زانکۆ دەخوێنێت) پاڕستەی دەرخەری بکەری شاڕستەکەیە و وەسفی لایەنێکی بکەرەکە دەکات و ڕوونی دەکاتەوە، پەیوەندییەکی واتایی لە نێوان شاڕستە و پاڕستەکە دروست بووە، بەو هۆیەشەوە ڕستەیەکی ئاڵۆز بەرهەمهاتووە، کە لەم هێڵکارییە درەختییەدا شیدەکەینەوە.




٢_ پارستەی دەرخەری بەرکار: وشەی لێکدەری (کە) دەبێتە هۆی دروستبوونی پارستەی دەرخەری بەرکار و بەشداری لە پێکهاتنی دەکات، پارستەکەش زانیاریی زیاتر لە بارەی بەرکاری ناو شارستە دەخاتەڕوو، ڕۆڵی بەرکار ڕوون دەکاتەوە و فراوانی دەکات. بۆ نموونە:

_ ئاسۆ هۆنراوەیەکی خوێندەوە، کە هی قانع بوو.

_ ئازاد خانووێکی کڕی، کە دەکەوێتە گەڕەکی سەیداوە.

لەم دوو ڕستەیەدا هەر یەکە لە پارستەکانی دەرخەری بەرکار (کە هی قانع بوو ، کە دەکەوێتە گەڕەکی سەیداوە) وەسفی هەر یەکە لە (هۆنراوە، خانوو) بەرکاری شارستەکە دەکات و ڕوونیان دەکەنەوە و هەردوو پارستەکە ڕۆڵی دەرخەریان گێڕاوە. وشەی لێکدەری (کە) لە پارستەی دەرخەری بەرکاریدا دەتوانرێت، لابدرێت، بە بێ ئەوەی ڕۆڵی سینتاکسی و واتای ڕستە ئاڵۆزەکە بگۆڕێت، بەڵام هەست دەکرێت، کە وشەی لێکدەری (کە) لاچووە.[٥٤]

_ ئاسۆ هۆنراوەیەکی خوێندەوە، ∅هی قانع بوو.

_ ئازاد خانووێکی کڕی، ∅دەکەوێتە گەڕەکی سەیداوە.

٣_ پارستەی دەرخەری بەرکاری ناڕاستەوخۆ: وشەی لێکدەری (کە) بەشداری لە پێکهاتنی پارستەی دەرخەری بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەکات و دەبێتە

بەشێکی سەرەکی لە پاڕستەکەدا، پاڕستەکەش زانیاریی زیاتر لە بارەی بەرکاری ناڕاستەوخۆی ناو شاڕستە دەخاتەڕوو، ڕۆڵی بەرکاری ناڕاستەوخۆ ڕوون دەکاتەوە. بۆ نموونە:

_ ئارام بە ئۆتۆمۆبێلەکەی، کە دوێنێ کڕیبووی، هات.

_ من بە ئاسۆ، کە برای بچووکمە، پارەکەت بۆ دەنێرم.

لەم دوو ڕستە ئاڵۆزەدا هەریەکە لە (ئارام بە ئۆتۆمۆبێلەکەی هات، من بە ئاسۆ پارەکەت بۆ دەنێرم) شاڕستەن، (کە دوێنێ کڕیبووی، کە برا بچووکمە) پاڕستەن، لە ناو شاڕستەکاندا فرەیزی پێشناوی (بە ئۆتۆمۆبێل، بە ئاسۆ) لە ئەرکی بەرکاری ناڕاستەوخۆدان. لە پاڕستەی دەرخەری بەرکاری ناڕاستەوخۆدا: ((پاڕستە لایەنێکی بەرکاری بە یاریدەی شاڕستە ڕوون دەکاتەوە و دەبێتە دیارخەری بەرکاری بەیاریدەی شاڕستە)).[٥٥]

٤_ پاڕستەی دەرخەری دەرخەری: ئەم جۆرە پاڕستەیە واتە ((ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە زمانی کوردیدا بە هۆی ئامرازی گەیەنەری (– کە) تێکەڵ بە ڕستەی سەرەکی دەبێت)).[٥٦] بەم شێوەیە دەرخەر لە شاڕستەدا بە هۆی پاڕستە فرەوان دەکرێت و زانیاریی زیاتر لە بارەیەوە دەخرێتەڕوو. بۆ نموونە:

_ هۆنراوەی هێمن، کە خەڵکی مهاباد بوو، زۆر خۆشە.

_ خانووی ئاسۆ، کە ئەندازیارە، زۆر گەورەیە.

لەم دوو ڕستە ئاڵۆزەدا فرەیزی ناوی (هێمن، ئاسۆ) بوونەتە دەرخەری فرەیزی ناوی (هۆنراوە، خانوو)، کە ئەمانەش بوونەتە دەرخراو لە شاڕستەکەدا، ئەم دەرخەرانەش بە پاڕستە فراوان کراون واتە بوونەتە دەرخەری دەرخەری، لەم بارەدا هەردوو دەرخەر (هێمن، ئاسۆ) بوونەتە دەرخراو لەبەر ئەوەی پاڕستەکانی (کە خەڵکی مهاباد بوو، کە ئەندازیارە) بوونەتە دەرخەر بۆیان، بەم جۆرە پاڕستەی دەرخەری دەرخەری دروست دەبێت.

**١_٩_١_٢_ وشەی لێکدەری (کە، هەرکە، تا، تاکو، هەتا، هەتاکو، بۆ ئەوەی ...):**

لە ڕستەی ئاڵۆزدا ئەم وشە لێکدەرانە دەبنە کەرەسەیەکی سەرەکی بۆ

پێکهێنانی ئەم جۆرە پاڕستانە: (پاڕستەی دەرخەری کاتی، پاڕستەی دەرخەری مەبەست، پاڕستەی دەرخەری پێوانە).

١_ پاڕستەی دەرخەری کاتی پێکدێت. بە هۆی وشەی لێکدەری (کە، هەرکە، هەتا، هەتاکو، ...) یا هەر وشەیەکی کات، کە لەگەڵیاندا بەکار بهێنرێت، بەو هۆیەوە پاڕستەی دەرخەری کاتی بە شاڕستەکەیەوە بۆ دیاریکردنی کاتی ڕوودانی کارەکە دەبەستێتەوە.(٥٧) بۆ نموونە:

_ هەتا من هاتم، ئەو ڕۆیشتبوو.

_ کە بەهار هات، دەچین بۆ سەیران.

_ تۆ دانیشە، هەتاکو کراسێك دەدرووم.

لەم ڕستە ئاڵۆزانەدا پاڕستەی (هەتا من هاتم، کە بەهار هات، هەتاکو کراسێك دەدرووم) ئەرکی دەرخستنی کاتی ڕوودانی کاری (ڕۆیشتبوو، دەچین، دانیشە) لە شاڕستەدا دەبینن، زانیاریی زیاتر لە بارەی کاتی ڕوودانی کارەکە دەخەنەڕوو، کاتی ڕوودانی کارەکە دەستنیشان دەکەن. لەم هێڵکارییە درەختییەدا نموونەیەکیان شیدەکەینەوە.

تۆ دانیشە، هەتاکو کراسێك دەدرووم.



٢_ پاڕستەی دەرخەری مەبەست: هەندێك لە وشەی لێكدەر ڕۆڵی سەرەكی لە پێكهێنانی پاڕستەی دەرخەری مەبەست دەگێڕن: ((ئەم جۆرە پاڕستانە ئامانجی ڕوودانی كاری شاڕستە دەردەخەن و بە زۆری ئامرازە لێكدەرەكانی (بۆ ئەوەی، تا، هەتا، تاكو، هەتاكو، ...) تیایاندا بە كاردێن)).[٥٨] واتە ئەم جۆرە پاڕستەیە مەبەست كارەكە بە شێوەیەكی ورد و ڕوون دەخاتە ڕوو. بۆ نموونە:

_ ئێمە دەخوێنین، بۆ ئەوەی سەركەوین.

_ ئێمەی كورد ڕاپەڕین، تاكو كوردستان ئازاد بێت.

لەم دوو ڕستە ئاڵۆزەدا پاڕستەكانی دەرخەری مەبەست (بۆ ئەوەی سەركەوین، تاكو كوردستان ئازاد بێت) ئامانجی كاری (دەخوێنین، ڕاپەڕین) لە شاڕستەدا ڕوون كردۆتەوە، كە دەكرێت هەردوو پاڕستەكە ببنە وەڵام بۆ پرسیاری (بۆچی دەخوێنین؟)، (بۆچی ڕاپەڕین؟).

٣_ پاڕستەی دەرخەری پێوانە: ئەم جۆرە پاڕستەیە وشەی لێكدەری (كە، تا، هەتا، تاكو، هەتاكو...) بەشداری لە پێكهێنانیدا دەكات و ڕادە و پێوانەی كار شاڕستەی پیشاندەدەن: ((جگە لەمەش لە شاڕستەدا دیارخەرێكی پێوانەی نادیاری وەك (بە ڕادەیەك، هێندە، ئەوەندە ....) لە پێش ئاوەڵناوی شاڕستەكە دێت و ئەركی پاڕستە دەرخستن و سنووردارکردنی ئەو دیارخەرەیە)).[٥٩] واتە پاڕستەی دەرخەری پێوانە لە ڕستەی ئاڵۆزدا، دەبێت لەگەڵیدا كەرەسەیەكی پێوانەیی لە شاڕستەدا هەبێت بۆ ئەوەی بڕ و ڕادەی كاری شاڕستەكەی پێ دیاری بكرێت. بۆ نموونە:

_ خانووەكە ئەوەندە گران بوو، كە نەمتوانی بیكڕم.

_ كتێبەكە بە ڕادەیەك گەورەیە، هەتاكو هەڵگرتنی زەحمەتە.

لەم ڕستانەدا (كە نەمتوانی بیكڕم، هەتاكو هەڵگرتنی زەحمەتە) پاڕستەی دەرخەری پێوانەیین، لە ڕێگەی وشە ڕادەكانی (ئەوەندە، بە ڕادەیەك) ناو شاڕستەكاندا، توانیویانە ڕادە و پێوانەی كاری شاڕستەكان دەربخەن.

**١_٩_١_٣_ وشەی لێکدەری (چونکە،...)**

لە ڕستەی ئاڵۆزدا وشەی لێکدەری (چونکە،...) بەشداری لە پێکهێنانی پاڕستەی دەرخەری هۆ دەکات و پاڕستە بە شاڕستەی دەبەستێتەوە، ئەم جۆرە پاڕستەیە هۆی ڕوودانی کاری شاڕستە دیاری دەکات. بۆنموونە:

_ قوتابییەکان نەچوون بۆ قوتابخانە، چونکە پشوو بوو.

_ منداڵەکە یاری نەدەکرد، چونکە نەخۆش بوو.

**١_٩_١_٤_ وشەی لێکدەری (بۆیە، ...)**

وشەی لێکدەری (بۆیە، ...) بەشداری لە پێکهێنانی پاڕستەی دەرخەری ئەنجام دەکات، ئەم جۆرە پاڕستەیە ئەنجامی ڕوودانی کاری شاڕستە بە شێوەیەکی ورد و ڕوون دەخاتە ڕوو، کەواتە: ((ڕستەی شوێنکەوتووی ئەنجام، ئەنجامی مەبەستی ڕستەی سەرەکی لە ڕستەی تێکەڵدا ڕوون دەکاتەوە)).[٦٠] بۆ نموونە:

_ پشوو بوو، بۆیە قوتابییەکان نەچوون بۆ قوتابخانە.

_ نەخۆش بوو، بۆیە منداڵەکە یاری نەدەکرد.

بەم شێوەیە، ئەمە بە دیار دەکەوێت، کە: ((پاڕستە دیارخەرەکانی هۆ و ئەنجام پێچەوانەی یەکترن، واتە ئەگەر شاڕستە و پاڕستەکانیان ئاڵوگۆڕ بکەین لەگەڵ گۆڕینی ئامرازە لێکدەرەکانیان، پاڕستەکانی هۆ و ئەنجام ئاڵوگۆڕ دەبن)).[٦١] هەروەکو لە نموونەکانی پاڕستەی دەرخەری هۆ و پاڕستەی دەرخەری ئەنجام ڕوونمان کردۆتەوە.

**١_٩_١_٥_ وشەی لێکدەری (ئەگەر، مەگەر، گەر، ...)**

پاڕستەی دەرخەری مەرج، پاڕستەیەکە بە هۆی ئامرازی گەیەنەری مەرجی (ئەگەر، مەگەر، گەر)ەوە، بە شاڕستەی وەڵامی مەرجییەوە، دەبەستێتەوە، کە ڕوودانی فرمانی یەکەم مەرجە بۆ ڕوودانی فرمانی دووەم.[٦٢] واتە لە ڕستەی ئاڵۆزدا ئەم جۆرە پاڕستەیە مەرجی ڕوودانی کاری شاڕستە دیاری دەکات. بۆ نموونە: _ ئەگەر کاتم هەبوو، چیرۆکێکت بۆ دەخوێنمەوە.

گەر بچم بۆ بازاڕ، دیارییەك بۆ تۆ دەكڕم.




### ١_٩_٢_ لە ڕستەی لێكدراودا:

وشـەی لێكـدەر لـەم جـۆرە ڕسـتەیەدا ئـەركی بەیەكـەوە گەیانـدنی ڕسـتە سادەكان و بەرهـەمهێنانی ڕسـتەیەكی لێكـدراوە، هـەروەك لـە پێناسـەی ڕسـتەی لێكدراودا هاتووە: ((ئەو ڕستەیەیە، كە لـە ئـەنجامی لێكدانی دوو ڕسـتە یـا زیـاتر دروسـت دەبێـت، ئـامرازی لێكـدەر بەشـەكانی بەیەكـەوە دەبەسـتێتەوە و هـەر ڕستەیەك، وەك ڕستەیەكی سەربەخۆ و پڕ لە ڕووی ڕێزمانـەوە ڕەفتـارە دەكـات و ئامرازەكــە ناچــێتە نــاو دارشــتنی ڕســتە، بــەڵكو ڕســتەكان بەیەكــەوە دەبەستێتەوە)).[٦٣] هـەر بۆیـە وشـەی لێكـدەر لـە پێناسـەی ڕسـتەی لێكـدراودا كەرەسەیەكی سەربەخۆیە و پەیوەندی بە ڕستەكانەوە نییە و تەنها ئەركی لێكدان دەبینێت. بۆ ڕێككەوتنی ڕستەی لێكدراو لەگەڵ تیۆری ئـێكس _ بـاڕدا ژمارەیـەك لـە توێـژەران وەكـو دەرئـەنجامێك پێشـنیازێكیان خسـتۆتە ڕوو، كـە ئەمـەش پێشنیازەكەیە:




لەم بارەدا وشەی لێكدەر دەبێتە سەرە لە پۆلە ئەركییەكە و كەرەسەی یەكەمی لێكدراوەكە، كە ف س١ وەكو دیاریكار و كەرەسەی دووەمی لێكدراوەكە ف س٢ وەكو تەواوكەر وەردەگرێت.[٦٤] بەم شێوەیە ڕستەی لێكدراو لە هێڵكاری درەختیدا بە فرەیزی لێكدەر Cop شیدەكرێتەوە، وشەی لێكدەر لەم ڕستەیەدا دەبێتە سەرەی فرەیزی لێكدەر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕستەی لێكدراو بە چەند جۆرێك پۆڵین دەكرێن.[٦٥] لەبەر ئەوەی وشەی لێكدەر ڕۆڵێكی گرنگ لە پێكهێنانی ڕستەی لێكدراو دەبینێت. دەتوانرێت، ڕستەی لێكدراوەكان بە پێی وشە لێكدەرەكان بكرێن بە چوار جۆر.[٦٦] لێرەدا ئێمە بە پێویستی دەزانین، كە جۆری ڕستەی لێكدراوەكان بە پێی وشە لێكدەرەكان پۆڵین بكەین:

**١_٩_٢_١_ وشەی لێكدەری (و، ئنجا/ ئەنجا/ ئەوجا/ ئەمجا/ ئینجا، ئەوسا، هەروەها، هەم...هەم،......)**

ئەم جۆرە وشە لێكدەرانە بەشداری لە پێكهێنانی ڕستەی لێكدراوی هاوڕێك[٦٧] دەكەن، كاتێك وشەی لێكدەر لەم جۆرە ڕستەیەدا بەشدار دەبێت جۆرە هاوسەنگییەك لە نێوان ڕستە سادەكانی ناو ڕستە لێكدراوەكە لە بەشی ناو و بەشی كار پێكدەهێنێت. هەر بۆیە ڕستەی لێكدراوی هاوڕێك: ((ئەو جۆرە ڕستانە دەگرێتەوە، كە لە ڕووی ئەنجامدانی كاری ڕستەكانیان هاوڕێكن و كاری هەموو ڕستە لێكدراوەكان لە شێوەی ئەرێن و هەمان ئاراستە وەردەگرن)).[٦٨] بۆ نموونە:




لە ڕستەی لێکدراوی هاوڕێکی (پیاوەکە هات و دانیشت) دەبینین ڕستەی یەکەم (پیاوەکە هات) دیاریکارە و ڕستەی دووەم (دانیشت) تەواوکەرە، وشەی لێکدەری (و) ئەرکی سەرەی بینیوە و بۆتە هۆی دروستکردنی پەیوەندییەکی هاوسەنگ لە نێوان کاری ڕستە سادە لێکدراوەکان، هەروەها بە هۆی هاوبەشی بکەرەکانیان، بکەری دووەم لە ڕستەکە لادراوە.

**١_٩_٢_ ٢_ وشەی لێکدەری (بەڵام/ بەلآن، ئەگەرچی، کەچی، هەرچەند، بەڵکو/ بەڵکم، بەڵکی/ بەڵکە، نەك/ نەوەك/ نەوەکو/ نەکو، دەنا، ئەگینا...)**

ئەم وشە لێکدەرانەی وەکو (بەڵام، ئەگینا، بەڵکو.......) بەشداری لەو ڕستە سادە لێکدراوانە دەکەن، کە ئەنجامدانی کارەکانیان پێچەوانەی یەکترن، بەو هۆیەوەش جۆرێك لە ڕستەی لێکدراو پێکدەهێنن، کە پێی دەگوترێت ڕستەی لێکدراوی پێچەوانە. مەبەستیش لەم جۆرە ڕستانە جیاوازیی پێچەوانەیی لە نێوان دوو دیاردە یان ڕووداو یان بیر پیشان دەدات.[٦٩] واتە لە ڕستەی لێکدراوی پێچەوانەدا ڕستەی یەکەم لە ڕووی ڕووداو یان بیرەوە پێچەوانەی ڕستەی دووەمە، بەم شێوەیە ئەم دوو ڕستەیە بەیەکەوە بەهۆی وشەی لێکدەرەوە ڕستەیەکی لێکدراوی پێچەوانە بەرهەم دەهێنن. بۆ نموونە:

_ براكەم بخوێنە ئەگینا دەرناچیت.
_ هەژار گۆرانیبێژ نەبوو بەڵكو شاعیر بوو.
ڕۆژنامەكەم بۆ ئاسۆ برد بەڵام نەیخوێندەوە.




لەم ڕستەیەدا ڕستەی یەكەم (ڕۆژنامەكەم بۆ ئاسۆ برد) دیاریكارە و ڕستەی دووەم (نەیخوێندەوە) تەواوكەرە، وشەی لێكدەری (بەڵام) ئەركی سەرەی بینیوە و بۆتە هۆی دروستكردنی پەیوەندییەكی پێچەوانەیی لە نێوان كاری ڕستە سادە لێكدراوەكان و ڕستەی لێكدراوی پێچەوانەی پێكهێناوە. هەروەها دەكرێت لەگەڵ وشەی لێكدەری (بەڵام) وشەیەكی تری لێكدەر بەشداری پێكهێنانی ئەم جۆرە ڕستەیە بكات، بەمەرجێك لە سەرەتای ڕستەی یەكەمەوە بێت. بۆ نموونە:

_ ئەگەرچی ڕۆژنامەكەم بۆ ئاسۆ برد بەڵام نەیخوێندەوە.

### ١_٩_٢_٣_ وشەی لێكدەری (یا/ یان/ یا...یا/ یان...یان،...)

ئەم وشە لێكدەرە شێوەی (یا...یا/ یان...یان)و بە تەنهاش بەشێوەی (یا/ یان) بە سادەیی بۆ بەستانەوەی دوو ڕستەی سادە لە ڕستەیەكی لێكدراودا بە مەبەستی جیاجیا لەگەڵ زۆربەی كاتەكانی كاردا بەكار دەهێنرێت.(٧٠) بەم شێوەیە ئەم جۆرە وشە لێكدەرە ڕستەی لێكدراوە هەڵبژاردە پێكدەهێنێت، واتە لە ڕستەكەدا دوو هەڵبژاردەت لەبەر دەستدایە، یەكێكیان هەڵدەبژێریت. بۆ نموونە:

_ یا تۆ وەرە یا من دێم.
_ من ئەمڕۆ دێم یان بەیانی.

هەنار دەخۆیت یان سێو.




لە ڕستەی لێکدراوی هەڵبژاردەی (هەنار دەخۆیت یان سێو) ڕستەی یەکەم (هەنار دەخۆیت) دیاریکارە و ڕستەی دووەم (سێو) تەواوکەرە، وشەی لێکدەری (یان) ئەرکی سەرەی بینیوە و بۆتە هۆی دروستکردنی ئەم جۆرە ڕستەیە، ڕستەکە خۆی لە بنچینەدا ئەمەیە (تۆ هەنار دەخۆیت یان تۆ سێو دەخۆیت)، بەڵام لەبەر ئەوەی فرەیزی ناوی (تۆ)، کە ئەرکی بکەری بینیوە، لەگەڵ فرەیزی کاری لە هەردوو ڕستەکەدا هاوبەشن، بۆیە لە ڕستەی یەکەمدا بکەر لادەدرێت و جێناوی لکاوی (یت) شوێنی بکەری ڕستەکەی دەگرێتەوە، بکەرەکە شوێنی بە پڕۆ پڕ دەکرێتەوە، پاشان بکەری ڕستەی دووەمیش لادەدرێت، لە کارەکانی هەردوو ڕستەکەش کاری ڕستەی دووەم لادەدرێت. هەر بۆیە فرەیزە هاوبەشەکان لە ڕستەی لێکدراودا کەرەسە و کەتیگۆرییە دووبارەکان دەکرتێنرێن و لادەدرێن و شوێنە بەتاڵەکان لە لایەن سەرە ڕێزمانییەکانی خۆیان ئاراستە دەکرێن.[71] هەروەها وشەی پرسی (ئایا، کام...) دەتوانرێت، لەگەڵ وشەی لێکدەری (یا/ یان) لە ڕستەی لێکدراوی هەڵبژاردە بەکاربهێنرێت. بۆ نموونە:

_ ئایا نەوزاد بە یەکەم دەرچوو یان ئازاد؟

_ کامیان بە یەکەم دەرچوو نەوزاد یا ئازاد؟

### ١_٩_٢_٤_ وشەی لێکدەری (نە...نە):

وشـەی لێکـدەری (نە...نـە) بـە پێـی ئـەو تایبەتییـەی، کـە هەیـەتی دوو ڕستەی سادە لە یەکتر دەدات، هەر یەکەیان سەرەتای ڕستەیەکی سـادە دەگرێـت و ڕستەیەکی لێکدراوی نەرێ پێك دەهێنێت. ئەم جۆرە ڕسـتەیە بـە زۆری لـە دوو ڕسـتەی نـەرێ پێکـدێت و هیچیان جێبـەجێ نـاکرێن.[٧٢] واتـە وشـەی لێکـدەری (نە...نە) هەردوو ڕستە سادەکە دەخاتـە بـاری نـەرێوە و بـە یەکـەوە ڕسـتەیەکی لێکدراوی نەرێ دروست دەکەن. بۆنموونە:

_ نە ئەوەندە شیرین بـە قووتـت بـدەم، نـە ئەوەنـدە تـاڵ بـە فڕێـت بـدەم. (پەندی کوردی)

نە ئاسۆ هاتووە نە ئاکۆ




لەم ڕستەیەدا (نە ئاسۆ هـاتووە، نـە ئـاکۆ) ڕسـتەی یەکـەم (ئاسـۆ هـاتووە) دیاریکارە و ڕستەی دووەم (ئاکۆ) تەواوکەرە، وشەی لێکـدەری (نە...نـە) ئـەرکی سەرەی بینیوە و بۆتە هۆی دروستکردنی ڕستەی لێکدراوی نەرێ، ڕسـتەکە خـۆی لە بنچینەدا ئەمەیـە (نـە ئاسـۆ هـاتووە، نـە ئـاکۆ هـاتووە)، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی فرەیزی کاری (هاتووە) لە هەردوو ڕسـتەکەدا هاوبەشـە، بۆیـە لـە ڕسـتەی دووەم لادەدرێـت و دووبـارە نابێتـەوە، هـەر لـەم جـۆرە ڕسـتەیەدا ئەگـەر هـاتوو بکـەر هاوبەش بوو، بە هەمان شێوە یەکێکیان لادەرێت و دووبارە نابێتەوە.

**ئەنجامەکان:**

ئـەو ئەنجامانـەی، کـە لـەم لێکۆڵینەوەیـە پێیگەیشـتووین، لـەم خاڵانـەدا دەیانخەینە ڕوو:

١_ وشەی ئەرکی دوو ئەرك ئـەنجام دەدات، یەکـەمیان بـەجێهێنانی ئـەرکی ڕێزمانییە، بەوەی پەیوەندیی سینتاکسی نێوان کەرەسەکانی ڕسـتە ڕێکدەخـەن و دووەمیشیان گەیاندنی واتایە لە ناو ڕستەدا.

٢_ بەپێی ئـەو پۆلێنـەی، کـە لـەم لێکۆڵینەوەیـە کـراوە، وشـەی ئـەرکی لـە زمـانی کوردیـدا پێکهـاتوون لـە: ئـامرازی لێکـدەر، پێشـناو، ئـامرازی بـانگکردن، جێنـاوی (سـەربەخۆ، خـۆیی، ئامـاژەکردن، دیـار، نادیـار، هـەیی، پـرس، نـەرێ، چـەندێتی، هاوبـەش). **وشـەی فەرهـەنگی پێکهـاتوون لـە: نـاو، ئاوەڵنـاو، کـار، ئاوەڵکار، ژمارە.**

٣_ وشە ئەرکییەکان سەر بە پۆلی زمانە سەربەخۆکانی جیهانـە و لـە پـۆلی داخراوە و ژمارەیان لە زماندا دیاریکراو و کەمە، بەڵام زۆر دووبارە دەبنەوە .

٤_ وشە ئەرکییەکان بە هـۆی ئـەوەی بەشـێکن لـە کەرەسـەکانی زمـان، لـە پەیوەندیی ستوونیدا لە شوێنی هاوپۆلـەکانیان لـە ڕسـتەدا دێـن و شـوێنی یـەکتر دەگرنـەوە و ڕسـتەی جیـاواز دروسـت دەکـەن، هـەروەها وشـە ئەرکییـەکان لـە پەیوەنـدیی ئاسـۆییدا لەگـەڵ وشـە فەرهەنگییەکانـدا بـە شـێوەی زنجیرەیـی لـە ڕیزبـوونێکی تایبەتـدا بـە دوای یـەکترەوە دێـن لـە شـێوەی ڕاسـتەهێڵ، ڕسـتەی جۆراوجۆر پێکدەهێنن.

٥_ وشـە ئەرکییـەکان ئـەرکی سینتاکسـی جیاجیـای وەکـو: بکـەر، بـەرکار، تەواوکەر، سەربار لە ڕستەدا دەبینن، بـەپێی ڕێزمـانی بەرهـەمهێنی چۆمسـکی لـە هێڵکاری درەختیدا شوێنی خۆیان هەیە و شیدەکرێنەوە.

٦_ هەندێك لە وشـە لێکـدەرەکان بەشـداری لـە پێکهێنـانی ڕسـتەی ئـاڵۆزدا دەکەن و دەتوانن ژمارەیەك جۆری پاڕستەی جیـاواز وەکـو: پاڕسـتەی دەرخـەری بکەر، پاڕستەی دەرخەری بەرکار، پاڕستەی دەرخەری کـاتی ..... لـە نـاو ڕسـتە ئاڵۆزەکاندا دروست بکەن.

٧_ هەندێك لە وشە لێكدەرەكان، ڕستەی لێكدراو لە زمانی كوردیدا پێكدەهێنن، هەر ئەم وشە لێكدەرانە بەپێی هاتنیان لە ڕستەكاندا، دەتوانن ڕستەی جۆراوجۆری لێكدراو وەكو: ڕستەی لێكدراوی هاوڕێك، ڕستەی لێكدراوی هەڵبژاردە .... پێكبهێنن.

**پەراوێز و سەرچاوەكان:**

(١) ئەم لێكۆڵینەوەیە لە بەشی یەكەم و سێیەمی ماستەر نامەی قوتابی (ئەمیر محەمەد محەمەدئەمین) بە ناونیشانی (وشەی ئەركی لە زمانی كوردیدا) وەرگیراوە، زانكۆی سەلاحەددین، كۆلێژی پەروەردە، بەشی زمانی كوردی، بە سەرپەرشتی پ.د. یوسف شەریف سەعید.

(٢) BlomFeld (1993) Language, Henry Holt, New York :p178

(٣) زمانەوانی رووسی ل. ڤ. شێربا (١٨٨٠_ ١٩٤٤) پەیڕەوی ڕێبازی بۆدوئینی (قوتابخانەی زمانناسی كازان) دەكرد، دانەری ئەو تیۆرییەی زمانناسییە بوو، كە پشت بە تێبینی و ئەزموونی زمانناسی ڕێرەوی بنەچەیی لە دەنگسازیدا دەبەستێت. بڕوانە: میدیا (١٩٩٨) سەرەتایێكی زمانناسی، بەرگی یەكەم، لە رووسی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی كوردی، لە بلاوكراوەكانی وەزارەتی رۆشنبیری حكومەتی هەرێمی كوردستان، سلێمانی، ل: ٤٣_ ٥٨.

(٤) محەمەد مەعرووف فەتاح (١٩٩٠) زمانەوانی، مطابع دار الحكمة للطباعة والنشر، اربیل، ل: ٩٠ .

(٥) شحدة فارع، جهاد حمدان، موسى عمايرة، محمد العناني (٢٠٠٣) مقدمة في اللغويات المعاصرة، الطبعة الثانية، دار وائل للنشر، عمان، الاردن، ص: ١٢٢ .

(٦) لەم سەرچاوانە ئەم ناوانەشی بۆ بەكارهاتووە:

_ وشەی بەستراو: لێژنەی زمان و زانستەكانی كۆڕی زانیاری كورد (١٩٧٦) ڕێزمانی ئاخاوتنی كوردی،چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ل: ٤٦٥.

_ وشەی ناتەواو: ئەورەحمانی حاجی مارف (١٩٧٩) ڕێزمانی كوردی، مۆرفۆلۆژی، ناو، بەرگی یەكەم، چاپخانەی كۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ل: ١٠.

_ بێژەیا گرێدای: صادق بهاء الدین (١٩٨٧) ڕێزمانا كوردی، مطابع دار الشؤون الثقافية العامة، چاپی یەكەم، بەغدا، ل: ١٥١.

_ وشەی ئەرکی: (محەمەد مەعرووف فەتاح، ١٩٩٠: ٩٠).
_ وشەی ناسەربەخۆ: (یوسف شەریف سەعید (٢٠١٣) وشەسازی زمانی کوردی، لە بلأوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ل: ١٤.
(7) (Crystal, David (1992) An encyclopedia language and languages, Blackwell:p160.
(8) Fromkin Victoria, Robert rodman , Niana hyams (2014) An Introduction to Language , printed in the united states of American:p 35.
(9) Katamba, Frances (2006) MORFOLOGY, Palgrave, Printed and bound in china:p42.
(١٠) ابراهيم مدكور (١٩٨٥) المعجم الوسيط، الجزء الاول، الطبعة الثالثة، مطابع الاوفست بشركة الاعلانات الشرقية ص: ١٧٤ .
(١١) عبدالرؤوف زهدي، سامي أبو زيد (٢٠١١) الجامع في النحو، الطبعة الاولى، مكتبة الفلاح للنشر والتوزيع، الاردن، ص: ١٨.
(١٢) (Crystal 1992:420
(١٣) پۆلی داخراو بەپێی سیستەم ئەو وشە ئەرکییانە دەگرێتەوە، کە سنووردارن، وەك جێناوە کەسییەکان و ئامرازی پەیوەندی......هتد، وشە لە زمانەکانی تر وەرناگرن، هەر بۆیەشە ژمارەیان سنووردارە و ئەندامەکانیان یەکتر دەناسێنن و ئەندامی نوێش وەرناگرن.(یوسف شەریف سەعید،٢٠١٣: ٥)
(١٤) (ئەورەحمانی حاجی مارف، ١٩٧٩: ٩)
(١٥) ئامراز بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، هەر بۆیە ئامراز وشەیە. نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی (١٩٨٢) ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی زانکۆی سەلأحەددین، زانکۆی سەلأحەددین، کۆلێژی ئاداب، بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی، هەولێر،ل: ١٩٣.
(16) Denham, Kristin and Anne Lobeck (2013) Linguistics for Everyone An(١٦) Introduction, Wadsworth, Cengage Learning, Printed in the United States:p 146_149.
(١٧) (محەمەد مەعرووف فەتاح، ١٩٩٠: ٩٩)
(١٨) سەباح ڕەشید قادر (٢٠٠٩) هەندێ لایەنی دەسەلأت و بەستنەوە (GB) لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر،ل: ٣٦.

(١٩) طالب حسین علی (١٩٩٨) هەندێ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستە و واتا لە کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلیجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، ل :٩_١٠.

(٢٠) بڕوانە:

Fattah, M.M. (1997) A Generative Grammar of Kurdish, Unpublised Doctoral Disseration, University of Amsterdum:p246.

_ (طالب حسین علی،١٩٩٨: ١٤)،

_ ئومێد بەرزان برزۆ (٢٠١٠) مۆرفۆسینتاکس و دروستەکانی لە شێوەزاری خانەقیندا، نامەی دکتۆرا، کۆلیجی زمان، زانکۆی سلێمانی،ل: ٩٢، ٩٣.

(٢١) (طالب حسین علی،١٩٩٨ :١٠)

(٢٢) (هەمان سەرچاوە)

(٢٣) (ئومێد بەرزان برزۆ،٢٠١٠: ٩٦)

(٢٤) هەروەها زاراوەی هاونشینی بۆ پەیوەندیی ئاسۆیی و زاراوەی جێنشینی بۆ پەیوەندیی ستوونی بەکاردێت.

(٢٥) سەلام ناوخۆش (٢٠٠٨) پوختەیەك دەربارەی زمانناسی، چاپخانەی کاروان، چاپی دووەم، هەولێر، ل ٣٧.

(٢٦) هیمداد حوسێن بەکر و سەباح رەشید قادر (٢٠٠٩) هەندێ لایەنی زمانەوانی و ڕەخنەی ئەدەبی، گۆڤاری زانکۆی کۆیە، ژ(١٠)، کۆیە،ل: ٤٢ .

(٢٧) (سەلام ناوخۆش،٢٠٠٨: ٤١)

(٢٨) بەپێی ئەو تایبەتییەی، کە وشەی ئەرکی هەیەتی و بەپێی ڕێزمانی بەرهەمهێن، فرەیزی دەرخەری لە لێکۆڵینەوە نوێکاندا شوێنی فرەیزی ناوی دەگرێتەوە، واتە لە شیکردنەوە هێڵکارییە درەختییەکاندا لە شوێنی فرەیزی ناوی، فرەیزی دەرخەری بەکار دەهێنین.

(٢٩) شیلان عومەر (٢٠١٢) پەیوەندیی سینتاکس و سیمانتیك لە ڕێزمانی کوردیدا، چاپخانەی کارۆ، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، سلێمانی، ل:٤٥.

(٣٠) سەڵاح حەوێز ڕەسول (٢٠١٣) پرەنسیپی ئابووریکردن لە زمانی کوردیدا، لە ڕوانگەی تیۆری دەسەڵات و بەستنەوە و بچووکترین پرۆگرامدا، نامەی دکتۆرا، فەکەڵتی پەروەردە، زانکۆی کۆیە،ل: ٢٨.

( 31) (Waria, O. A.(2011) Aspects of the verbal construction in Kurdish, London University, Second Edition , Kurdish Academy publishing series No. :(114),p38.

(٣٢) پرۆی بچووك ئەو جێناوە لكاوە گریمانكراوەیە، لەجیاتی شوێنی ئەو بكەرە دێت، كە لە ڕستەدا نەهاتووە. جیفری بوول(٢٠٠٩) النظریة النحویة، ت: مرتضی جواد باقر، الطبعة الاولی، بیروت، ص: ٦٣٨.

(٣٣) (سەباح ڕەشید قادر، ٢٠٠٩: ٥٠)

(٣٤) عەبدولجەبار مستەفا مەعرووف (٢٠١٠) دروستەی فرێز لە زمانی كوردیدا، لە بڵاوكراوەكانی كوردۆلۆجی، سلێمانی.،ل: ١٩.

(٣٥) كوردستان موكریانی (١٩٨٠) جۆرەكانی جێناو و دەوریان لە ڕستەی كوردیدا لە دیالێكتی كرمانجی خواروو و كرمانجی ژووروودا، گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی حەوتەم. بەغدا، ل: ٢٥٣ .

(٣٦) ساجیدە عەبدوڵڵا (٢٠١٣) هەندێ لایەنی ڕستەسازی زمانی كوردی، لە بڵاوكراوەكانی ئەكادیمیای كوردی. چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ل: ٢٣ .

(٣٧) یوسف شەریف سەعید (١٩٩٨) كاری لێكدراو لە كوردی و فارسیدا، نامەی دكتۆرا، كۆلیجی ئاداب، زانكۆی سەلاّحەدین، هەولێر، ل: ٢٨.

(٣٨) چەمكی ئەنافۆر بەپێی ڕێزمانی بەرهەمهێنان و گوێزانەوە، تیۆری دەسەلاّت و بەستنەوە، جۆرێكە لە فرەیزی ناوی. تارا محسن قادر (٢٠٠٤) جێناو: لێكدانەوەیەكی نوێ لە زمانی كوردیدا (بە كەرەستەی دیالێكتی خواروو)، نامەی ماستەر، كۆلێژی زمان، زانكۆی سلێمانی، ل: ٣٨.

(٣٩) كاری (بوون) بە كاری ناتەواو ناودەبرێت، مەبەست لە كاری ناتەواویش ئەو كارەیە، كە بە یاریدەی كەرەسەی تر دەتوانێت هەواڵێك یان سیفەتێك بداتە پاڵ بكەرەكەی.(ئومێد بەرزان برزۆ: ٢٠١٠: ٨٥)

(٤٠) سەلاّح حەوێز ڕەسول (٢٠٠٦) ڕستەسازی و واتاسازیی (بوون)، نامەی ماستەر، كۆلێژی پەروەردە، زانكۆی كۆیە، ل: ٣ .

(٤١) حاتەم ولیا محەمەد (٢٠٠٠) فرێزی ناوی و فرێزی كاری لە كرمانجی ژووروودا، نامەی ماستەر، كۆلێژی زمان، زانكۆی سلێمانی، ل: ٨٩.

(٤٢) عومەر ئەحمەد عەبدولڕەحمان (٢٠٠٩) فرەیزی بەند لە زمانی كوردیدا، نامەی ماستەر، كۆلێژی زمان، زانكۆی سەلاّحەدین، هەولێر، ل: ٧٣.

(٤٣) ئازاد ئـەمین فـەرەج باخـەوان (٢٠٠٣) پێشـبەند و پاشـبەند لـە هـەردوو دیـالێکتی کرمانجی خواروو و ژووروی زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێجی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)، زانکۆی بەغدا، ل: ٨٠ .

(٤٤) ئـازاد ئەحمـەد حسـێن (٢٠١٠) ئـەرکی ئـەدڤێربل لـە فرەوانکردنـی فرێـزی کاریـدا، گۆڤاری کوردۆلۆجی، ژ (٣)، سلێمانی، ل: ٢٠٦ .

(٤٥) فرەیزی ئەدڤێربلی بە واتای فرەیزی ئاوەڵگوزارەیی و فرەیزی ئاوەڵکاری دێت.

(٤٦) (ئازاد ئەحمەد حسێن، ٢٠١٠: ٢٠٦)

(٤٧) (ئومێد بەرزان برزۆ، ٢٠١٠: ٥٧)

(٤٨) (ئازاد ئەحمەد حسێن، ٢٠١٠: ٢٣١)

(٤٩) زاراوەی ڕستەی ئاوێتە، ڕستەی تێکەڵ بـۆ بـەکاردەهێنرێت. ئـەورەحمانی حـاجی مـارف (٢٠٠٤) فەرهـەنگی زاراوەی زمانناسـی، کـوردی – عـەرەبی – ئینگلیـزی، سلێمانی، ل: ١٧٦.

(٥٠) کوردستان موکریانی (١٩٨٦) سینتاکسـی ڕسـتەی سـادە لـە زمـانی کوردیـدا، دار الحرية للطباعة، ل: ٧٦.

(51) Haegeman, Liliane (1994) introduction to Government and Binding Theory, Second Edition, Blackwell Publishing: p146.

(٥٢) (سەلاح حەوێز ڕەسوڵ، ٢٠١٣: ٢٩)

(٥٣) (سەلاح حەوێز ڕەسوڵ، ٢٠٠٦: ٨٠)

(٥٤) کوردسـتان موکریـانی (٢٠٠٤) سینتاکسـی ڕسـتەی تێکـەڵ، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر: ١٦ .

(٥٥) عەبدوڵلا حوسێن ڕەسـول (٢٠٠٦) پوختەیـەکی وردی ڕستەسـازی زمـانی کـوردی، چاپ کتێبفرۆشی سۆران، چاپی دووەم، هەولێر،ل: ٤٠.

(٥٦) (کوردستان موکریانی، ١٩٨٦: ٧٨)

(٥٧) ڕەفیق محەمەد محێدین شوانی (٢٠٠٣) ئامرازی بەستنەوە لە زمـانی کوردیـدا، لـە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ل: ١٠٥ .

(٥٨) (عەبدوڵلا حوسێن ڕەسوول، ٢٠٠٦: ٤٢)

(٥٩) (هەمان سەرچاوە)

(٦٠) (کوردستان موکریانی، ١٩٨٦: ٨٧)

(٦١) (عەبدوڵلا حوسێن ڕەسوول، ٢٠٠٦: ٤٢)

(٦٢) (ڕەفیق شوانی، ٢٠٠٣: ١١٠)

(٦٣) شلێر ڕەسول محەمەد بەرزنجی (٢٠٠٤) یاساکانی داڕشتنی لاڕستەی دیارخەری لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلیجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ل: ٣٨_ ٣٩ .

(٦٤) (جیفری بوول، ٢٠٠٩: ١٦٣)

(٦٥) ڕستەی لێکدراو بە چەند جۆرێك پۆلێن دەکرێت، لەوانە: بەپێی مەبەست و واتا، بەپێی ئامرازە لێکدەرەکان، بەپێی کات، بەپێی ئامرازە لێکدەرەکان و دەمە کاتەکان.(ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی: ٢٠١٣: ٤١)

(٦٦) (عەبدوللا حوسێن ڕەسوول، ٢٠٠٦: ٣٢)

(٦٧) هەروەها (ڕستەی لێکدراوی پێوەست/ ڕستەی لێکدراوی هاوسەنگ)یشی پێدەگوترێت.

(٦٨) (عەبدوللا حوسێن ڕەسوول، ٢٠٠٦: ٣٢)

(٦٩) (کوردستان موکریانی، ١٩٨٦: ٧٤)

(٧٠) (ڕەفیق شوانی،٢٠٠٣: ٩٦)

(٧١) عەبدولجەبار مستەفا مەعرووف (٢٠٠٩) دروستەی ڕستەی ئاڵۆز لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی، ل: ٨٢ .

(٧٢) (عەبدوللا حوسێن ڕەسوول، ٢٠٠٦: ٣٤)

## ملخص البحث

هذا البحث يهدف الوقوف على الكلمة الوظيفية واشكالها باعتبارها صنفا مستقلا، ثم وفق النحو التوليدي يدخل على التحليل والتحديد في المستوى النحوي.

يتكون هيكل البحث من مقدمة وفصل واحد، تبين المقدمة سبب اختيار العنوان وهدفه ومادته وحدود الدراسة ومنهجها.

عنوان هذا البحث هو (الكلمات الوظيفية في ضوء النحو) وفيه حديث عن التكوين النحوي للجملة الثابتة والجملة المتحولة، والعلاقة الافقية والعمودية في الكلمات الوظيفية، بالاضافة الى عمل العبارة الاسمية، الجارة، الظرف في الجملة البسيطة الكوردية، سواء جاءت استخدام هذه العبارات بصورة رئيسة او ثانوية من خلال عدد من الامثلة المتنوعة، كما يبدو من خلال رسم المخطط الشجري الذي يبدو فيه التحليل جلياً ، فضلا عن تحليل عمل الكلمات الرابطة في الجملة المعقدة والمركبة، واختتمت الدراسة بعرض النتائج وثبت بقائمة المصادر والمراجع.

## Abstract

The present study aims at dealing with the function word and its forms as an independent class of words, after that it deals with the analysis and identification according to generative grammar at the level of syntax.

The papers starts with an introduction that includes , the problem, the aims , the material , the scope and the methodology of the study.

The topic of this section is entitled "Function Words in the light of Syntax", it deals with the syntactic components of dependent and independent sentences, and the vertical and horizontal relationship in function words, furthermore, the function of noun phrase, preposition, Adverb in simple sentences of the Kurdish language according to the functions that are seen as main or secondary components have been stated in different examples. They have been analyzed in according to the generative grammar in tree diagrams, after that, the function of linking words in complex sentence and clauses have been stated in different examples according to the types of the sentences that make, and have been analyzed in tree diagrams in the same way.

The papers end with the concluding points along with the list of references.

# بەراوردی نێوان زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا

## ( ئاستی فۆنۆلۆجی ) بە نموونە

م. پەیمان حەسەن محەممەد سەلیم

زانکۆی سەلاحەددین/ کۆلیژی پەروەردەی بنەڕەتی

### پێشەکی

زانایـان بـەهۆی دۆزینـەوەی ڕەگێکـی هاوبـەش لـەنێوان هـەموو زمانـەکان توانیویانە خێزانە زمانییەکانی پێ پۆلێن بکەن ، لەژێر چەند بنەماڵەیەکی جیاجیا دیاری بکەن .

ئەگەر چۆمسکی تـوانیبێتی هـەموو زمانـە جیاوازەکـانی جیهـان لـە ڕێزمـانی گشتی کۆبکاتەوە و شیانبکاتەوە، کە بووە بە پەیڕەوێکی زمانەوانیی گرنگ لە ناو هەموو زمانەکان لە قوتابخانـە زمانەوانییـەکانی ئـەمریکا و بـەریتانیا تـاکو ئێسـتا بنەمایەکە بۆ لێکدانەوەی زمان.

ئەی بۆچی؟ چۆن؟ لەناو یەك زماندا شێوەزارەکان بەهۆی هاوبەشی، نزیـك ناکرێنەوە بۆ زمانێکی هاوبەش و ستانداردا بنیات بنرێت. هەموو شێوەزارەکان لـە هەر شوێنێك لـە قسـەکەرانی زمـانی کـوردی بـە هـۆی زمـانی نەتـەوە یـان زمـانی ستانداری نیشتمانی کۆدەکرێنەوە.

ئـەم باسـە لـە پێشـەکی و دوو بـەش پێکهـاتووە لـە بەشـی یەکـەم چـەند هـەنگاوێك بـۆ زمـانی سـتانداری کـوردی پێشـنیاز کـراوە، کـە ئـەزموونی چـەند زمانەوانێك لە زمانـەکانی جیهـانی پـەیڕەو کـراوە، لێکۆڵینـەوە لەسـەر زمانـەکان کراون و بووینە بە یاسا و تیۆری زمانەوانی. لە بەشی دووەم شـێوەزاری مـزووری باڵا وەرگیراوە لە کرمانجی سەروو بەراورد کراوە لەگـەڵ زمـانی نووسـین، سـەرەتا چەند زانیارییەك لەسەر شێوەزاری مـزووری بـاڵا لەپاشـان هـەردوو شـێوەزارەکان بەراورد کراون تاکو هاوبەشی و جیاوازیی نێوان هەردووکیان دیاری بکرێت و بەرەو نزیکی ببرێت بۆ زمانی ستاندارد.

## بەشی یەکەم
## چەند هەنگاوێك بۆ زمانی ستاندارد

لێرەدا تیۆری چەند زمانەوانێك دەستنیشان دەکەین، کە هەموویان ئەزموونی زمانە دیارەکانی جیهانن، بۆ دروستبوونی زمانی ستاندارد و پێوانەیی ، ئەمەش بەهۆی نزیککردنەوەی شێوەزارەکان بووە ، ئەمانەن:

**یەکەم/ زمانەوانیی کۆمەڵایەتی:**

زانستی کۆمەڵایەتی لە میانەی ئەو یاسایانەی کە هەیەتی جەخت لە ئەوە دەکاتەوە، کە زمانی جیاواز لەهەموو کاتێکدا هەبووە (کولنج، ١٩٩٩:٤٨٩). ئەم زانستە لە کۆتایی شەستەکان و حەفتاکان لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گرنگی پێدراوە، کە بە شێوەیەکی مەیدانی لە هەموو جیهاندا زانیارییان لەسەر زمانی کۆمەڵانی خەڵك کۆ دەکردەوە، ئەنجامی ئەم پرۆژانە گرنگیی خۆی هەبوو بۆ ئەوەی یاساکانی فێرکردن بەرەو باشتر و گشتگیری ببەن لە ئەوەی کە هەیە، هەروەها تیۆر و یاسا لەسەر ئەنجامەکان بنیات دەنران (هدسن، ١٩٨٧:١٨)

شێوەزارەکان و چینەکانی کۆمەڵگا بەهۆی گۆڕان و جیاوازی فۆنیمی دیار دەبێت، هەروەکو لابۆف دەڵێت: "بەکارهێنانی جیاوازی فۆنیمەکان لەناو یەك زمان ناسنامەی قسەکەر دیار دەبێت سەر بە چ شێوەزارێکە" لێرەدا بەهۆی جیاوازی ئەم فۆنیمانە، هاوبەشی و جیاوازی لەناو زمانەکەدا دیار دەبێت، هەروەها زمانی ستاندارد یان یەکبوونی زمان (الوحدة الغوية) دابەشی سەر کۆمەڵگا دەکرێت، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا شتێکی ناوێزە و جۆری لێ دروست دەبێت، واتە هەوڵ دەدرێت کە هەموو کۆمەڵگا بەبێ ئاستەنگ بە یەك زمانی پێوانەیی و ستاندارد بدوێن (هەمان سەرچاوەی پێشوو). لە قسەکانی یەکتری تێبگەن، هەموو کۆمەڵگا هەست بە ئەوە دەکات کە یەك زمانی هەیە، چونکە زمان هاوبەشە لەنێوان هەموویاندا بەمەش زمانی نەتەوە و یەك نیشتمانی دروست دەبێت هەتا ئەگەر هەرێمەکانی ئەو نیشتمانە لەیەك دووربن، ئەمەش لە ڕەگێکی هاوبەش دروست دەبێت .

هەروەکو چۆن لە زمانی ئینگلیزی بەریتانی و ئینگلیزی ئەمریکی، ئینگلیزی لەندەنی هەموویان یەك دابەشکردنی هاوبەشی هەیە، هەرچەند لە هەرێمەکان لەیەکتری دوورن، بەڵام لەیەکتری تێدەگەن، چونکە یەك جۆرە دابەشبوونی زمانیان هەیە (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ٥٠)

هەروەکو لە تیۆرەکانی دواتر باس دەکرێت، بەشی پراکتیکی ئەم جیاوازی و هاوبەشی شێوەزاری و چینەکانی کۆمەڵگا بە هۆی فۆنیمەکان دیاردەبێت لە دوا بەشی ئەم باسە.

**دووەم/ ولیام لابۆف:**

یەکەم زانا بوو کە جیاوازی نێوان شێوەزارەکانی دیارکرد، گوتی: جیاوازی نێوان شێوەزارەکان جیایە لە جیاوازی نێوان دوو زمان (هدسن ،١٩٨٧: ٢٠) هەروەها ڕێژەی بۆ جیاوازی ئەم شێوەزارانە دانا وە بە ناوی (زمانەوانی کۆمەڵایەتی چەندایەتی)یە ( علم اللغة الاجتماعي الكمي) ئەم تیۆرە "گرنگی بە گۆڕانی فۆنیم دەدات لە کۆمەڵگادا" (هەمان سەرچاوەی پێشوو) هەروەها هەرەمێکی دانا کە زمانی گشتی لە ناوەڕاستی هەرەمەکە دەست پێدەکات، وتی: دەکرێت زمانی ستاندارد لە زمانی عامەی خەڵك واتە زمانی گشتی دروست بکرێت، چونکە زمانی گشتی زیاتر نزیکە لە شێوەی پێوانەی هەموو شێوەزارەکان تاکو ڕەگی هاوبەش بدۆزینەوە لە ناو هەموو شێوەزارەکاندا (کولنج ،١٩٩٩: ٤٩٠)

**سێیەم/ ئودلف نورین** (١٨٥٤ – ١٩٢٥):

زمانەوانێکی دانیمارکییە، لە شیکردنەوەی بۆ ( زمانی پێوانەیی – ستاندارد Standard language ) دەڵێت :" زمانی پێوانەیی یان زمانی ستاندارد لە زمانی هاوبەش دروست دەبێت لەگەڵ هەبوونی جیاوازیی شێوەزار، بەڵام دەبێت هەرتاکێك لەم شێوەزارە جیاوازانە ڕەگێکی هاوبەش هەبێت، ئەگەر ئەم ڕەگە هاوبەشە نەدۆزرێتەوە بۆ زمانی پێوانەیی (ستاندارد) ئەمە ئەگەری ئەوە هەیە ببێت بە زمانی جیا جیا هەر وەکو زمانی گریکی، فرنسی، ئەڵمانی و ئینگلیزی کە ئەمانە لەبنجینەدا یەك زمان بووینە، بەڵام لە زاری جیا جیا بووینەوە بەهۆکاری جوگرافی و گۆڕانی مێژووی بەرەو زمانی جیا ڕۆیشتوون (جون جوزیف ، ٢٠٠٧: ٨١)

زمانی کوردیش دەتوانرێت بەرەو پێش ببرێت بۆ زمانی پێوانەیی وەکو ئەوروپا، شارستانیەتی هیچ نەتەوەیەك لە شارستانیەتی نەتەوەیی تر کەمتر نییە. دەتوانرێت بە زمانی زارەکان و لێکسیك دروست بکرێت و کاری لەسەر بکرێت لەگەڵ لێکسیکی زارەکانی تر بەراورد بکرێت، بەمە پەیوەندیی نێوان ناسنامەی زمان و ناسنامەی سیاسەت بکرێن بەیەك، "لە ئەوروپا سیاسەت و جوگرافیا جیا بوون" (هاریس، تیلر، ٢٠٠٤:١٤٥) بەڵام لە زمانی کوردی یەك بەڕێوەبردن و یەك جوگرافیا هەیە دەکرێت لەیەك نزیك بکرێنەوە وەکو ئەوروپا نییە، چونکە ئەوان لە ڕووی جوگرافیا و سنوور و بەڕێوەبردن لەیەك دوور بوون (هەمان سەرچاوەی پێشوو).

## چوارەم/ کاکستن :

پێشکەوتنی زمان حاڵەتێکی سروشتنی نییە خۆی پێشبکەوێت، بەڵکو ئامرازێکە مرۆڤ بەکاری دەهێنێت بە وریایی بەمەبەستی پێشکەوتن و بەرەو داهاتوو بۆ زمانی پێوانەیی ، بۆیە دەبێت گونجان و پێوەری بۆ بکرێت تاکو زمانەکە بەرەو ڕێکەوتن و گونجان ببرێت لە هەموو ناوچەکان بەیەکەوە، وەکو ئەوروپا لە سەردەمی ڕێنسانسدا. زمان دەتوانرا گۆڕان و باشتر بکرێت، مرۆڤەکان فێربکرێن لە کۆمەڵ هەوڵ بدات بەرەو پێش ببرێن تاکو سەرکەوتن (هاریس، تیلر، ٢٠٠٤:١٤٥) کەواتە مرۆڤ خۆی دەتوانی گونجاوترین زمان لە ناو هەموو دیالێکتەکان دروست بکات و بژار بکرێت لە کۆمەڵدا، تاکەکانی کۆمەڵ بەرەو زمانی ستاندارد فێر بکرێن و بەرەو پێش ببرێن. واتە ناکرێت زمان خۆی گەشە بکات بۆ دروستبوونی زمانی ستاندارد وەکو هەموو شتەکانی سروشتییەکانی سەر زەمین نییە، بۆ نموونە (ڕووەك) یان گەشەی مرۆڤ خۆی بە قۆناغەکانی خۆی گەشە بکات و پێبگات بەشێوەیەکی خۆرسکی، بەڵکو مرۆڤ خۆی زمان بەکار دەهێنێ دەتوانێ خۆشی گەشەی پێبکات، وەکو زمانی ئینگلیزی کە زیندووترین زمانی جیهانییە لە بەکارهێنان و کاروباری زانستی و بەڕێوەبردنی نێو نەتەوەیی بەڵام بەردەوام کار لەناو زمانەکەدا دەکرێت وشە و زاراوەی نوێ و گونجاو بۆ زمانەکە بەرهەم دەهێنرێت لەلایەن پسپۆڕانی زمانەکە، ئەم نوێگەری و بەرهەمهێنانی زمانە لەلایەن بەکارهێنەرانی زمانەکە بەکار دەهێنرێت، وەکو

قاموسی ئۆکسفۆرد، کە ساڵانە بەشێوەیەکی بەردەوام کاری بۆ دەکرێت بۆ پێشکەوتنی زمانەکە لەلایەن خوێنەرانی بەکاردەهێنێت لەگەڵ ئەوەش زمانێکی جیهانییە، بەهەمان شێوە زمانی کوردی دەبێت کاری بۆ بکرێت تاکو گەشە بکات، هەروەکو تیۆرەکەی کاکستن لە سەرەوە ئاماژەی پێکراوە.

**پێنجەم/ دانتی:**

دروستکردنی زمانی ستاندارد لە زمانی گشتی بەکارهێنەرەکانی .

دانتی وتی "نابێت ئێمە لەبەردەم زمانی لاتینی بوەستین و بە هۆی ئەوەی هیچ شتێك لە گۆڕاندا نییە، بەڵکو زمانیش وەکو داب و نەریت و جلوبەرگ لە گۆڕاندایە لەگەڵ گۆڕانی کات و سەردەم، زمانی لاتینی ناکرێت تەنها ناسنامەیەك بێت نەتوانرێت بگۆڕدرێت لەگەڵ گۆڕانی کات و شوێن، دانتی کتێبێکی تری بە زمانی ئیتالی بەناوی (المأدبة) دانا کە پەخشانە شیعر بوو شیعری کۆنی بە زمانی نوێ ڕاڤە کرد ، کە زمانی گشتیی خەڵك بوو، دانتی چەند ئەنجامێکی بە دەست کەوت (نیقولاس اوستلر: ٢٠١١،٤٥٠ ). لەوانە:

١. زمانی بە شێوەی نوێ داڕشت کە دوور بوو لە لاتینی .

٢. ئەو خەڵکانەی، کە لە لاتینی تێ نەدەگەیشتن فێری زمانەکە بوون .

٣. زمان بەرەو گۆڕان و فێربوون و پێشکەوتن ڕۆیشت.

٤. ئەمە سەرەتایەك بوو بۆ کۆتایی زمانی لاتینی، کە تەنها لاتینی بۆ زانیاری و ڕۆشنبیریی بەرز بە کاردەهات.

٥. لەو کاتەوە زمانێکی تایبەتی نەما بۆ وتار و گوتنی تایبەت .

٦. ئەو لاتینییەی کە خەڵکی هەستیان پێدەکرد باڵایە لە هەمان کاتدا زانییان کە زمانێکی دروستکراوە، کەواتە لە کێبڕکێی بەردەوام بوون، هەتا نووسینەکان بەبێ زمانی لاتینی پەیدا بوون زمانی لاتینی قۆناغەکەی تەواو بوو. (هەمان سەرچاوەی پێشوو) هەروەها ماکس موللر دەڵێت "زمانی ئەدەبی پێوانەیی (کلاسیك) لە سەدەی نۆزدەهەم زمانێکی ئەدەبی دروستکراوە، زمانی ڕاست و سروشتی لەناو شێوەزارەکانە، بۆیە ناکرێت بەهۆی زمانی ئەدەب بچین بۆ (سروشتی زمان، دەستوور و ڕەگی زمان) " (کولنج، ٤٨٩:١٩٩٩)

زمانی کوردیش لـە ئەدەبـدا بەهـەمان قۆناغـدا ڕۆیشـتووە کـە تـەنها ڕێبـاز و پەیڕەوەکانی کلاسیك دەشیان بۆ نووسین، بـەڵام لەدواییـدا لەگـەڵ بەسەرچـوونی کات قۆناغەکە بەرەو کۆتایی چوو.

له زمانیشدا دەکرێت لەڕێگای چاپ و ئەدەب و ڕاگەیانـدن زیـاتر گرنگـی بـە زمانی گشتی و شێوەزارەکان بدرێت باشترینیان بژار بکرێـت، هـەموو ئـاخێوەرانی کوردی تێیبگات و بەکاری بهێنێت له کاری فێرکردن و فەرمی بەکار ببرێت.

**شەشەم / تیۆری تیم وۆرك:**

کۆمەڵگا هاوبەش دەبێت بە ئایدۆلۆجیایی زمان

ئەو خەڵکانەی، کە بەبێ بوونی ڕێکەوتنی فەرمی ڕێك دەکـەون، تۆڕێك پێك دەهێنن ئەمانـە زیـاتر خـاوەنی توانـای گشـتین لـە بـەکارهێنان، هـەروەها کـەمتر ڕەگـەزی چـین و تـیرەی تێدایـە لـە بـەکارهێنانی زمانـدا، زیـاتر بـەزمانی گشـتی دەدوێن، بۆیە زیاتر زمانی پێوانەیی و ستاندارد له زمانی ئەمانـدا بـەدی دەکرێـت، ئەگەر ئەم تۆڕە داخراو بێت کەمتر پێوانەیی تێدایە کـەمتر دەتوانرێـت جۆرەکـانی زمانی گشتی تێـدا بدۆزرێتـەوە (جـۆن جۆزیـف: ٢٠٠٧،٩٨) لابـۆف هـەرەمێکی بـۆ زمـانی کۆمـەڵگا دانـاوە، کـە لـە بـەرزترین چـینی کۆمـەڵگا دەسـت پێـدەکات. هـەموویان لـە بنچـینە بەکارهاتووەکانـدا هاوبەشـن، هـەموویان گونجانیـان لـە بەکارهێنانی هاوبـەش و پێوانـەیی لـە زمانـدا بـە شـێوەی زنجیرەیـی هـەرەمی لـە کۆمەڵگادا، بەپێی ئەم تیۆرە دەبێـت تـۆڕێکی کـراو و فـراوان لـە نێـوان چـینەکان دروست بکرێـت تـاکو زمـان بـەرەو زمـانی نەتـەوەیی بچێت لـەناو هـەموو چـین و تیرەکانی بۆ دامەزراندنی زمانی پێوانەیی. کەواتە دەکرێـت لـە زمـانی کوردیـدا بـە تیم وۆرك کـار بکرێـت تـاکو هـەموو زارەکـان لەیـەك نزیـك بکرێنـەوە تـاکو زمـانی ستاندارد دروست بکرێن.

## بەشی دووەم

## جیاوازی و هاوبەشی زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا

لە شێوەزاری مزووری باڵادا، بەهۆی هەبوونی چەند جیاوازییەکی فۆنیمی بە بەراوردکردنی لەگەڵ زمانی نووسیندا دەتوانرێت بەرەو نزیکی و هاوبەشی هەنگاو بنرێت. شێوەزاری مزووری باڵا لەم ناوچانە پێك دێت ( ئەرگوش، شیوێ، موکا، سێلکێ، باسیڤا، تێلێ، بناوێ، هیزان، داویتکا، ئەودێر، پالآنە، گویزێ، بەنان ، ستێپ، بازێ، سلور، سومێ، بوسێ، گەلالنە، باب سیڤا ... هتد)

شێوەزاری مزووری باڵا: یەکێکە لە شێوەزارەکانی دیالێکتی سەروو لە کۆندا بەم دیالێکتە شاکاری ئەدەبی پێی نووسراوەتەوە، کە شوێنێکی بەرزی لە ئەدەبی زمانی کوردی هەبووە دیارترینیان (مەم و زینی ئەحمەدی خانێ)یە ئەم شێوەزارە بەراورد دەکرێت لەگەڵ زمانی نووسین کە لە سەردەمی (عەبدورەحمان پاشای بابان) لە ساڵی ١٧٨٩ بوو بەزمانی فەرمیی خوێندن و نووسین، لەو کاتەوە پاشای بابان فەرمانی دەرکرد دەبێت (عەلی بەردەشان) بە زاری سلێمانی شیعرەکان بنووسێ لەو کاتەوە بوو بە زمانی فەرمی و خوێندن و نووسین، تاکو ئێستا بەردەوامە (کینبرواك، ئالیسۆن، ٢٠٠٨:٣٥) ئەو شێوەزارانەی، کە کۆنن زیاتر دەسەڵاتدارن لەناو زماندا، دەکرێت بونیاتێك بن بۆ ڕابردوو و داهاتووی زمان (کولنج، ١٩٩٩:٤٨٩)

### شوێنی جوگرافیایی زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا

زمانی نووسین کە لە زاری کوردی سلێمانییەوە نزیکە، سەر بە دیالێکتی ناوەڕاستە، پارێزگای سلێمانی و هەولێر و کەرکوك بەم شێوەزارە قسە دەکەن لە باشووری کوردستان، هەروەها شێوەزاری مزووری باڵا سەر بەدیالێکتی سەرووە، کە ئاخێوەرانی سەر بە پارێزگای دهۆك و هەولێرن کە هەموو گوند و ناوچەکانی سەر بە قەزای مێرگەسوور دەگرێتەوە، مزووری دابەشی سەر دوو بەش دەبێت (هنری فیلد، ٢٠٠٠:٣٤)

١. مزووری باڵا سەر بە پارێزگای هەولێر

٢. مزووری ژێری سەر بە پارێزگای دهۆك

کەواتە شێوەزاری مزووری بالاَ لەڕووی زمانەوە سەر بە کرمانجی سەرووە لەڕووی جوگرافییەوە سەر بە پارێزگای هەولێرە، بۆیە زۆر نزیکایەتی و لێکچوون و هاوبەشی لەنێوان هەردوو دیالێکتی خواروو و سەروودا هەیە لەم شێوەزارەدا.

## فۆنۆلۆجی شێوەزاری مزووری بالاَ

فۆنۆلۆجی بەگشتی دوو ئەرکی هەیە:

١. فۆنیمەکان لە دەنگەکان دەستنیشان دەکات، (وریا ئەمین: ٣٥٨، ٢٠٠٤) ژمارەی فۆنیمەکانی ئەم شێوەزارە هەمان فۆنیمی زمانی نووسینە لە جۆر و ژمارە کە (٣٦) فۆنیمە، تەنها فۆنیمی (ط) زیاتر کە دەکاتە (٣٧) فۆنیم کە ئەمانەن :(ا، ب، پ، ج، چ،ح، د،ت، خ، ع، غ، س، ش، ز ،ژ، ل، ڵ، ھ ،ر ،ڕ ف، ڤ ، ق، ك، گ، م، ن، ۆ، وو، و، ا ،ە ،ی، ێ، i)+ ط) دەکاتە (٣٧) فۆنیم.

٢. لە ئەنجامی لێکدانی فۆنیمەکان لە بڕگەی فۆنۆلۆجی زماندا فۆنیم هەیە دەسوێت یان دەگۆڕێت یان فۆنیمی تازە پەیدا دەبێت (هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٥٣) ئەمە لە زماندا بەهۆکاری زمانییە، بەپێی یاسای بڕگە دەبێت، کە ناکرێت لەیاسای بڕگە لابدات کە CCVCC بەلاَم هەندێ جار ئەم گۆڕانانە لەناو وشەکانی زماندا دەبێت کە بەهۆکاری نازمانییە، واتە لەبەر یاسای بڕگە نییە، بەڵکو بەهۆی شێوەزارەوەیە، بۆنموونە

١. سوانی /د/ لە وشەی (کردن ______ کرن) بەهۆی شێوەزارە ئەم سوانە

بەلاَم سوانی/ە/ لە (ەکە) لە مۆرفیمی (ەکە +ان ____ ەکان) بەهۆی یاسایی بڕگەیە کە ناکرێت (ە+ا) لەدوای یەکتری بێن لە یاسایی بڕگەدا چونکە هەردووکیان بزوێنن .

٢. گۆران: گۆرانیش بە هەمان شێوەیە گۆرانی /ۆ/___ /وو/ لە وشەی (ڕۆژ ___ ڕووژ) بەهۆی شێوەزارییە، بەلاَم لە وشەی (دەشوات) کە بە هۆکاری زمانییە، لە گۆرانی /ۆ/ ___ /وو/ کە نابێت دوو بزوێن لە تەنیشت یەك بێن بۆیە فۆنیمەکان دەگۆڕێن .

٣. زیادکردن: هەندێ جار هەندێ فۆنیم لە شێوەزارێك لە وشەیەکدا زیاد دەبن وەکو زیادبوونی/ ر/ لە وشەی (ئارمانج ) کە لە زمانی نووسیندا (ئامانج)ە.

بەڵام لە هەندێ وشەدا هەندێ فۆنیم زیاد دەبن کە بەهۆکاری فۆنۆلۆجییە وەکو ئەلۆمۆرفەکان .

کەواتە هەر گۆڕانێك کە بەسەر وشەیەکدا دێت ئەگەر هۆکاری فۆنۆلۆجی نەبوو، هەروەها واتای وشەکەی نەگۆڕی بۆ بەرهەمهێنانی وشەی نوێ. ئەوە هۆکاری نازمانییە کە شێوەزارییە، ئینجا ئەم گۆڕانە (سوان، گۆڕان، لێکدان، ئاڵوگۆڕکردن)ی فۆنیم بێت ، بۆ نموونە:

- گەر _ گەش ____ گۆڕانی یەك فۆنیم /ر/ بە/ش/ بەهۆی ڕێزمانی بەرهەمهێنان وشەی نوێی بەرهەم هێناوە، دەبن بە وشەی سەربەخۆ لە زماندا.

- کاڵ _ کال _____ گۆڕانی یەك فۆنیمی/ڵ/ بە /ل/ دەبێتە هۆی دروست شێوەزاری نوێ چونکە هیچ کاریگەری لەسەر واتا نەکردووە بۆ دروستبوونی وشەی نوێ، دەبنە ئەلۆفۆنی یەکتری .

- ئەو گۆڕانانەی کە پەیوەندی بە یاسایی فۆنۆلۆجییەوە هەیە ئەمانە دەبنە ئەلۆمۆرفی یەکتری .

کەواتە هەر وشەیەك هەر گۆڕانێکی هەبێت (سوان، گۆڕان، ئاڵوگۆڕکردن، زیادکردن) ئەگەر مانای نەگۆڕی و ئەلۆمۆرف نەبوو ئەوا شێوەزاری سەر بەیەك زمانە لە هەموو فۆنیمەکان هاوبەشن تەنها لە یەك فۆنیم جیاوازە ئەم جیاوازی فۆنیمەیە کە شێوەزار دروست دەکات . لە بەشی دووەم بە ڕوونی دیار دەبێت کە ئەم گۆڕانانە دەبن بە هێڵی جیاوازیی نێوان زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا، گۆڕانی تەنها یەك فۆنیم جیاوازییەکەیە، فۆنیمەکانی تریش هاوبەشییە لەنێوان هەردووکیاندا.

ئەو گۆڕانە فۆنیمانەی کە لەناو زمانێکدا هەن، هەر یەکێك لەم جۆرە گۆڕانانە چینێك یان شێوەزارێك دروست دەکات لە کۆمەڵگادا، کە تاك بەکاری دەهێنێت، لێرەدا هەندێکیان دیاری دەکرێن تاکو گۆڕان و جیاوازییەکان لەنێوان ((زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا)) دیاری بکرێت لە ڕێگای تیۆرەکان بەرەو نزیککردنەوە و زمانی پێوانەیی ستاندارد بەهەنگاو ببرێت بە تیۆری ( تیم وۆرك و نورین و کاستن و دانتی) بکرێن بە هێڵی کارکردن بۆ زمانەکە.

یاسا فۆنیمییەکان ئەمانەن:

١. سوانی فـۆنیم ،٢. گـۆڕانی فـۆنیم ،٣. لێکـدانی فـۆنیم، ٤. ئـاڵوگۆڕکردنی فۆنیم

**یەکەم / سوانی فۆنیمەکان:**

ئەم کردارە لە چوارچێوەی وشەدا فۆنیمێك دەسوێت، بـەبێ ئـەوەی کـار لـە واتای وشەکە بکـات، ئەمـەش بـەهۆکاری نازمـانی دەبێت، کـە شـێوەزار و چـینی زمانی قسـەکەر نیشـان دەدات. ئـەم سـوانە لـە هـەموو زمـان و دیالێکتـەکان ئـەم دیاردەیە هەیە کە شێوەزارێك لە یەکێکی ترجیا دەکرێتەوە وەکو کـەوتنی (h) لـە ئینگلیزی بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشـکرا بـووە، هەرچـەندە مانـەوە یـان زیـادکردن شتێکی لەخۆوەیە لە زماندا ئەم جیاوازی بەکارهێنانی فۆنیمە بەپێی شوێن و کـات دەگۆڕێـت بـۆ نموونـە لـە فـۆنیمی (r) لـە باشـووری بـەریتانیا نییـە، ئەمـەش سـیمایەکی پێـوانی گەورەیـە ، هـەروەها شـتێکی زۆر خۆشەویسـتە لـە کۆمـەڵگا، لەگەڵ ئەمەش لە ئەمریکا بەهاکەی تـەواو پێچـەوانەیە (r) بـەکاردێت نـەبوونی لـە شاری نیویۆرك شتێکی باش نییـە (کـولنج، ١٩٩٩:٤٩٥) ئـەم دیاردەیـە لـە هـەموو زمانەکاندا هەیە وەکو لەشێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵادا، زۆر فـۆنیم دەسـوێن کـە لـە زمـانی نووسـیندا وا نییـە ئـەم گۆڕانانـە زیـاتر ئارەزوومەندانەیـە، وەکـو ئـەم نموونانەی خوارەوە:

١. سـوانی /د/: لـە زۆربـەی چـاوگە (دالییـەکان)دا دەسـوێت، هـەموو ئـەو وشانەی کە بەم فۆنیمە کۆتاییان دێت.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
| --- | --- |
| کردن | کرن |
| ئارد | ئار |
| گرد | گر |
| بردن | برن |

٢. سوانی/ب/ ئەمەش لەم کارانەی کە لە دوو بەش پێك دێت لە کاری فەرماندانداا

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| دابنیشە | دانیشە |
| جوان بکە | جوانکە |
| باش بکە | باش کە |
| هەڵبگرە | هەلگرە (دوای گۆڕانی /ڵ/بۆ/ل/) |
| تێ بکە | تێکە |
| ببەوە | بەوە |

٣. سوانی/و /: لەم وشانەی کە /و/ەکە /ا/ بەدوادا دێت /و/ دەسوێ وەك .

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| جوان | جان |
| خواستن | خاستن |
| خواردن | خارن |
| جوامێر | جامێر |
| چوار | چار |
| خوار | خار |

٤. سوانی /ت/

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| دەست ماڵ | دەسماڵ |
| دەست گر | دەسگر |
| حەوت سەد | حەفسەد (دوای گۆڕانی /و/بۆ/ف/) |
| هەشت سەد | هەشسەد |

٥. سوانی /و/ لە /وێ/ ئەم وشانەی کە /و/ەکە /ێ/بەدوادا دێت /و/ دەسوێ، وەك:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| خوێ | خێ |
| سوێر | سیر (لەگەڵ گۆڕانی /ێ/ بۆ /ی/) |
| نوێ | نی (گۆڕانی /ێ/ بۆ /ی/) |
| گوێز | گیز (گۆڕانی /ێ/ بۆ /ی/) |

٦. سوانی/ە/

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| ئەشکەوت | شکەوت |
| ئەستوور | ستیر/ لەگەڵ گۆڕانی (وو_بۆ_ی) |
| پانکە | پانك |
| حەوشە | حەوش |
| چیلکە | چیلك |

٧. سوانی /ن/:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| پانزدە | پازدە |
| شانزدە | شازدە |
| دوانزدە | دازدە / لەگەڵ سوانی /و/ |
| یانزدە | یازدە |

٨. سوانی/ ر/:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| دوو جار | دووجا |
| ئەگەر | ئەگە |
| پارشیو | پاشیو |
| پرسیار | پسیار |
| گەلەك جار | گەلەك جا |

**دووەم / گۆڕانی فۆنیم:**

گۆڕانی فۆنیمێك یان زیاتر بە فۆنیمێکی تر لە سنووری وشەیەکدا بەبێ ئەوەی واتای وشەکە بگۆڕێ،" لەکاتی دیاریکردنی گۆڕاوەکان هەر گۆڕانێك جێنشینێکی گۆڕاوی بۆ دیار دەکرێت لە زماندا، لەو کاتەدا چەندایەتی جۆری زمانەکە دیار دەبێت (کولنج، ١٩٩٩:٤٩٤) ئەم گۆڕانە لەلایەن زمانەوانانی کۆمەڵایەتی دراسەی کراوە، کە شێوەی وشەیەك دەگۆڕێت بەڵآم مانای وشەکە لە کۆمەڵگادا ناگۆڕێت (هدسن، ١٩٨٧:٢٦٢) هەروەکو ئەم نموونانەی خوارەوە:

١./ڵ/– /ل/

| شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵآ | زمانی نووسین |
|---|---|
| گول | گوڵ |
| قەلەو | قەڵەو |
| هەولدان | هەوڵدان |
| هەڵکەوتن | هەڵکەوتن |

فۆنیمی لە زۆربەی زمانەکان بەپێی دیالێکت و شێوەزار دەگۆڕێت دەبێت بە سیما ئەم شێوەزارە کە گۆڕانەکەی هەیە بۆ نموونە، فۆنیمی /L/ لە زمانی ئینگلیزیش لە هەندی شوێن لە هەرێم و کۆمەڵگای بەریتانی جیاواز دەردەبڕن لە هەندێ شوێن بە قەڵەوی لەهەندێ شوێن بە باریکی دەردەبڕێت لە زمانی کوردیش بەهەمان شێوەیە وەکو نموونەکانی سەرەوە (کولنج، ١٩٩٩:٣٨) کەواتە ئەم گۆڕانانە لەهەر زمانێکدا هەبێت سیمای دیاری شێوەزارەکە نیشان دەدات لە زمانەکەدا.

٢. /هـ/–/ح/

| شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵآ | زمانی نووسین |
|---|---|
| حەفتە | هەفتە |
| بەحەشت | بەهەشت |
| حەتا | هەتا |

٣. /و/گۆڕانی بەسەردا دێت جارێك بە / ف/

| شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا | زمانی نووسین |
|---|---|
| حەفت | حەوت |
| نەفت | نەوت |
| شفتی | شوتی |

٤. گـــۆڕانی /و/ بـــە /ڤ/: فـــۆنیمی /ڤ/ لـــەم شـــێوەزارە زۆر بـــەکاردێت، بەکارهێنانی جۆرێکی دیاریکراو بە ئارەزووە (کولنج، ٤٩٥:١٩٩٩)

| شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا | زمانی نووسین |
|---|---|
| کەڤ | کەو |
| کێڤی | کێوی |
| ئاڤ | ئاو |
| ئەڤ | ئەو |

٤. گۆڕانی /وو/ – /ی/

| شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا | زمانی نووسین |
|---|---|
| تێنی | تێنوو |
| رۆژی | رۆژوو |
| زی | زوو |
| تی | توو |
| شیشە | شووشە |
| تەندیر | تەندوور |

٥. گۆڕانی /ۆ/ – /وو/

لە هەندێك شـوێن فـۆنیم بـە بـەرزی یـان بـە قەڵـەوی دەردەبڕێـت فۆنیمەکـە دەگۆڕێت وەکو قسەکەرانی باکووری ئینگلترا فۆنیمە لێوییەکان زیاتر بۆ نـاوەوەی زمان دەگەڕێنەوە کە ئەمەش فۆنیمەکە زیاتر نـرم دەکاتـەوە (کـولنج، ٢٦:١٩٩٩) وەکو فۆنیمی /ۆ/ لە شێوەزاری مزووری باڵا و کرمانجی سـەروو زیـاتر بـە نـرمتری دەردەبڕێت دەبێت بە فۆنیمی /وو/ وەکو ئەمانەی خوارەوە.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
| --- | --- |
| دۆ | دوو – ئەمە هاوبێژی دروست کردووە لەگەڵ ژمارە (٢) |
| فانۆس | فانووس |
| هاتووچۆ | هاتوو چوو |
| زۆر | زوور |
| دۆخ | دووخ |
| بزۆك | بزووك |
| گەرۆك | گەرووك |

٦. گۆڕانی /ا/ –/ە/

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
| --- | --- |
| نەكات | نەكەت |
| شارەزا | شەرەزا |
| نارێك | نەرێك |

٧. گۆڕانی /أ /– /ی/

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
| --- | --- |
| پیوان | پیوین |
| خوران | خورین |
| خشان | خشین |
| گەرمخان | گەرمخی |

٨. گۆڕانی /i / – /ە/

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
| --- | --- |
| گەردن | گەردەن |
| قسە | قەسە |
| ئاشكرا | ئاشكەرا |
| بزر | بەزر |

٩. گۆڕانی /ە/ – /i/

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالآ |
|---|---|
| هەنار | هنار |
| بەهار | بهار |
| گەوزین | گوزین |
| هەڵکردن | هلکرن، لەگەڵ سوانی /د/ |
| هەڵفڕین | هلفڕین ، لەگەڵ گۆڕانی /ڵ/ بۆ /ل/ |
| کەپر | کپر |

١٠. گۆڕانی فۆنیمی /س/ بە فۆنیمی /ص/

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالآ |
|---|---|
| سەرما | صەرما |
| سارد | صار / پاش کەوتنی /د/ |
| ساڵ | صاڵ |

١١. گۆڕانی فۆنیمی /ت / بە فۆنیمی /گ /:

لە زماندا لەناو هەندێ شێوەزار ژمارەی فۆنیمەکان زیاد دەکات، هەندێ فۆنیم بە دەنگی جیا دەردەبرێت وەکو دەربڕینی فۆنیمی /س/بە/ص/ و هەروەها دەربڕینی فۆنیمی /ت/ بە /ط/ کە ئەمەش هیچ کاریگەری لەسەر مانا ناکات (کولنج، ١٩٩٩:٢٥) وەکو ئەمانەی خوارەوە:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالآ |
|---|---|
| تەزی | طە زی |
| تەڕ | طە ڕ |
| تەماتە | طە ماطە |
| پەتاتە | پەطاطە |

هەندێ جار ژمارەی فۆنیمەکان لە هەندێ شێوەزاردا لەناو یەك زماندا دەگۆڕێت وەکو لە زمانی ئینگلیزی لە هەندێ شێوەزار لە سەدەی نۆزدەهەم ژمارەی فۆنیمەکان دەگەیشتە (١٠٠) فۆنیم (هەمان سەرچاوەی پێشوو) بەهەمان شێوە لە زمانی کوردی لە شێوەزاری کرمانجی سەروو دەتوانین بڵێین /گ/ فۆنیمە چونکە مانای نوێ دروست دەکات لە لێکسیکی شێوەزارەکەدا وەکو:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
| --- | --- |
| هەتا | تا_١ (بەواتای هەتا ) دێت |
| تایە | طا_٢ (بەواتای تای ئۆتومبیل) دێت |
| تەوەرە | تەوەر _١ (بەواتای بەش یان تەوەری بابەتێك) دێت |
| تەوەر | طە وەر_٢ (بەواتای ئامێرێك دێت) بۆ زەوی کێڵان بەکاردێت) |

کەواتە لێرەدا (تا ، طا) دوو وشەی جیاوازن بە دوو مانای جیاواز هەیە ئەمەش بە گۆڕینی تەنها یەك فۆنیم.

**سێیەم / لێکدان :**

لە ئەنجامی بەدوایەکتر هاتنی دوو فۆنیم لە وشەیەکدا، فۆنیمێکی نوێ دێتە کایەوە بۆ جیاکردنەوەی بزوێنەکان

/ی/ + /ا/ ____ /ێ/

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
| --- | --- |
| زیاتر | زێدەتر |
| تیادا | تێدا |
| سیانزدە | سێزدە (لەگەڵ کەوتنی /ن/) |

**چوارەم / جێگۆڕکێی فۆنیم :**

ژمارەیەکی زۆر وشە هەن ، کە لە شێوەزارەکاندا ئاوەژوو کراونەتەوە، واتە فۆنیمەکان پاش و پێش خراوە.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| بروا | باور |
| کەیبانو | کابانی |
| شاردنەوە | وەشارتن |
| کردنەوە | وەکرن / لەگەڵ کەوتنی /د/ |
| گرتنەوە | وەگرتن |
| کن | نك |
| زیخ | خیز |
| نەوەکو | نەکو، لەگەڵ سوانی /وە/ |
| خاڵۆژن | ژن خاڵ ، لەگەڵ سوانی /و/ |
| گەڕانەوە | وەگەڕیان |
| دەربینە | بینەدەر |

هەموو ئەو وشانەی (وە) دووبارەبوونەوەیان لەگەڵدایە، ئەوە دەکەوێتە پێشەوەی وشەکە وەکو (کردنەوە _ وەکرن ، گرتنەوە _ وەگرتن ... هتد)

پێنجەم / زیادبوونی فۆنیم:

ژمارەیەکی زۆر فۆنیم هەن لەم شێوەزارەدا زیاد دەبن، هەروەکو چۆن سوانی فۆنیم هەیە بەهەمان شێوە زیادبوونی فۆنیم هەیە، ئەمەش چەندایەتی بەکارهێنانی ئەم فۆنیمە لە شێوەزارەکە دیاری دەکات، کە جیاوازییەکی گرنگە جیای دەکاتەوە لە شێوەزارەکانی تر لەکاتێ دیاریکردنی ئەم چەندایەتی جۆرییە لە فۆنیم (الحساب النسبي) جیاوازییەکە دیار دەبێت (کولنج، ١٩٩٩:٤٩٣) کە لە شێوەزاری مزرووی باڵا زۆربەی ناوەکان بە هەندێك فۆنیم زیاد دەبن جیای دەکاتەوە لە زمانی نووسین بەهۆی چەندایەتیی بەکارهێنانی ئەم فۆنیمە.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| بیانی | بیهانی |
| دیار | دیهار |
| خزان | خزیان |

| هەژان | هەژیان |
|---|---|
| گەران | گەریان |
| هەرمێ | هەرمیك، لەگەڵ گۆرانی /ێ/بۆ /ی/ |
| دەرزی | دەرزیك |
| بەهی | بەهیك |

زۆربەی ناوەکانی ئـەم شـێوەزارە بـە (ك) کۆتـایی دێـت وەکـو ( کورسـیك ، هەرمیك ، دەسماڵك ، سێنیك ... هتد)

**شەشەم / ئامرازی بانگکردن :**

لە زمانی نووسین ناو لە کاتی بانککردن بە مۆرفیمی/ێ/ بـۆ مـێ،/ە/ بـۆ نێـر کۆتایی دێت، بەڵام لە شێوەزاری مزووری باڵا ، بۆ نێر (ا) بۆ مـێ (ێ)، لـە جیـاتی گۆڕانکارییـەکانی شـێوەزاری ڕەگـەز و چـینی کۆمەڵایـەتی، تەمـەن دیـار دەبێـت (کولنج، ١٩٩٩:٤٩٤) کەواتە لێرەدا جگە لە مۆرفیمی ڕەگـەز دیـار دەبێـت، چـینی کۆمەڵایەتی و تەمەنی دیار دەبێت بەهۆی زیـادکردنی (ا) و (ێ) بـۆ هەریـەکێك لـە ناوەکان، بە زیادکردنی مۆرفیمی (باب+ا ) یان (دای +ێ) جگە لەوەی ڕەگەزەکـە دیار دەکات، چینی کۆمەڵایەتی و تەمەنی کەسەکەش دیاری دەکات هەر وەکو ئەم نموونانەی خوارەوە ئەمەش خاسیەتێکی کرمـانجی سـەروو و شـێوەزاری مـزووری باڵایە کە جیایە لەگەڵ زمانی نووسین.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| کورە | کورا |
| بابە | بابا |
| خوشەکێ | خوشکێ |
| دایە | دایێ |
| ئامۆزا (لێرە بە – ا – کۆتایی بۆیە دەرنەکەوتووە) | دوت مامێ – بۆ ئامۆزای کچ<br>پس ماما _ بۆ ئامۆزای کور |

## پێشنیاز

چەند هەنگاو و پێشنیازێك بۆ نزیككردنەوەی هەموو زار و شێوەزار و دیالێكتەكان:

١. بەهۆی تیۆری كۆمەڵایەتی فۆنیمە جیاوازەكانی نێوان شێوەزارەكان دەستنیشان كراوە بەپێی تیۆری لابۆف كە فۆنیمە جیاوازەكانن. لەپاشان ڕەگی هاوبەش نیشاندراوە هەر وەكو تیۆری نۆرین كە ئەمەش لە بەشی دووەم پراتیك كراوە .

٢. هەنگاوی دووەم ئەمەیان بەرەو پێش ببرێت باشترینیان لەنێوانیان بژار بكرێت وەكو تیۆرەكانی كاكستن، بە میكانزمی تیم وۆرك لە نێوان هەموو شێوەزارەكان تێكستی نوێ بەرهەم بهێنرێت لە زمانی گشتیی شێوەزارەكان وەكو ئەزموونی دانتی بۆ زمانی لاتینی.

٣. لە هەنگاوی سێیەم ئەمانەی سەرەوە لە بواری خوێندن و كاروباری دامەزراوە ئەكادیمی و فەرمییەكان بەكارببرێت، هەنگاوی ریشەیی دەبن بۆ بەرەو زمانی پێوانی (ستاندار) .

## ئەنجام

١. شێوەزارەكان دروست دەبن بەهۆی گۆڕانی فۆنیمێك ئینجا بەسوان بێت یان كرتان یان زیادكردن یان گۆڕانی فۆنیمێك بێت، ئەو فۆنیمەی كە دەگۆڕێت هەموو فۆنیمەكانی وشەكە لە فۆنیمە گۆڕاوەكە جیاواز دەبن لە فۆنیمەكانی تر وشەكە هاوبەش دەبن، ئەمە جیاوازی و هاوبەشی لە نێوان زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا نیشان دەدات.

٢. سیما دیارەكانی شێوەزاری مزووری باڵا و دیالێكتی سەروو لەگەڵ زمانی نووسین بەزۆری سوانی /د/ لەگەڵ گۆڕانی /ڵ/ ___ /ل/ لەگەڵ گۆڕانی /ۆ/ ____/وو/ ئەمە زۆر لەو شێوەزارە بەدی دەكرێت .

٣. هۆكاری سەرەكی بۆ دروستبوونی شێوەزار شوێنی جوگرافییە ، ئەگەر هەموو شێوەزارەكان لەیەك نزیك بكرێنەوە، ئەوا ئەم جیاوازییە كەم دەبێتەوە، ئەمەش بە لێكۆڵینەوەی زمانەوانی دەبێت بە شێوەی تیم وۆرك بۆ دروستكردنی

زمانی ستاندارد چونکە زمان بە پەرەپێدان پێش دەکەوێت چونکە زمان شتێکی خۆرسکی نییە خۆی گەشە بکات.

٤. لەناو زماندا سێ جۆر پرۆسەی کرتان و گۆڕان و زیادکردن هەیە، ئەگەر ئەم پرۆسەیە لەچوارچێوەی زماندا وشەی نوێی بەمانای دروست نەکرد هەروەکو لە ڕێزمانی بەرهەمهێنانی زماندا هەیە، هەروەها ئەلۆمۆرفی دروست نەکرد، ئەوا ئەم پرۆسەیە لە چوارچێوەی وشەدا دەبێتە هۆی دروستکردنی شێوەزار بەهۆی گۆڕانی فۆنیمەکان وشەکانی زمان بەبێ ئەوەی واتای وشەکە بگۆڕێت.

٥. بەهۆی گۆڕانی فۆنیمەکان وشەی هاوبێژ دروست دەکات وەکو گۆڕانی (ۆ بۆ وو) کە (دوو) بەمانای ( دۆ _ دوو) دێت کە هاوبێژە، هەروەها ( بوو ) بە مانای (بۆ _ بوو) دێت

٦. بەهۆی گۆڕانی فۆنیم ئەلۆفۆن دروست دەبن لە شێوەزاری مزووری باڵا وەکو (ع، ا) و (ع، ە) نموونە: /ع/___/ ا/ ئاسمان _ عەسمان ، /ع/___ /ە/ هەور _ عەور

٧. دەکرێت بگوترێت (ط) فۆنیمە لە شێوەزاری ناوبراو چونکە بە گۆڕانی لەگەڵ (ت) گۆڕانی واتایی دروست دەکات وەکو (تا – واتە – هەتا) هەروەها (طا _ واتە _ تایە) کە دوو وشەی جیان، کەواتە ژمارەی فۆنیمەکان دەکرێت (٣٧) فۆنیم بێت بە فۆنیمی/ ط/ەوە.

## سەرچاوەکان:

A. **سەرچاوەکان بە کوردی:**

١) فلیب کرینبروك، کریستییەن ئالیسون (٢٠٠٨)، کولتوور و ناسنامەی کورد ، وەرگێڕانی وریا رەحمانی ، چاپخانەی خانی – دهۆك .

٢) وریا عومەر ئەمین، ( ٢٠٠٩)، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، دەزگای چاپی ئاراس _هەولێر

B. **سەرچاوەکان بە عەرەبی:**

٣) اوزالد دیکرو، جان ماري سشایفر (٢٠٠٧) القاموس الموسوعي الجديد لعلوم اللسان ، ترجمة د. منذر عياش ، الطبعة الثانية ، الناشر: المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء – المغرب.

٤) جون جوزيف (٢٠٠٧) ، اللغة والهوية ( قومية – اثنية – دينية) ، ترجمة (عبدالنور خراقي) اصدار المجلس الوطني الثقافة والفنون والادب.

٥) روي هاريس ، تولبت جي تيلر (٢٠٠٤)، اعلام الفكر اللغوي (التقليد الغربي من سقراط الى سوسير ) ترجمة احمد شاكر الكلابي، الجزء الاول، توزيع دار اويا للطباعة والنشر.

٦) نيقولاس اوستلر (٢٠١١) ، امبراطوريات الكلمة – تاريخ للغات في العالم ، ترجمة محمد توفيق البجيرمي ، دار الكتاب العربي ، بيروت – لبنان.

٧) ن .ى . كولنج (١٩٩٩) ، الموسوعة اللغوية، جامعة مانشستر، المجلد الاول، ترجمة محي الدين حميدي ، عبدالله الحمدان ، كلية اللغات والترجمة – جامعة الملك سعود ، المملكة العربية السعودية.

٨) ن .ى. كولنج (١٩٩٩)، الموسوعة اللغوية، جامعة مانشستر، المجلد الثاني، ترجمة محي الدين حميدي، عبدالله الحمدان، كلية اللغات والترجمة – جامعة الملك سعود ، المملكة العربية السعودية.

٩) ن .ى. كولنج (١٩٩٩)، الموسوعة اللغوية، جامعة مانشستر، المجلد الثالث، ترجمة محي الدين حميدي ، عبدالله الحمدان ، كلية اللغات والترجمة – جامعة الملك سعود، المملكة العربية السعودية.

١٠) هدسن (١٩٨٧)، علم اللغة الاجتماعي، ترجمة: عبدالامير الاعسم، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد – العراق

١١) هنرى فيلد (٢٠٠٠) (جنوب كردستان) دراسة انتروبولوجية، ترجمة: (جرجيس فتح الله)، دار ئاراس.

## المقارنه بين اللغة الرسمية ( مكتوبة ) ولهجة مزووری بالا

هذه بحث يتكون من فصلين مع مقدمه ونتائج، كيف تمكن علماء اللغة بكشف جذور اللغات بشكل عام بعدها تبحث عن مزووري بالا بشكل خاص .

الفصل الاول: يتكون من بعض نظريات للخطوات اللغة القياسية، في هذه فصل يبحث عن نظريات بعض العلماء وتجارب بعض اللغات في اللغة القياسية، منهم لابوف، حيث هو أول عالم يتكلم عن فوارق بين اللهجات عن طريق الاصوات المستعملة في اللغة ، بعدها نظرية نورين حيث يقرب كل اللغات مع بعضها باكتشاف جذور لكل لهجات اللغة.

ثالثاَ/ نظرية كاكستن: اللغة هو اداة يستعمله متكلم لهذه يستطيع ان يقدمه ليس اللغة شيء طبيعي يتقدم بشكل طبيعي ولكن على متكلم ان يقدمه الى امام كما هو مطلوب.

رابعاَ/ دانتي: استطاع ان يؤسس لغة رسمية عن طريق استعمال لغة عامة بدل من لغة لاتينية حيث كل واحد يستطيع ان يفهمه ويقرأه.

خامساَ/ نظرية تيم ورك: حيث يعمل على الجمع بين اللهجات لتكوين لغة الامة مع وجود اللهجات و الطبقات اللغوية.

في كل هذه النظريات نستطيع أن نربط بين بعظهم لنشكل منها اللغة القياسية بعدها سوف نقرب من اللغة المطلوبة في اللهجات العامة للغة الكردية.

الفصل الثاني: مقارنة بين اللغة المكتوبة (رسمية) ولهجة مزوري بالا، في هذه فصل لقد قارنا اللغة مستعملة ولهجة مذكورة تبين الفرق بينهما عن بعض الطرق حيث يبين من خلالها فارق او تقارب في كل منهما عن طريق:

اولاَ : التغير / تغير فونيم بعض الكلمات

ثانياً: قطع / ازالت او قطع فونيم حيث يزيل بعض فونيمات في بعض الكلمات.

ثالثاَ: أضافة/ اضافة فونيم في بعض الكلمات.

رابعاَ: مزج / تمزج فونيمن ويتغير بفونيم .

هكذا تبين فرق بينهما عن طريق مقارنة حتى نشكل تقرب لكل اللهجات مع بعضهما البعض و نستطيع ان نصنع منهما لغة القياس حيث كل فرد من يستعمله يفهمها ويستعملها في التعليم والمؤسسات وكلام مستعمل عند متكلم اللغة بشكل جيد ومفهم وسهل ... ألخ.

# Abstract

## Comport between formal Languages and Msory dialect

The research divided in two parts with introduction and conclusion.

First part is theory; they take some important theory from Willem Labuff, Noreen, Kakstan, Dainty, and Team work. All theory round and collocated dialects at Standard Language.

Example: Labuffs theory, they comported and view differ phoneme in the all words dialects' in this way they can near all that to each other.

And Noreen's theory near all dialects, for that, they found participant rots between all that.

Kakstans theory: The language is instrument which used by speaker and isn't nature, the speaker will be can advanced it, how which they would.

Dainty made standard language on the informal language

When he translated Latin Language to informal Language it will be making standard language which any one can will be had spoken and used.

At end Team work theory established a group team between all classes to front Language for national Language with having all classes and groups.

At second parts is comporting between Languages formal and mozory dialects.

At that departs it is view all different and nearer between them for that it is used some ways like the following.

First one it is changing: it shoed all changes differ phonemes between towns.

Second Cutting: it was cutting some phonemes at many words.

Third Add: some phonemes in the some words.

Fourth Merge: they were merging two phonemes with other to changing for one phoneme.

Finally its show differ between towns in the comporting way , and near all dialects to make Language standard , its understood by anyone who used it at education and at stats formals .

That's Language will be have used by speaker and its will be very will, easy and understood.

# ڕەنگدانەوەی سەبکی عێراقی
# لە شیعرەکانی مەحویدا

**د.سیروان جەبار ئەمین (زەند)**
فاکەڵتی ئاداب–زانکۆی سۆران

**کورتە**

لە زمانی فارسیدا وشەی ((سەبك)) بۆ وشەی شێوازی زمانی کوردی بەکاردەهێنرێت و لە رووی شێوازناسییەوە ئەدەبی کۆنی فارسی دابەش دەکرێت بەسەر سێ قوتابخانەدا بە ناوەکانی سەبکی خۆراسانی و سەبکی عێراقی و سەبکی هندی. سەبك بریتییە لەو تایبەتمەندییە زمانی و هزری و ئەدەبییانەی کە لە ماوەی قۆناغ و سەردەمێکدا باڵ دەکێشێت بەسەر ئەدەب و شیعری شاعیراندا و لەو روانگەیەوەی کە ئەدەبی کۆنی کوردی کاریگەری ئەدەبی کۆنی فارسیی بەسەرەوە دیارە، هەوڵدراوە لەم لێکۆڵینەوەیەدا رەنگدانەوەی تایبەتمەندییەکانی قوتابخانەی سەبکی عێراقی لە نێو شیعرەکانی مەحویدا دەستنیشان بکرێت.

**وشە کلیلییەکان:**

سەبکی عێراقی، تایبەتمەندیی ئەدەبی و زمانی، تایبەتمەندیی هزری، شیعری مەحوی.

## بەشی یەکەم: ناساندنی سەبکی عێراقی

### سەبکەکانی شیعری فارسی:

لە زمانی فارسیدا وشەی ((سبك)) لە بەرامبەر وشەی شێواز ((Style)) بەکاردێت و بە شێوازناسیش ((Stylistic)) دەگوترێت ((سبك شناسی)). لێکۆڵەرانی بواری ئەدەبی فارسی لە روانگەی شێوازناسییەوە ئەو ئەدەبە بۆ چوار قۆناغ دابەش بە ناونیشانی سەبکی خۆراسانی و سەبکی عێراقی و سەبکی هندی و سەبکی قۆناغی گواستنەوە، هەر سێ سەبکی سەرەتا پەیوەستن بە ئەدەبی کۆنی فارسییەوە و سەبکی چوارەمیش دەروازەی نوێبوونەوەی ئەو ئەدەبە لە خۆ دەگرێت. لە رووی مێژووییەوە سەرەتای سەرهەڵدانی سەبکی خۆراسانی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچیی هەتاوی و هەتا ناوەڕاستی سەدەی شەشەم بەردەوام دەبێت و سەبکی عێراقیش لە سەرەتای سەدەی حەوتەمەوە سەرهەڵدەدات و تا کۆتاییەکانی سەدەی دەیەم درێژ دەبێتەوە، هەرچی سەبکی هندییە لە سەدەی دەیەمەوە دەست پێدەکات و تا بە ئەمڕۆیش ڕەنگدانەوەکانی بەر چاو دەکەون و سەبکی قۆناغی گواستنەوەش لە سەدەی دوازدەیەمەوە دەست پێدەکات و تا بە ئەمڕۆیش بەردەوامە[1].

ڕوونکردنەوەی هەموو ئەم سەبکانە کاتێکی زۆری دەوێ و بە لێکۆڵینەوەیەکی کورت کۆتایی پێنایەت، پاشان ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆ ئێمە مەبەستە تەنیا سەبکی عێراقییە بۆیە هەموو سەرنجەکانی خۆمان لەم خاڵەدا کۆدەکەینەوە.

### سەرهەڵدانی سەبکی عێراقی

سەرهەڵدانی سەبکی عێراقی شتێك نییە کە تەنیا لە نێو خۆیدا ڕوویدابێت و هیچ پەیوەست نەبێت بە قۆناغی پێش خۆیەوە بەڵکو بە واتایەك لە واتاکان وەرچەرخانێکە کە بەسەر قوتابخانەی سەبکیی پێش خۆیدا هاتووە. سەرجەم قوتابخانە سەبکییەکانی ئەدەبی فارسی پەیوەستن بە سەردەمی پاش بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام و گەیشتنی ئەو ئاینە بە ئێران، واتە سەردەمی زمانی فارسیی نوێ.

یەکەمین بەرهەمە ئەدەبییەکانی زمانی فارسیی نوێ بە شیعر و پەخشانەوە لە چوارچێوەی سەبکی خۆراسانیدا نووسراون[٢]. بە شێوەیەکی گشتی لە رووی تایبەتمەندییەوە دەکرێت بەم شێوەیە سەبکی خۆراسانی بناسینەوە: شیعری ئەم قۆناغە خاوەن زمانێکی سادەی بێ ئاڵۆزیی داستانییە و لە پەخشانێکی کێشدار دەچێت و زۆرتر سروشتێکی فێرکاری هەیە و هەڵگری پەند و ئامۆژگارییە و فۆرمی باویشی زیاتر بریتییە لە قەسیدە[٣].

لە سەدەی شەشەمی کۆچیی هەتاویدا سەبکی خۆراسانی دەروازەکانی بە رووی گۆڕاندا کرایەوە و لە سەرەتاکانی سەدەی حەوتەمی کۆچیی هەتاوییەوە قوتابخانەیەکی شێوازیی نوێ هاتە کایەوە کە پاشتر بە قوتابخانەی سەبکی عێراقی ناسرا و باڵی کێشا بەسەر شیعر و ئەدەبی فارسی بە گشتی.

ئەدەب و گۆڕان و وەرچەرخانە ئەدەبییەکان پەیوەندییان بە ژیان و کایە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکانەوە هەیە و گۆڕان و وەرچەرخانە کۆمەڵایەتییەکان کاریگەری لەسەر شیعر و ئەدەبیش دروست دەکات. راستە کە سەرەتاکانی گۆڕانی سەبکی خۆراسانی لە سەدەی شەشەمی کۆچیی هەتاوییەوە دەستی پێکردبوو، بەڵام ئەوەی کە کۆتایی بەو سەبکە هێنا و سەبکی عێراقی کردە شوێنگرەوەی لە نێو ئەدەبی فارسیدا هێرشی کاولکاریی مەغۆلەکان بوو لە سەرەتاکانی سەدەی حەوتەمی کۆچیی هەتاویدا. خۆراسان مەڵبەندی شارستانییەت و هزر و ئەدەب و مایەی شانازیی ئێران بوو و لەم روانگەیەوە هۆکارێک بوو بۆ کۆبوونەوەی رووناکبیران و ئەدیبان و خەڵکانێکی زۆر بە مەبەستی خوێندن روویان لە خوێندنگاکانی ئەو شارە دەکرد، لەگەڵ هێرشی مەغۆلەکاندا ئەم ناوبانگ و شان و شکۆیە تێکشکا و شار بوو بە وێرانە و خەڵکانێکی زۆر کوژران و رووناکبیران و ئەدیبانیش ملی رێگەی ئاوارەییان گرتەبەر و هەموو هەڵاتن. لێرە بە دواوە قۆناغێکی نوێ لە مێژووی ئێران دەستی پێکرد و هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریی نوێ هاتە کایەوە. شاعیران و ئەدیبان بە زۆری روو لە وڵاتی عێراق دەکەن و لێرەوە و لە ژێر کاریگەریی ئەم هەلومەرجە نوێیەدا ئەدەبێکی نوێش سەرهەڵدەدات کە جیاوازە لە ئەدەبی سەبکی خۆراسانی و بە ئەدەبی سەبکی عێراقی ناونرا[٤].

**سیما جیاکەرەوەکانی سەبکی عێراقی:**

سەبکی عێراقی بۆ ماوەی نزیکەی سێ سەدە، واتە سەدەکانی حەوت و هەشت و نۆی کۆچیی هەتاوی کۆی شیعر و ئەدەبی فارسی لە سایەی خۆیدا ڕاگرتبوو و ئەدیبان پەیڕەوییان لە یاسا و ڕێسا باوەکانی دەکرد. پسپۆران و لێکۆڵەرانی بواری ئەدەبی فارسی تایبەتمەندی و سیما جیاکەرەوەکانی سەبکی عێراقی لە سێ ڕووەوە باس دەکەن کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

**یەکەم: سیما زمانییەکان:**

زمان کەرەستەی یەکەم و بناغەی دروستبوونی ئەدەب و لەگەڵ ڕێڕەوی کات و سەردەمدا گۆڕانی بەسەردا دێت و خۆی لەگەڵ بارە نوێیەکاندا دەگونجێنێت. سەبکی عێراقی بۆخۆی لەدایکبووی ئەو هەلومەرجە نوێیە بوو کە لە پاش هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر ئێران و ناوچەکە هاتە ئاراوە و گۆڕانێکی گەورەی لە هەموو لایەن و کایەکانی ژیانی ئەو ناوچەیەدا دروست کرد، و ئاساییە یەکێك لەو لایەنانەشی کە گۆڕانی بەسەردا هات زمان بوو.

وەکو ئاماژەی پێکرا سەبکی خۆراسانی لە پاش نوێبوونەوەی زمانی فارسیی نوێ سەری هەڵدا و سەبکی عێراقیش هەروەکو لە بەرهەمەکانیاندا بەرچاو دەکەوێت لە چوارچێوەی هەمان زمان لە فۆرمە گشتییەکەیدا مایەوە و هەندێ گۆڕانی بەسەرداهات.

لە رووی زمانەوە یەکێك لەو گۆڕانکارییانەی کە لە سەبکی عێراقیدا بەرچاو دەکەوێت بریتییە لە کرانەوەی دەرگای زمانی شیعر و ئەدەب بەگشتی بە رووی وشە و زاراوەکانی زمانی عەرەبی و دروستبوونی زمانێکی تێکەڵ کە پێشتر هاوشێوەی نەبوو لە زمانی فارسیدا و گرنگترین سەرچاوەی دروستبوونی ئەم زمانەش هاتنە ئارای ئەو تێکەڵییە ئاینی و کەلتوورییەیە کە لە پاش بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام بەرە بەرە لە ناوچەکەدا جێگیر بوو، هەروەها کۆچی نووسەران و ئەدیبان دوای هێرشی مەغۆلەکان بەرەو عێراق و تێکەڵاوییان لەگەڵ ژینگەیەکی نوێی عەرەبی زمان(٥). لەبەر ئەوەی ئاین گرنگترین ڕۆڵی هەبوو لە بڵاوبوونەوەی

زمانی عەرەبی و پاشتر بووە زمانی خوێندن و ڕووناکبیری و لـە ڕێگەیـەوە ئـاین و زانستە ئیسلامییەکان بە نێو نەتەوە موسڵمانبووەکاندا بلاوکرایەوە بۆیـە دەبیـنین لە سەبکی عێراقی بە دواوە وشە و زاراوەکانی زانستە ئیسلامییەکان بە نێو شـیعر و ئەدەبیشدا بلاو دەبنەوە و ئەمەش دەبێتە تایبەتمەندییـەك بـۆ ئـەم سـەبکە[٦] و نەك هەر زانستە ئیسلامییەکان بەڵکو وشە و زاراوەی زانسـتەکانی دیکـەیش وەکـو ((کیمیا)) و ((ئیکسیر)) و.. هتد لەلای شاعیرانی سەر بە سـەبکی عێراقـی لـە نێـو شیعردا بەکارهێنران[٧].

لە پـاڵ تێکـەڵبوونی وشـە و زاراوەکـانی زمـانی عـەرەبی بـە زمـانی شـیعر و ئەدەب و دەرکەوتنی وەکو یەکێك لە تایەتمەندییە شێوازییەکانی سەبکی عێراقـی، لەگەڵ هێرشی مەغۆلەکانیشدا کۆمەڵێك وشە و زاراوەی زمـانی تـورکی هاتنـە نێـو زمانی فارسی و لەوێشەوە گواسـترانەوە بـۆ نێـو زمـانی شـیعر و ئـەدەبی سـەبکی عێراقی گەرچی ئەمە بە بەراورد لەگەڵ وشە و زاراوەکانی زمانی عەرەبی ڕێژەکەی زۆر کەمترە[٨].

یەکێك لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی سەبکی عێراقـی بریتییـە لـە گرنگیـدان بـە عیرفـان و تەسـەوف و ڕەنگدانـەوەیان لـە نێـو شـیعردا (پاشـتر لـە باسـی تایبەتمەندییـە هزرییەکانـدا باسـی دەکـەین) و ئـەم گرنگیـدان و ڕەنگدانەوەیـەش کاریگەری لەسەر زمانی شیعر دروست کردووە، چونکە عیرفان و تەسەوف خـاوەن فەرهەنگێکی زمانی و کۆمەڵێك وشە و زاراوەی تایبەت بە خۆیانن و شاعیرانی سەر بە سەبکی عێراقـی چ سـۆفی و چ ناسـۆفییەکان، هـزر و وشـە و زاراوە عیرفـانی و تەسەوفییەکانیان وەکو دیاردەیەکی باو لە نێو شیعرەکانیاندا بەکارهێناوە[٩].

**دووەم: سیما هزرییەکان:**

سەرەتای هـەموو داهێنانێـك لـە دنیـای هـزر و ئـەو گۆڕانکارییانـەوە دەسـت پێدەکات کە لە نێو دنیای هزردا ڕوو دەدەن و پاشتر ئەمانە لە چوارچێوە مادی و بەرهەستەکەدا خۆ دەنوێنن و دەبنە سەرچاوەی دروسـتبوونی داهێنانـە نوێیەکـە، سەبکی عێراقیش لەم ڕێسایە بەدەر نییە. سەبکی عێراقی لـە نـاو خۆیـدا هـەڵگری کۆمەڵێك تایبەتمەندیی هزرییە و بە واتایـەکی تـر لـە بنەڕەتـدا ئـەم تایبەتمەندییـە هزرییانەن کە بناغەی سەبکی عێراقییان پێکهێناوە.

یەکێك لە تایبەتمەندییە هزرییە هەرە دیارەکانی سەبکی عێراقی بریتییە لە ئاوێتەبوونی هزری عیرفانی و تەسەوفی بە دنیای شیعر و ئەدەب و بڵاوبوونەوە و ڕەنگدانەوەی هزر و کەلتوور و زاراوەکانی عیرفان و تەسەوف لە نێو شیعر و ئەدەبدا.

وەکو ئاماژەمان پێکرد سەبکی عێراقی لە پاش هێرشی مەغۆلەکانەوە دەست بە سەرهەڵدان دەکات و لە هەمان کاتیشدا ئەم قۆناغە سەردەمی گەشەسەندن و باوبوونی بڵاوبوونەوەی عیرفان و تەسەوفە و لەم قۆناغەدا برەو بە بیری تەسەوفی دەدرێت لە نێو کۆمەڵگادا و خەڵکانێکی زۆر روو لە سۆفیگەری دەکەن و ژمارەی خانەقاکان زۆر روو لە زیادبوون دەکەن و خانەقانشینی و کۆبوونەوە لە خانەقاکاندا دەبێتە دیاردەیەکی باوی ئەم قۆناغە و بە شێوەیەکی گشتی سۆفیگەری بە بەربڵاوی لە نێو کۆمەڵگادا بڵاو دەبێتەوە[10].

لێرەوە شیعر و ئەدەبیش ڕەنگ و ڕوویەکی عیرفانی و تەسەوفی لە خۆ دەگرن و جگە لەو شاعیرانەی کە بۆ خۆیان لە بنەڕەتدا سەر بەم جیهانبینین و بەرهەمەکانیشیان هەر لە خزمەتی ئەم جیهانبینییەدایە، شاعیرانی دیکەی دەرەوەی جیهانبینییەکەش لەم کاریگەرییە بەدەر نین و سیمایەکی سۆفییانە بە شیعرەکانیانەوە دیارە و هەروەها هەندێ کات شیعری شاعیرانێك بەرچاو دەکەون کە بە زمانێکی سۆفییانە باسیان لە بابەتگەلێکی دنیاییش کردووە و یان لە شیعری هەندێ شاعیردا جیاکردنەوەی مەعشووق لە نێوان ئاسمانی و زەمینیدا کارێکی زۆر دژوارە[11] و ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەی ڕاستیی قسەکانی سەرووەیە.

شیعر بە درێژایی مێژووی تەمەنی خۆی پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ عەشقدا هەبووە و بەردەوام عەشق وەکو بەرزترین دەرکەوتنی هەست و سۆزی مرۆڤ بەشی هەرە زۆری شیعری بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە بەڵام ئەم پەیوەندییە هەمیشە خۆی لە یەك فۆرمدا نەبینیوەتەوە و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر گۆڕانی بەسەردا هاتووە. لە سەبکی خۆراسانیدا بە پێچەوانەی سەبکی عێراقی لە بری عەشق، ستایشکردنی عەقڵ دەبێتە باو لە نێو شیعردا و ئەمەش لە کۆتاییدا وادەکات بە چاوێکی کەم و نزمییەوە لە پلە و پایەی مەعشووق بڕوانرێت لە شیعردا[12] چونکە عەشق وەکو خاڵی پێچەوانەی عەقڵ تەماشا دەکرا و بەمەش

عەشقی مەعشووق مرۆڤ لە بیرکردنەوەی عەقڵانی دوور دەکاتەوە و بە واتایەکی تر مەعشووق دەبێتە سەرچاوەی ئەو کێشانەی کە مرۆڤ بە هۆی دوورکەوتنەوەی لە بڕیارە عەقڵانییەکان تووشی دەبێت بۆیە سەرزەنشتی مەعشووق دەکەن و لە پلە و پایەیەکی نزمیدا دەبینن.

بە پێچەوانەوە لە سەبکی عێراقیدا تێڕوانین بۆ پلە و پایەی مەعشووق گۆڕانی بەسەردا دێت و چیدی بەو چاوەی سەبکی خۆراسانی تەماشا ناکرێت و بەرز دەکرێتەوە بۆ بەرزترین ئاست، بە دڵنیاییەوەش ئەمە پەیوەستە بە گۆڕانی پێگەی عەشق لە نێو ئەدەبدا و پڕکردنەوەی ئەو شوێنەی کە پێشتر عەقڵ لە سەبکی خۆراسانیدا هەیبوو[١٣]، بەمەش عەشق دەبێتە ستایشکراوی یەکەم و سەرەکیی نێو شیعری شاعیرانی سەربە سەبکی عێراقی و مەعشووقیش دەبێتە سالار و سەروەری شیعر و تەنانەت شاعیر بوونی خۆی لە بوونی ئەودا دەبینێتەوە و ئەو بە سەرچاوەی ژیان و هێز و توانای خۆی دەزانێت.

یەکێکی تر لە تایبەتمەندییە دیار و بەرچاوەکانی سەبکی عێراقی بریتییە لە بەرچاوکەوتنی دیاردەی غەمباری لە زۆربەی شیعرەکانی شاعیرانی ئەم سەبکە بە جۆرێك کە زۆر کات هەست دەکرێت دیوانی ئەم شاعیرانە لە ڕاستیدا غەمنامەی خاوەنەکانیانە، ئەمەش دەکەوێتە خاڵی بەرامبەری سەبکی خۆراسانی کە شیعری شاعیرەکانی بە شادی دەناسرێنەوە و شادی یەکێکە لە سیما بەرچاوەکانی، بە واتایەکی تر سەبکی خۆراسانی حیکایەتی وەسڵە و سەبکی عێراقیش حیکایەتی فیراق[١٤]، هەڵبەتە نابێت ئەوە لە یاد بکەین کە غەم بەشێکی دانەبڕاوی شیعر بووە لە هەموو سەردەمەکاندا و بە درێژایی مێژووی شیعر وەکو بابەتێك بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە نێو شیعردا دەبینرێت بەڵام لە سەبکی عێراقیدا لەم دەرکەوتنە لابەلایە دەردەچێت و دەبێتە تایبەتمەندییەکی شێوازی و شیعری ئەم سەبکەی پێ دەناسرێتەوە.

لە شیعری سەبکی خۆراسانیدا شاعیران بە زۆری ڕوویان لە دنیای دەرەوەیە و باس لە بوونی دەرەوەی خۆیان و سروشتی واقیعی و زیندوو دەکەن، بەڵام ئەم ڕوانگەیە لەلای شاعیرانی سەبکی عێراقی پێچەوانە دەبێت و شاعیران ڕوو لە دنیای دەرەوە وەردەگێڕن و لە سروشتی واقیعی و زیندوو دوور دەکەونەوە و لە

بـری ئەمـە ڕوو دەکەنـە دنیـای نـاوەوەی خۆیـان و بایـەخ بـە بابەتـە عـەقڵی و ئەبستراکتەکان و بیرکردنـەوەی ئایـدیالی دەدەن و هـەر ئەمەشـە وای کـردووە کـە ڕەخنەگرانی ئەدەبی فارسی سەبکی خۆراسانی بە دەرەوەگەرا (دەرەوە سەنتەر) و سەبکی عێراقیش بە ناوەوەگەرا (نـاوەوە سـەنتەر) نـاو ببـەن[١٥]، واتـە شـیعری سەبکی خۆراسانی زۆرتر شیعرێکی بابەتییە و شیعری سەبکی عێراقیش شـیعرێکی زاتی.

**سێیەم: سیما ئەدەبییەکان:**

جیابوونەوەی سەبکی عێراقی لـە سـەبکی خۆراسـانی تـەنیا لـە ڕووی هـزر و زمانەوە نییە و بەڵکو لە ڕووە ئەدەبییەکەشەوە ئەم جیاوازییە بەرچاو دەکـەوێت. لە ڕووی ئەدەبیشەوە سەبکی عێراقی چەند تایبەتمەندییەکی بۆ دروست بـووە کـە شیعری ئەم سەبکەی پێ دەناسرێتەوە و جیای دەکاتەوە لە سەبکی خۆراسانی.

دیارترین سیما و تایبەتمەندی ئەدەبیی سەبکی عێراقی بریتییە لەو گۆڕانـەی کە لە بواری فۆرم و قاڵبی شیعری پێش خۆیدا دروسـتی دەکـات. بـەر لـە سـەبکی عێراقی و لە سەبکی خۆراسانیدا فۆرم و قاڵبی باوی شیعر لە نێو ئەدەبی فارسـیدا بریتییە لە قەسیدە بەڵام لەگەڵ هاتنی سەبکی عێراقیدا غەزەل شوێنی دەگرێتەوە و دەبێتە فۆرم و قاڵبی باوی شیعر[١٦] و لێرە بەدواوە بەشـی هـەرە زۆری شـیعری نێـو دیـوانی شـاعیران لـە غـەزەل پێکدێت و فـۆرم و قاڵبـەکانی دیکـەش لـە پـاڵ غەزەلدا بەکاردێن بەڵام بەڕێژەیەکی کەم و لاوەکی.

غـەزەل لـە ئـەدەبی ڕۆژهەڵاتیـدا بـە زۆری لـە بەرامبـەر لیریکـی ڕۆژئـاوادا بـەکارهاتووە و لـەم ڕوانگەیـەوە دەکرێـت بڵـێین لـە ڕووی سروشـتی ژانرییـەوە، شـیعری سـەبکی عێراقـی سروشـتێکی لیریکـی هەیـە و ئەمـەش دەکەوێتـە خـاڵی بەرامبەری سەبکی خۆراسانی کە سروشتێکی داسـتانی هـەبوو[١٧] واتـە شـیعرێکی زاتییـە و گوزارشـت لـە هەسـت و سـۆز و دەروون و نـاخی شـاعیر دەکـات و بـە شـێوەیەکی گشـتی شـیعری سـۆزداری و عاشـقانەیە و بـە واتایـەکی تـر عەشـق سـەنتەرە و تێیـدا مەعشـووق پاڵەوانـە و کـۆی باسـەکان بـە دەوری ئـەودا دەسووڕێنەوە[١٨] و تەنانەت ئەو کاتانەشی کە باس لە هەر بابەتێکی دیکەی وەکو خودا و شێخ و نیشتمان و سروشـت و...هتـد دەکرێـت، سروشـتێکی عاشـقانە بـە

بابەتەکە دەبەخشرێت و وەکو مەعشووق مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و بە زمانێکی عاشقانە گوزارشت لە بیر و بابەتە جیاوازەکان دەکرێت[19].

لەگەڵ برەوپێدانی غەزەل و لیریکیشدا کۆمەڵێك هونەر و تەکنیکی شیعریش برەویان پێدرا و بوونە بەشێك لە شیعر و سیمایەکی دیار بۆ شیعری سەبکی عێراقی. لە رووی هونەرەکانی رەوانبێژییەوە لە هەنگاوە سەرەتاییەکانی سەبکی خۆراسانیدا هێشتا ئەم هونەرانە لە نێو ئەدەبی فارسیدا بە تەواوی سەریان هەڵنەداوە و لە هەنگاوەکانی پاشتریشیدا سادەیە و کەمتر رەنگدانەوەیان لە نێو شیعرەکاندا هەیە و ئەوەندەشی کە هەیە زیاتر لە چوارچێوەی چەند هونەرێکی دیاریکراودایە وەکو لێچوواندن و کەمتر لەویش خواستن، بەڵام سەبکی عێراقی بایەخدان بە هونەرەکانی رەوانبێژی و زیادەڕەوی لە وەسفدا دەگاتە لووتکە[20] و شاعیران وەستایانە قۆڵی خۆیانی لێ هەڵدەماڵن و ئەسپی خۆیانی تێدا تاودەدەن.

کێشی شیعر لە سەبکی خۆراسانیدا بە هۆی ئەو ئاڵۆزییانەی کە بۆی دروست بووە لە ئەنجامی نەگونجانی زمانی کۆنی فارسی و ئەو وشە قورس و گرانانەی کە لە زمانەکەدا هەبوو و لە رووی مۆسیقاوە لەگەڵ کێشی عەرووزی عەرەبی، وای کردووە گۆڕان لە کێشەکان و هەروەها درکاندنی وشەکانیشدا دروست بکەن و ئەمەش بەگشتی لە رووی کێشناسییەوە بووەتە هۆی جۆرێك لە نەخوازراوی لە شیعری سەبکی خۆراسانیدا، بۆیە شاعیرانی پاشتر و پەیڕەوکارانی سەبکی عێراقی زۆرێك لە کێشەکانی سەبکی خۆراسانییان وەلاوەنا[21] و زیاتر ئەو کێشانەیان هەڵبژارد کە گونجاوترن لەگەڵ زمانی فارسی و سروشتی وشەکانی.

لە رووی سەروایشەوە هەندێ تایبەتمەندی لە شیعری سەبکی عێراقیدا هەیە کە لە سەبکی خۆراسانیدا بەدی ناکرێن یاخود نموونەیان زۆر کەمە وەکو هەبوونی پاش سەروا. سەروا و پیتەکانی سەروا لە هەردوو سەبکی عێراقی و خۆراسانیدا تا رادەیەکی زۆر هاوشێوەن و ئەوەی کە دەبێتە خاڵی جیاوازیی نێوانیان هەبوون و باوبوونی پاش سەروایە لە سەبکی عێراقیدا کە پێشتر ئەم پێگە و بایەخەی نەبووە[22].

یەکێکی تر لەو خاڵانەی کە لە ریزی تایبەتمەندییەکانی سەبکی عێراقیدا دەبێت ئاماژەی پێبکرێت چەسپاندن و جێگیرکردنی ((تخلص))ە، واتە

ئاماژەکردنی شاعیر بە ناوی شیعریی خۆی لە کۆتایی شیعرەکەیدا بە تایبەتی لە غەزەل و قەسیدەدا[٢٣]. لە سەبکی خۆراسانیدا تەخەلوس شتێکی چەسپاو و جێگیر نەبوو بەڵام لەگەڵ بڵاوبوونەوەی سەبکی عێراقیدا دەچەسپێت و جێگیر دەکرێت[٢٤] و بەشێوەیەکی گشتی لە دێڕی کۆتایی شیعرەکەدا ئاماژەی پێدەکرێت و هەندێ کاتی کەمیش لە دێڕی پێش کۆتایی.

## بەشی دووەم: ڕەنگدانەوەی تایبەتمەندییەکانی سەبکی عێراقی لە شیعرەکانی مەحویدا

### مەحوی و سەبکی عێراقی:

بە شێوەیەکی گشتی زمانی شیعری کۆنی کوردی لێکچوونێکی زۆری لەگەڵ سیما زمانییەکانی شیعری سەبکی عێراقیدا هەیە و بە هۆی ئاشنابوونی شاعیرانی کۆنی کورد بە شیعر و ئەدەبی فارسی و بە تایبەتی شیعرەکانی حافز و سەعدی و سەنایی و مەولانای ڕۆمی و... هتد و کاریگەربوونیان بەو ئەدەبە و هەوڵدان بۆ سوودلێوەرگرتن و لاساییکردنەوەیان کارێکی وای کردووە ڕەنگدانەوەی شێوازی نووسینی شیعری ڕۆژهەڵاتی و فارسی لە ئەدەبی کۆنی کوردیدا بەرچاو بکەوێت بە تایبەتی ڕەنگدانەوەی سەبکی عێراقی، کە زۆر بە ڕوونی سیما و تایبەتمەندییەکانی ئەم سەبکە لە نێو شیعری کۆنی کوردیدا هەستی پێدەکرێت[٢٥].

مەحوی شارەزایەکی باشی زمان و ئەدەبی فارسی بووە و لە کۆی نزیکەی دوو سەد غەزەل کە لە پاشی بەجێماوە، حەفتا و پێنج غەزەلیان بە زمانی فارسی نووسراون و ئەمەو جگە لە چەند پارچە و تاك و چەند پێنج خشتەکی. بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە چەندین شوێنی شیعرەکانیدا ئاماژەی بە شیعر و ناوی بەشێك لە شاعیرانی ئەدەبی فارسی کردووە و ئەمەش خاڵێکی دیکە نیشاندەری ئاشنابوونی شاعیرە بە سەبك و شێوازی شیعری ئەو شاعیرانەی ئەدەبی فارسی کە زۆرتر سەر بە سەبکی عێراقین و کاریگەربوونی ناوبراوە بەو ئەدەبیاتە.

مەحوی شیعری شاعیرە دیارەکانی سەبکی عێراقی خوێندووەتەوە و پێیان کاریگەر بووە و هەندێ کات ئەم کاریگەرییە ناڕاستەوخۆ بووە و سوودی لە بیر و وێنە و شێوازەکانیان وەرگرتووە (پاشتر بە وردی لەم بارەیەوە دەدوێین) و هەندێ جاریش ڕاستەوخۆ بووە و دێڕ و نیوە دێڕەکانیانی تێهەڵکێشی شیعرەکانی خۆی کردووە، بۆ نموونە لەم چوارخشتەکییەدا دوو نیوە دێڕی دوو شاعیری دیاری سەر بە سەبکی عێراقی واتە سەعدی شیرازی و کەمالی خوجەندیی[٢٦] هێناوە و تێهەڵکێشی شیعرەکەی خۆی کردووە و دەڵێت:

بە طەرەف ئەم نەخۆشی بێچارەت
(نگهی کن بچشم بیمارت)
بۆیە دەتنێمە پەردەکەی چاوم
(کە بپوشم ز چشم اغیارت) ٣٣٦*

نیوە دێڕە وەرگێراوەکەی یەکەم شیعری کەمالی خوجەندییە و نیوە دێڕەکەی دووەمیش شیعری سەعدی شیرازییە. لە روانگەی ئەم کاریگەرییەوە لێرەدا بە نموونەوە رەنگدانەوەکان لە لایەنی زمان و هزر و ئەدەبەوە دەخەینە روو:

**یەکەم: سیما زمانییەکان:**

ڕەنگدانەوەی تایبەتمەندییە زمانییەکانی شیعری سەبکی عێراقی لە زۆر شوێنی شیعرەکانی مەحویدا بە روونی بەرچاو دەکەون گەرچی رەنگە لە هەندێ رووەوە جۆرە گۆڕانێکیان بەسەردا هاتبێت، و دەکرێت زۆر نموونەیان بۆ بهێنرێتەوە.

شیعری کۆنی کوردی بەگشتی و شیعرەکانی مەحویش وەکو بەشێك لەو قۆناغەی شیعری کوردی خاوەنی زمانێکی کوردیی تێکەڵ بە چەند زمانێکی دیکەن. زمانی سەبکی عێراقی فارسییەکی تێکەڵ بە وشە و پەیڤی عەرەبییە و ئەم تایبەتمەندییە لای مەحوی و لە هەموو شیعری کۆنی کوردیشدا بەرچاو دەکەوێت بەڵام بە هەندێ جیاوازییەوە. لە سەبکی عێراقیدا تەنیا وشە و پەیڤ و رستەی زمانی عەرەبی تێکەڵ بە شیعری فارسی کراون کەچی لەلای مەحوی جیا لە زمانی عەرەبی، وشە و پەیڤ و رستەی زمانی فارسی (و زۆر بە کەمیش زمانی تورکی)ش تێکەڵ بە زمانی کوردی کراون، بۆ نموونە دەڵێت:

کە ئیشی **ئوممەتی** بێ **حەشر** و **نەشری**
لە **حەشرا** هەر بەوە، بەو **ڕەفع** و **ڕاجیع** ١٦٩

سەبارەت بە تێکەڵکردنی زمانی فارسیش نموونە لە شیعرەکانیدا زۆرن و لە دێڕێکدا دەڵێت:

لە پەردەی **جیلوەیەکتا ڕوونمایە** شۆری صەد مەحشەر
نیقابێ لادە لەو **چیهرە**، ببینە زەلزەلەی مەخلووق ١٨١

جگە لەمەش مەحوی هاوشێوەی شاعیرانی دیکەی ئەدەبی کۆنی کوردی لە پاڵ تێکەڵکردنی پەیڤ و وشەی زمانانی تر بە زمانی کوردی، زۆر جار تەنانەت شیعریشیان بەو زمانانە گوتووە و ئەمە لە سەبکی عێراقیدا نموونە زۆر کەمترە بە بەراورد لەگەڵ ئەدەبی کوردی. مەحوی نزیکەی یەك لەسەر سێی شیعرەکانی بە زمانی فارسین و چوارخشتەکییەك و دوو پێنج خشتەکیشی بە زمانی عەرەبی نووسیوە[٢٧].

لەلای زۆربەی ڕەخنەگرانی ئەدەبی کوردی باسی سۆفیبوون و عارفبوونی مەحوی شتێکی بڕاوە و بەڵگە نەویستە، لەم سۆنگەیەوە ئاساییە کە شیعرەکانیشی ڕەنگدانەوەی بیر و باوەڕەکانی پێوە دیاربێت و پڕاوپڕبن لە وشە و زاراوەکانی سۆفیگەری چونکە ((مەحوی یەکێکە لەو شاعیرە سۆفییە مەزنانەی کە ڕۆڵێکی گرنگیان لە شیعری سۆفیگەریدا هەبووە لە ئەدەبی کوردیدا و شیعرە سۆفیگەرییە کوردییەکانی بە لووتکەی شیعرەکانی دادەنرێ لە کرمانجی خواروودا))[٢٨] و لە زۆر شوێنی شیعرەکانیدا ئاماژەی بە وشە و زاراوەی سۆفییانە و حاڵ و مەقامەکان کردووە[٢٩]، بۆ نموونە دەڵێت:

غەیری وەحدەت لە وجوودا نییە، کەثرەت وەهمە

سادە تەکراری یەکە، مەنشەئی ئەوهامی عەدەد ١١٣

یان دەڵێت:

کەمالات و مەعاریف مەبیە، بێ دەخڵی هەوێنی عیشق

عەجەب پشکووتووە لەم جەذوە نارە پڕ بە عالەم نوور ١٢٨

مەحوی بۆخۆی خوێندنی لە مزگەوتەکاندا تەواو کردووە و پاشانیش وەکو مامۆستایەکی ئاینی لە مزگەوت و خانەقاکەی خۆیشیدا ڕۆڵی سەرقاڵی خوێندنەوە و فێرکردنی زانستە ئاینییەکان بووە[٣٠] و لێرەوە زۆرێك لە وشە و زاراوەکانی نێو زانستە ئیسلامییەکان گواستراونەتەوە بۆ نێو شیعرەکانی، کە لە هەمان کاتدا ئەمە بۆخۆی یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی سەبکی عێراقی. مەحوی لە شیعرەکانیدا ئاماژەی بە وشەگەلێکی وەکو کەلام و عەقیدە و زات و سیفات و کەون و مەکان و زەمان و حادیس و قەدیم و واجیب...هتد کردووە و بۆ نموونە دەڵێت:

زاتی خودا کە خالیقی ئەکوانە، هەر بووە
یەعنیی قەدیمی موطلَەقە (بالذات) و (بالزمان)
واجب بە زاتە، بوون و وجوودی لە خۆوەیە.
فەردێکی مونفەرید بە بەقاو و هەمیشە مان ٣٧٠

سەبکی عێراقی لەگەڵ خۆیدا لە پاڵ وشە و زاراوەکانی زانستە ئیسلامییەکان، کۆمەڵێك لە وشە و زاراوەکانی زانستەکانی تر و بە تایبەتی زانستە سروشتییەکانیشی هێناوەتە نێو زمانی شیعرەوە و هەمان دیاردە لە لای مەحویش بەرچاو دەکەوێ و چەند وشەیەکی وەکو کیمیا و ئیکسیری لە شیعرەکانی بەکارهێناوە و لەم بارەیەوە دەڵێت:

وتم: چبکەم لە بۆ وەصڵت؟ وتی: کەس
بە کەس نەیوتووە عیلمی کیمیا قەط ١٥٩

یان لە شیعرێکی تردا دەڵێت:

لە خاکی پاکی ئەو بەردەرکەدا گەوزا رەقیب، ئامان
دەری کە، حەیفە گوورئاسن خەسارەت دا لە ئیکسیرت ٦٨

وێڕای ئەوەی هەندێ جار بەکارهێنانی وشەی زمانانی دیکە و بە تایبەتی وشەکانی زمانی عەرەبی جۆرە زبرییەکی لە شیعرەکانی مەحویدا دروست کردووە بەڵام بە شێوەیەکی گشتی زمانی شیعری مەحوی هاوشێوەی شیعری شاعیرانی سەبکی عێراقی تاڕادەیەکی زۆر نەرمە وەکو لەم دێڕەدا بەرچاو دەکەوێت:

بە پیر ئەو ماهەوە چووم و بەسەر چووم
پەری بوو، ئەو نەبوو، شەو بوو، بەسەرچووم
تەڵێ نێرگسم و باغی حیرەتم پێ
بە فەرهات و وەکو گوڵ زوو بەسەرچووم ٢٢٥

ئەم نەرمییە مۆسیقایەکی جوانی بە شیعری سەبکی عێراقی بەخشیوە گەرچی ئەم نەرمییە لە شیعرەکانی مەحویدا بە هۆی مەزراندنی ناوەرۆکەوە بە بەراورد لەگەڵ شیعری شاعیرانی دیکەی ئەدەبی کۆنی کوردیی وەکو نالی کە سەر بەهەمان سەبکە لە ئاستێکی نزمتردایە.

**دووەم: سیما هزرییەکان:**

یەکێك لە تایبەتمەندییە هزرییە هەرە دیارەکانی سەبکی عێراقی بڵاوبوونەوەی عیرفان و تەسەوف و بیری سۆفیگەرییە لە نێو شیعردا بە جۆرێك کە بەشی زۆری شیعری ئەم سەبکە سیمایەکی عیرفانی پێوە دیارە تەنانەت لەو کاتانەشی کە باس لە مەعشووقی مەجازی و زەمینیش دەکرێت، بۆیە هەندێ جار لێك جیاکردنەوەی شیعری عیرفانی و ناعیرفانی دەبێتە کارێکی ئەستەم.

زۆربەی لێکۆڵەرانی ئەدەبی کوردی لەسەر ئەوە کۆکن کە مەحوی یەکێکە لە شاعیرانی شیعری عیرفانی لە کرمانجی خوارووودا و چەند نامەیەکی ماستەر و دکتۆرا لەم بارەیەوە نووسراون. لای مەحوی شیعر لە خزمەتی ناوەرۆکدایە و ناوەرۆکیش بریتییە لە بیرە عیرفانی و سۆفیگەرییەکە.

ئەگەر بە وردی لە شیعرەکانی مەحوی بڕوانین دەبینین سیستەمێکی هزری رایەڵەی خۆی بە نێو هەموو شیعرەکانیدا بڵاو کردووەتەوە و ئەم سیستەمەش خۆی لە یەکێتی سەنتەرییەکدا دەبینێتەوە. یار– خودا چەقی ئەو سەنتەرەیە و سەرچاوەی هەموو بوونە و عەشقیش وەگەڕخەری کۆی کایەکەیە، مەحوی دەڵێت:

((مەحویا)) با بەسی بێ شیرکی تەشەببوث بەم و بەو

بگرە دامەنی تەوحیدی (هو الله احد)　　١١٤

ئەم بیرە عیرفانییە ناوەرۆکی بەشی هەرە زۆری شیعرەکانی نێو دیوانی مەحوی پێك دەهێنێت و پێدەچێت شیعر ئامرازێك بێت بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە، ئەوجا چ بە شێوەیەکی راستەوخۆ خرابێتە روو یان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و داپۆشراو لە کاتی باسکردنی هەر بابەتێکی دیکە.

راستە کە عیرفان و تەسەوف یەکێکن لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی شیعری سەبکی عێراقی و لە شیعری عیرفانیشدا خودا وەکو مەعشووقێکی شیعری باسی لێوە دەکرێت بەڵام ئەو پلە بەرزییەی کە مەعشووق بەخشراوە لە شیعری ئەم سەبکەدا ناکرێت تەنیا بدرێتە پاڵ مەعشووقی باڵا، چونکە هەموو شیعری سەر بەم سەبکە عیرفانی نین و ئەم سیفەتە مەعشووقە زەمینییەکانیش لە خۆ دەگرێت (بۆ نموونە نالیش بەو چاوە باڵایە لە حەبیبە دەڕوانێت). مەعشووقی مەحوی بۆ

خۆی مەعشووقێکی باڵاً و ئاسمانییـە و لەگـەڵ ئەمەشـدا هاوشـێوەی ئـەم نەریتـە باوەی سەبکی عێراقی پلە و پایەیەکی نموونەیی و بەرز و باڵای پێ بەخشـیوە لـە شیعرەکانیدا و خاوەن دەسەڵاتێکی بێ وێنەیە و لە بارەیەوە دەڵێت:

قسەی مایەی خرۆشی (نشأتين)ە

دوو عالەم نەشئەجۆشا، لە بیە مەنشەء

بە یادی قامەتی ماوم بە پێوە

(على ما مثلها موسى توكأ) ٤١

لە لایەك عیرفان کە بۆخۆی دینداریـیـەکی عاشـقانەیە و لـە لایـەکی تریشـەوە لیریك و غەزەل کە فۆرم و ناوەرۆکی باوی سەبکی عێراقییە و بە شیعری عاشـقانە ناسراوە، شیعری سەبکی عێراقی کردووەتە شیعرێکی عاشقانە و بـە واتایـەکی تـر عەشق بووەتە سەنتەرێك بۆ ئـەم جـۆرە شـیعرە. ئەگـەر بمانـەوێ بەڵگـە بـۆ ئـەم تایبەتمەندییە لە شیعرەکانی مەحویـدا بێنینـەوە ئـەوا دەیـان نموونـەمان بەرچـاو دەکەوێت کە ناوبراو تێیـدا بـە روونـی ستایشـی عەشـق و کاریگەرییـەکانی عەشـق دەکات، بۆ نموونە دەڵێت:

دڵ زیندووە بە عیشق و، بژیی تۆ لە مەرگ ئەمین

بەم دەردە بمرە، تا ببییە (حي لا يموت) ٨٣

یان دەڵێت:

لەبەر باری مەحەببەت ئاسمان و ئەرز ئەناڵێنن

چییە ئەم دەعوییەت زاهید، جلی لێ بارە گاپێرت ٦٨

لە شوێنێکی ترا دەڵێت:

دڵ لە ئیدراکی حەقیقەت بێ بەشە بێ داغی عیشق

((مەحویا)) دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکا ١٩

چـیرۆکی عەشـق لـە شـیعری سـەبکی عێراقیـدا بـەردەوام بـاس لـە دووری و لێکدابڕانی نێوان عاشق و مەعشووق دەکات، عاشقێك بە هەموو جۆرێك پەیوەستە بــە مەعشــووقێکەوە کــە دوورە لێــی. خوێندنــەوەی هــەر غــەزەلێك بــۆ خــۆی حیکایەتێکە لە دابڕان و دوورکەوتنەوە لـە مەعشـووق. مـەحوی لـە چـەندین دێـڕە

شـیعریدا شـیوەنی فیراقـی خـۆی بـە گـوێی هـەمووان دەگەیـەنێت، و بـۆ نموونـە دەڵێت:

لەو ڕۆژەوە جودا بووە لێم ئەو پەریی وەشە،

ڕۆژم ڕەشە، شوعوور و دڵم لێ بووە جودا ٧

ڕەنگە ئەوەی زیاتر شیوەنی دووریی مەحوی کاریگەرتر کردووە ئەوەبێت کە بـە هـۆی جیـاوازیی تـوخمی و ڕەگەزییـەوە ئەگـەری بـە یەکگەیشـتن و ویسـاڵی ئەستەم بووە و مەعشووق لـە هـەموو بارێکدا ڕێگـەی ژوان بـۆ عاشـق ناکاتـەوە و هەتا نزیکی مەحاڵ ڕێگەی لێ توند دەکات و دەڵێت:

وتی: ((مەحوی)) من و ئافتاب و سایە تیمثالین

جەنابی من کە دەرکەوتم، دەبێ تەشریفی تۆ بڕوا ٣٦

لێرەشـدا شـتێکی سروشـتییە کـە لـە سـایەی ئـەم دابڕانـە و ئـەو بـارە دەروونییەی کە لێوەی سەرچاوە دەگرێت غەم وەکـو تـەمێك بـاڵ بەسـەر شـیعری سەبکی عێراقیدا بگرێت و تەنانەت بە شیعرێکی پڕ لە غەم نـاو ببردرێـت. مـەحوی بە هۆی عەشـق و دووریـی مەعشـووقەوە خـۆی بـە خـاوەنی غـەمێك دەزانێـت کـە هەموو سیفەتەکانی کەسێکی غەمباری لەودا کۆکردووەتەوە و دەڵێت:

لە ئیعجازی مەحەببەت چار فەصڵم جوملە بۆ جەمعە:

سروشکم سوورە، ڕەنگم زەردە، لێوم وشکە، چاوم تەڕ ١٣١

بە جۆرێك لە جۆرەکـان مـەحوی شـیعرەکانی خـۆی بـە غەمنامـەی تایبـەتی خۆی و هاوغەم و هاوڕازەکانی خۆی چواندووە و پێی وایە هەموو کەسانی ئاسایی ناتوانن تێی بگەن و دەڵێت:

لوغاتی ئێمە ناڵە و ئاهە، (قطعاً)

لوغەی وا ناگرێ (برهان قاطع) ١٦٨

بابەتی عەشق و عیرفان بۆخۆیان وەکو دوو بابەتی زاتـی و ویـژدانی بوونەتـە کۆڵەکەی سەرەکی شیعری سەبکی عێراقی، واتە بە پێچەوانەی سەبکی خۆراسانی شاعیران شیعرەکانیان کردووەتە ئاوێنەیەك بۆ تێدا بەدیارخستنی نـاخی خۆیـان و ئەوەی کە لە ناوەوەیاندا روو دەدات وەکو مەحوی دەڵێت:

کە تۆ غایب لە بەرچاوم دەبی، چم بێ لە تۆ غایب

قیامەت حاضری بەرچاومە، خۆمم لە خۆ غایب ٥١

یاخود دەڵێت:

حەیاتی تازە دێتە بەرم و ڕۆحم دەردەچێ، وەرنا

صەدایێکی نییە وەك مەوجی گەوهەر هاتن و چوونت ٧٥

هەریەك لەم نموونانە دیمەنێکن لە واقعی ناوەوەی شاعیر و گوزارشت لە ڕووداوگەلێکی زاتی دەکەن. ئەو خاڵەی کە هەموو بابەتەکانی سەبکی عێراقی لە خۆیدا کۆدەکاتەوە ئەوەیە کە هەر بابەتێك لە چوارچێوەی ئەم سەبکەدا بخرێتە ڕوو سروشتێکی زاتی و ویژدانی پێدەبەخشرێت.

ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە شاعیرانی سەر بەم سەبکە هەرگیز خۆیان لە قەرەی بابەتی دیکە نەداوە، بەڵکو چەندان بابەتی تریش لە پاڵ بابەتەکانی سەرەوەدا بە ڕێژەی کەمتر دەبینرێت و لێرەدا سەبکی عێراقی بەوە لە سەبکی خۆراسانی جیا دەبێتەوە کە لە بابەتە واقیعی و زیندووەکان دوور دەکەوێتەوە ڕوو دەکاتە بابەتە عەقڵی و موجەڕڕەدەکان و مەحویش نموونەی لەم جۆرەی زۆرە و بۆ نموونە دەڵێت:

وەقت و زەمان و حاڵ و جیهەت حادیثن هەموو

خالیق قەدیمە ئەڵبەتە، موستەغنییە لەوان ٣٧٤

هەڵبەتە نابێت ئەوە لە یاد بکرێت کە مەحوی هەندێ کات بابەتی زیندوو وواقیعیشی لە شیعرەکانیدا مەزراندووە بە تایبەتی لە باسی ڕەخنە کۆمەڵایەتییەکاندا.

**سێیەم: سیما ئەدەبییەکان:**

لە بەشی یەکەمدا باس لەوە کرا کە سەبکی عێراقی تەنیا لە ڕەهەندە هزری و زمانییەکەدا لە سەبکەکانی تر جیا نابێتەوە و ئەم سەبکە لە ڕەهەندە ئەدەبییەکەشەوە تایبەتمەندیی خۆی هەیە. کاتێك باس لە وەرچەرخانێکی ئەدەبی دەکرێت گرنگترین خاڵ کە دەبێت بخرێتە ڕوو ئەو سیما ئەدەبییە نوێیەیە کە لە کۆتاییدا بەرهەم هاتووە و بووەتە بەرهەمە نوێیەکەی پێ جیادەکرێتەوە و پێی دەناسرێتەوە.

فۆرم و روخسار بەرچاوترین بەشی تێکستی ئەدەبییە و لێرەوەیە زۆرجار کراوەتە پێوەر بۆ دیاریکردنی ژانری بەرهەمە ئەدەبییەکان و بەواتایەك بووەتە ناسنامە بۆ بەرهەمی ئەدەبی. یەکێك لە جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان سەبکی خۆراسانی و سەبکی عێراقی ئەو گۆڕانکارییەیە کە لە فۆرمی دەقی ئەدەبیدا دروست بووە و شاعیرانی سەبکی عێراقی لە بری قەسیدە کە لە سەبکی خۆراسانیدا باو بوو، غەزەلیان کردە قاڵبی باو لە دیوانەکانیاندا.

مەحوی لە ماوەی هەوڵی ئەدەبیی خۆیدا دیوانێکی شیعری بۆ بەجێهێشتووین کە بە چاوپێداخشانێکی خێرا دەبینین بەشی هەرە زۆری شیعرەکانی لە رووی فۆرمەوە بریتین لە غەزەل و ئەگەر بە زمانێکی وردتریش بڵێین لە کۆی نزیکەی دوو سەد و نەوەد و پێنج پارچە شیعری نێو دیوانەکەی، زیاتر لە دوو سەد پارچەیان بریتین لە غەزەل و ئەودواشی پێکدێن لە کۆمەڵێك چوارخشتەکی و پێنج خشتەکی و چەند تاکێك و چەند قەسیدەیەك، و جێی سەرنجە کە ژمارەی قەسیدەکانی لە ژمارەی پەنجەکانی دەست تێناپەڕن.

رەخنەگرانی بواری ژانرە ئەدەبییەکان رایان وایە هەمیشە جۆرێك لە پەیوەندیی ناڕوون لە نێوان فۆرم و ناوەرۆکدا هەستی پێدەکرێت تەنانەت ئەگەر نەکرێت چۆنیەتییەکەشی دیاری بکرێت[٣١]، ئەمە سەبارەت بە غەزەل و قەسیدەش هەر دروستە. قەسیدە سروشتێکی داستانی هەیە و لە بەرامبەریشدا غەزەل سروشتێکی لیریکی. لە لایەکەوە وەکو ئاماژەی پێکرا بەشی هەرە زۆری شیعرەکانی مەحوی بریتین لە غەزەل و لە لایەکی تریشەوە وەکو لایەنی ناوەڕۆك شیعری زاتی و ویژدانین و بەگشتی لە دەوری عەشق و مەعشووق دەسووڕێنەوە، و هەموو ئەمانەش لە سیما تایبەتەکانی لیریکن. بۆ نموونە مەحوی بەم شێوەیە هەستە زاتییەکانی ناخی خۆی بەرامبەر بە یار دەردەبڕێت و دەڵێت:

(خضر) ئەگەر چاوی حەیاتی بڕییە ئاوی حەیات

من لە خاکی دەری جانانەمە هەر چاوی حەیات ٦٣

لە سەبکی عێراقیدا بەکارهێنانی هونەرەکانی رەوانبێژی لە سنووری چەند هونەرێکدا نەمایەوە و شاعیران هەتا پێیان دەکرا بۆ سەلماندنی وەستاکاریی ئەدەبیی خۆیان سوودیان لە زۆرترین هونەر وەردەگرت. مەحویش یەکێکە لەو

شاعیرانەی کە ئەم فرە ڕەنگییەی بەکارهێنانی هونەرەکانی ڕەوانبێژی لە شیعرەکانیدا بەرچاو دەکەوێت، و وەکو لە دیوانەکەشیدا ئاماژەیان پێکراوە، دەکرێت چەندین نموونە بۆ هونەرەکانی وەکو درکە و دژیەك و ڕەگەزدۆزی و دووبارەکردنەوە...هتد لە شیعرەکانیدا دەستنیشان بکرێت بەلاّم لەبەر دوورنەکەوتنەوە لە بابەتی سەرەکی لێکۆڵینەوەکە (کە بریتییە لە باسی سەبکی عێراقی) تەنیا ئاماژە بە چەند نموونەیەك دەکەین. سەبارەت بە هونەری درکە دەڵێت:

بۆ دووکانی موشتەری گەر حەول ئەدا کالاّفرۆش

دینی وا دێنێتە قیمەت خواجە ئەعضاییی بکا ١٧

لێرەدا وشەی خواجە وەکو لە پەراوێزی دێڕەکەدا نووسراوە درکەیە لە کەسێك ریشێکی هاوشێوەی ریشی جوولەکەی هەبێت بۆ فریودانی خەڵك. سەبارەت بە ڕەگەزدۆزیش لەم دێڕەدا هاتووە:

کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ، دەکەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا

کە خۆ دەرخەی وەکو خۆر دڵ وەکو شەونم لە خۆ بڕوا ٣٥

لێرەشدا لە نێوان هەر دوو وشەی (خۆ) و هەر دوو وشەی (بڕوا)دا ڕەگەزدۆزیی تەواو هەیە. لە بارەی هونەری دژیەکەوە لەم دێڕەدا دژیەك لە نێوان هەر دوو وشەی شەو و ڕۆژدا هەیە کە دووجاریش دووبارە بووەتەوە و لە لایەکی تریشەوە هەر دوو وشەی ڕۆژ بە یەکەوە و هەر دوو وشەی شەو بەیەکەوە دەچنە خانەی هونەری دووبارەکردنەوەوە و دەڵێت:

حەقیە ڕۆژ و شەو کە بێ تابیی دەکا، وادەی ویصال

شەوبو، بێ بەش ما لە وەصڵی ئەو سەراپا جانە ڕۆژ ١٤٠

پاش سەروا، یەکێکی ترە لەو هونەرە شیعرییانەی کە لە سەردەمی سەبکی خۆراسانیدا نموونەی زۆر کەمە، بەلاّم لەگەڵ هاتنی سەبکی عێراقیدا دەبێتە هونەرێکی باو و جێی بایەخی شاعیران و مەحویش ئەم هونەرەی بۆ زیاتر لە یەك لەسەر سێی کۆی غەزەلە کوردییەکانی بەکارهێناوە و چەندین وشەی وەکو چبکا و دەکا و ئەمما و غایب و حەیات و مەست و لە هیچ و ڕۆژ و بە کەس و مەخلووق و شەو لە نوێ و...هتد و بۆ نموونە لەم دێڕەشدا وشەی چبکا دەکاتە پاش سەروا و دەڵێت:

ئەریٚ دڵ بیٚ شەرابی لەعلی گوڵ ڕەنگت لە گوڵ چبکا؟!

کە جیلوەی گوڵ لە گوڵشەندا نەبیٚ، بولبول لە چڵ چبکا؟! ١٣

خاڵێکی دیکەی جێی سەرنج لە تایبەتمەندییەکانی سەبکی عێراقی چەسپاندن و جێگیرکردنی تەخەلوس یان نازناوی شیعریی شاعیرە لە کۆتایی شیعرەکەیدا کە پێشتر ئەم بارە چەسپاوەی نەبووە. لێرەشدا مەحوی هیچ پارچە شیعرێك لە دیوانەکەیدا بەرچاو ناکەوێت کە نازناوی شیعریی خۆی کە بریتییە لە ((مەحوی)) لە کۆتاییەکەی یان لە دێڕی پێش کۆتاییدا تۆمار نەکردبێت، بۆ نموونە دەڵێت:

تا ظولمەتی وجوودە تەریکی لە نووری عیشق.

سێبەر نەما، هەتاوە. کە ((مەحوی)) نەما، خودا ٥

ئەمەش بۆ خۆی دیاردەیەکی گشتگیرە و لە لای هەموو شاعیرانی دیکەی شیعری کۆنی کوردی بەرچاو دەکەوێت و بووەتە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی شیعری کۆن.

**ئەنجامەکان:**

• ڕەنگدانەوەی تایبەتمەندییە سەرەکییە زمانییەکانی سەبکی عێراقی وەکو بەکارهێنانی زمانێکی تێکەڵ بە وشە و پەیڤی زمانی عەرەبی و بە ڕێژەیەکی کەمتریش تورکی لە شیعرەکانی مەحویدا بەرچاو دەکەوێت سەرەڕای هەبوونی چەندین وشە و پەیڤی زمانی فارسی و ئەمە و جگە لە هەبوونی چەندین شیعر بەو زمانانە کە ئەمەیان زیاتر لە ئەدەبی کوردیدا بوونی هەیە. بەکارهێنانی وشە و زاراوەکانی سۆفیگەری و زانستە ئیسلامییەکان و زانستەکانی دیکەش نموونەیان گەلێك زۆرە لە نێو شیعرەکانی مەحویدا و ئەمەش زیاتر شیعرەکانی ناوبراو لە سەبکی عێراقی نزیك دەکاتەوە.

• لە ڕووی ڕەهەندی هزرییەوە مەحوی وەکو یەکێك لە پەیڕەوکارانی سەبکی خۆراسانی بە دیار دەکەوێت چونکە بەشی هەرە زۆری شیعرەکانی بە دەوری سۆفیگەری و عەشق و وەسفی مەعشووقێکی پایە بەرزدا دەسووڕێنەوە و سروشتێکی زاتی و ویژدانی و غەماوییان هەیە و زیاتر باس لە بابەتە عەقڵی و موجەڕڕەدەکان دەکات گەرچی هەندێ کات لەو ڕێڕەوە لادەدات و بابەتی سروشتی و زیندوویش لە شیعرەکانیدا جێدەکاتەوە.

• سەبارەت بە ڕەهەندی ئەدەبیش شیعرەکانی مەحوی ئاوێنەیەکن کە بە وردبوونەوە لێیان وێنەیەکی سەبکی عێراقی لە پشتەوەیان دەبینرێت. مەحویش هاوشێوەی شاعیرانی سەر بە سەبکی عێراقی بیری لیریکی باڵی کێشاوە بەسەر شیعرەکانیدا و فۆرمی باوی نێو دیوانەکەشی بریتییە لە غەزەلێك کە ڕازێنراوەتەوە بە چەندین هونەری ڕەوانبێژیی هەمە ڕەنگ و بەکارهێنانێکی فرەی هونەری پاش سەروا و هیچ شیعرێکیش، غەزەلێك لە دیوانەکەیدا نابینرێتەوە کە ناوی شیعریی خۆی لە دێڕی کۆتایی یان پێش کۆتاییدا تۆمار نەکردبێت.

• بە شێوەیەکی گشتی وەکو لە سەرجەم نموونەکاندا دەبینرێت شیعرەکانی مەحوی لە هەر سێ ڕەهەندی زمانی و هزری و ئەدەبییەوە لێکچوونێکی زۆری لەگەڵ شیعری سەبکی عێراقیدا هەیە و لە هەندێ حاڵەتی کەمدا نەبێت وەکو پەیڕەوکارێکی سەبکی عێراقی بە دیاردەکەوێت.

**پەراوێزەکان:**

(١) بهار و ادب فارسی (مجموعه یکصد مقاله از ملك الشعرا بهار)، بکوشش محمد گلبن، شرکت سهامی کتابهای جیبی، تهران، ١٣٥١، ص١٤١.
(٢) سبك شناسی شعر، دکتر سیروس شمیسا، نشر میترا، چاپ سوم ویرایش دوم، تهران، ١٣٨٦، ص٢١.
(٣) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤.
(٤) ڕەنگدانەوەی سەبکی عێراقی و هیندی لە شیعرەکانی نالیدا، زەینەب جەلیل خەلیل، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠١١، ل ١٧–١٩.
(٥) کلیات سبك شناسی، دکتر سیروس شمیسا، انتشارات فردوسی، چاپ چهارم، تهران، ١٣٧٥، ص١٨٤.
(٦) سبك شناسی شعر، دکتر سیروس شمیسا، ص٢٢٦.
(٧) مقایسه می و معشوق در سبك خراسانی و عراقی، گوهر رستمی نژاد و مقدمه میرجلال الدین کزازی، نشر شاپورخواست، چاپ اول، ١٣٨٨، ص٣٠.
(٨) سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.
(٩) سبك شناسی شعر پارسی از رودکی تا شاملو، دکتر محمد غلامرضایی، نشر جامی، چاپ دوم، تهران، ١٣٨٧، ص١٤٧.
(١٠) سبك شناسی شعر، دکتر سیرس شمیسا، ص ١٨٨–٢٠٠.
(١١) عرفان در غزل فارسی، سید محمد راستگو، انتشارات علمی و فرهنگی، چاپ اول، تهران، ١٣٨٣، ص٥٤–٥٥.
(١٢) بڕوانە: انواع ادبی، دکتر سیروس شمیسا، چاپ نخست ویراست چهارم، نشر میترا، تهران، ١٣٨٣، ص١٣٥
(١٣) سبك شناسی شعر، دکتر سیروس شمیسا، ص٢٤٨.
(١٤) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٨.
(١٥) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٨.
(١٦) سبك شناسی شعر پارسی از رودکی تا شاملو، دکتر محمد غلامرضایی، ص١٤٧.
(١٧) سبك شناسی شعر، دکتر سیروس شمیسا، ص٢٤٨.
(١٨) انواع ادبی، دکتر سیروس شمیسا، ص١٢٧–١٢٨.
(١٩) سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٥.
(٢٠) سبك شناسی شعر پارسی از رودکی تا شاملو، دکتر محمد غلامرضایی، ص١٤٧.

(٢١) واژنامە هنر شعری – فرهنگ تفصیلی اصطلاحات فن شعر و سبك ها و مكتب های أن، میمنت میرصادقی، کتاب مهناز، چاپ سوم ویراست سوم، تهران، ١٣٨٥، ص١٥١.
(٢٢) سبك شناسی شعر پارسی از رودكی تا شاملو، دكتر محمد غلامرضایی، ص٥٥.
(٢٣) واژنامە هنر شعری–فرهنگ تفصیلی اصطلاحات فن شعر و سبك ها و مكتب های أن، میمنت میرصادقی، ص٧٠.
(٢٤) سبك شناسی شعر، دكتر سیروس شمیسا، ص٢٤٨.
(٢٥) ڕەنگدانەوەی سەبکی عێراقی و هیندی لە شیعرەکانی نالیدا، زەینەب جەلیل خەلیل، ل٤.
(٢٦) بڕوانە: سبك شناسی شعر، دكتر سیروس شمیسا، ص٢٠٩ و ٢٣٢.
(٢٧) دیوانی مەحوی[*]، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مدەرس و محەمەدی مەلا کەریم، انتشارات کردستان، چاپی یەکەم، سنندج، ١٣٨١، ل٤٦٨–٥٤١.
(٢٨) مەحوینامە، پ.د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، چاپخانەی منارە، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل٤٧.
(٢٩) سۆفیگەری، د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، دەزگای موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٣٤٣–٣٥٦.
(٣٠) مەحوی– بەشێك لە بابەتەکانی ڤستیڤاڵی مەحوی، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٩.
(٣١) انواع ادبی، دكتر سیروس شمیسا، ص٢٢.

[*] ژمارەکانی بەرامبەر دێرە شیعرەکان ئاماژەن بۆ لاپەڕەکانی دیوانی مەحوی.

## سەرچاوەکان:


### یەکەم: سەرچاوە کوردییەکان

- دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مدەرس و محەمەدی مەلا کەریم، اتشارات کردستان، چاپی یەکەم، سنندج، ١٣٨١.
- سۆفیگەری – شیعری ئاینی و سۆفیگەری لە شیعرە کوردییەکانی مەحویدا، د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان، دەزگای موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٨.
- مەحوی– بەشێك لە بابەتەکانی ڤستیڤاڵی مەحوی– هەولێر ٢٠٠١ ، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١.
- مەحوینامە، پ.د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان، چاپخانەی منارە، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٠.

### نامە ئەکادیمییەکان:

- رەنگدانەوەی سەبکی عێراقی و هیندی لە شیعرەکانی نالیدا، زەینەب جەلیل خەلیل، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠١١.

### دووەم: سەرچاوە فارسییەکان

- انواع ادبی، دکتر سیروس شمیسا، چاپ چهارم ویراست چهارم، نشر میترا، تهران، ١٣٨٣.
- بهار و ادب فارسی (مجموعه یکصد مقاله از ملك الشعرا بهار)، بکوشش محمد گلبن، شرکت سهامی کتابهای جیبی، تهران، ١٣٥١.
- سبك شناسی شعر، دکتر سیروس شمیسا، نشر میترا، چاپ سوم ویرایش دوم، تهران، ١٣٨٦.
- سبك شناسی شعر پارسی از رودکی تا شاملو، دکتر محمد غلامرضایی، نشر جامی، چاپ دوم، تهران، ١٣٨٧.
- کلیات سبك شناسی، دکتر سیروس شمیسا، انتشارات فردوسی، چاپ چهارم، تهران، ١٣٧٥.
- عرفان در غزل فارسی، سید محمد راستگو، انتشارات علمی و فرهنگی، چاپ اول، تهران، ١٣٨٣.
- مقایسه می و معشوق در سبك خراسانی و عراقی، گوهر رستمی نژاد و مقدمه میرجلال الدین کزازی، نشر شاپورخواست، چاپ اول، ١٣٨٨.
- واژنامه هنر شعری– فرهنگ تفصیلی اصطلاحات فن شعر و سبك ها و مکتب های أن، میمنت میرصادقی، کتاب مهناز، چاپ سوم ویراست سوم، تهران، ١٣٨٥.

**ملخص البحث**

ان مصطلح ((السبك)) في اللغة الفارسية يأتي مقابل مصطلح الاسلوب في اللغة العربية. يقسم الادب الفارسي على ثلاثة مدارس من حيث الاسلوبية: السبك الخراسانى، السبك العراقي والسبك الهندي. يعتبر السبك من الخصائص اللغوية والفكرية والادبية الذي يسيطر على الادب وشعر الشعراء، في هذا المنظور يظهر تاثير الادب الفارسي القديم على الادب الكوردي القديم وحدد في هذا البحث انعكاس خصائص السبك العراقي على اشعار الشاعر الكوردي ((محوي)).

وقسمنا البحث الى قسمين، في القسم الاول تحدثنا عن السبك العراقي بشكل نظري وخصوصيات هذا السبك. وفي القسم الثاني حددنا انعكاسات هذا السبك وخصوصياته عند الشاعر وكيفية استعمالاته الخاصة لهذا السبك.

## Abstract

In Persian language the term" Sabik" is used to mean style, and in stylistic Persian old literature is divided in to three schools; Khorasani sabik, Iraqi Sabik and Indian Sabik. Sabik is the language, idea and literary futures that covered the literature and poetry of a poet in a specific period of time. Seeing that Kurdish old literature is affected by Persian old literature, so this paper focuses on figuring out the influences of Iraqi Sabik School on Mahwy's poems.

# ڕاپۆرتی کارگێڕی دەربارەی لیوای هەولێر لە ساڵی ١٩١٩ دا

**وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە: د. شەماڵ حەوێزی**

سەرچاوە: ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا*

لیوای (Division) هەولێر[1] لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٩ لە هەر سێ ناوچەی (District) هەولێر، کۆیە و ڕواندز پێکهات. هەولێر پێشتر سەر بە موسڵ بوو، کۆیەش سەر بە سلێمانی و ڕواندزیش سەربەخۆ بوو. سەرپەرشتی کردنی گومرگی ناوچەی ڕانیەش بە حاکمی سیاسیی هەولێر سپێردرا، بۆ ئەوەی هەماهەنگی نێوان هەردوو لای زێ ڕێکتر و کاریگەرتر بێت. سنووری لیواکە بەم شێوەیە بوو:-

بە چیای گێدك (Gedik Dagh)، لە گۆشەی باکووری ڕۆژهەڵاتی بە درێژایی سنووری ئێران دەستپێدەکات تاکو چیای قەندیل (سەرچاوە: Asia 1: 1,000,000Tabriz Sheet)، دواتر بەرەو ڕۆژئاوا تا چیای کۆ (Kola Dagh) (سەرچاوە: نەخشەکانی سەرەوە Sheet 3) دەڕوات تا دەگاتە شاخی مامەڕووتە (سەرچاوە: Sheet 3) دوایی هێڵی سنوورەکە بە درێژایی لووتکەی مامەڕووتە بەرەو باشوور شۆڕ دەبێتەوە تا چیای کارۆ (Karo Dagh) و چیای گورمەندان (Gurmanjan Dagh)، ئینجا تا ئەو کانییانەی کە بە ژمارە ٣٦ خاڵبەندی کراوە ٤٤-٤٩ پێ هەموو گوندەکانی پشتگەلی (پشتگەلی تیرەیەکی عەشیرەتی خۆشناوە - وەرگێڕ) لە خۆ دەگرێت، هەروەها بەرەو ڕۆژئاوا، گردۆڵکەکان لە خۆ دەگرێت بە سکتان و حاجییاوە، لە باشووریش تا ئەو شوێنەی ڕێگەی کۆیە و ڕانیە یەکتر دەبڕن، لە هەیبەسوڵتانیشەوە تا زێی بچووك. دواتر بە درێژایی زێی بچووك بە گوندی عەتیراوە، (نەخشەی ژمارە: 138 M/NE/34d)، دواتر هێڵەکە بەرەو ڕۆژئاوا و باکوور دەچەمێتەوە تا لەگەڵ زێی گەورە و دجلە لێکدەداتەوە، بەڵام ناوچە کشتوکاڵییەکانی عەرەبەکانی کەناری زێ ناگرێتەوە، تەنیا ناوچە

کشتوکاڵییەکانی کوردەکانی دەشتی قەراج لە خۆ دەگرێت. بە درێژایی زێی گەورە بەرەو باکوور تا ڕووباری ڕۆکووچوك و دواتر تا ئەو شوێنەی لەگەڵ ویلایەتی وان (Van Wilayat) یەکتر دەبڕێت (سەرچاوە: Asia 1: 1,000,000Tabriz Sheet) و دواتر بەرەو ئەو خاڵەی کە دەگاتە سەر سنووری ئێران. لیوایەکە لە کاتێکی زۆر درەنگی ساڵ پێکهات، بۆیە باشتر وایە ڕاپۆرتی هەر یەکێك لەو سێ ناوچەیەی لیوایەکە پێك دەهێنن، بە جیا پێشکەش بکرێت (دوایی هەر واشیلێهات ڕاپۆرتی هەولێر و کۆیە و ڕواندز هەر یەکێك بە جیا ئامادە و پێشکەش کرا – وەرگێڕ).

**میجەر دەبلیو. ئاڕ. هەی**
**نووسینگەی حاکمی سیاسی هەولێر**

## ڕاپۆرتی کارگێڕی ناوچەی هەولێر

بەریتانیا لە ڕێگەی کاپتەن هەی لە ١١- ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ دەستی بەسەر هەولێردا[٣] گرت، لە ١٣ تشرینی دووەم کاپتەن ئێس. ئۆ. موری (ئێستا مێجەرە) بووە حاکمی سیاسیی هەولێر و قەزای[٣] هەولێریش کرایە ناوچە (District) و خرایە سەر لیوای موسڵ، مێجەر ئێس. ئۆ. موری لە ١٤- ی تەمووزی ١٩١٩ ڕۆیشت و کاپتەن دەبلیو. ئاڕ. هەی هاتە شوێنەکەی. لە یەکی تشرینی دووەمی ١٩١٩- وە، هەولێر بووە ناوەندی لیوایەکی نوێ و کۆیە و ڕواندزیشی دەگرتە خۆ. کاپتەن هەی کرایە حاکمی سیاسی (P. O.) و بە شێوەی کاتیش پلەی مێجەری پێدرا. کاپتەن جەی. ئاڕ. ئێڵ. بڕادشۆ، لە ٢٠- ی شوباتی ١٩١٩ تاکو ١٣- ی حوزەیران ١٩١٩، هەروەها لە ٦- ی تشرینی یەکەمەوە تاکو ئێستا یاریدەدەری جێگری حاکمی سیاسی یان حاکمی سیاسییە (P. O.)، لیفتنانت ئەی. دەبلیو. کیرتن لە ماوەی ٢٦- ی ئابی ١٩١٩ تاکو ٥- ی تشرینی یەکەم کرایە یاریدەدەری جێگری حاکمی سیاسی.

لەم ڕاپۆرتەدا ناوچەی هەولێر بە هەمان سنووری قەزا کۆنەکەی سەردەمی حوکمڕانیی تورکەکان (ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی - وەرگێڕ) مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، بەڕەچاوکردنی دابڕینی هەندێك گوندی لای ڕاستی کەناری زێی گەورە و لکاندنی هەندێك گوندی کەناری ڕاستی زێی بچووك. لە دوای داگیرکردنمان (مەبەستی داگیرکردنی باشووری کوردستانە لە لایەن بەریتانیاوە - وەرگێڕ)، هەردوو ناحیەی دێرێ[٤] ( سەر بە ڕواندز) و شەقڵاوە (سەر بە کۆیە) بۆ ماوەیەکی کورت سەر بەم ناوچەیە بوون، دواتر هەردوو ناحیەکە لکێندرانەوە (یەکەمیان بە قەزای ڕواندز و دووەمیشیان بە قەزای کۆیە - وەرگێڕ). لە کاتی پێکهێنانی لیوایە نوێیەکە، گوندە عەرەبەکانی کەنار دجلە و بەشی خوارەوەی زێی بچووك بە لیوای موسڵ لکێندران. لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، زەوییەکانی سەنییەی[٥] گوێڕ و مەخموور، لە ڕووی داهاتەوە سەر بە موسڵ بوون، بەڵام لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە هەولێر بوون. سنووری ئەم ناوچەیە (District) لە ڕۆژهەڵاتەوە چەمی بەستۆڕە و شاخی دێدەوانە و باشووریشی زێی بچووکە (جگە لە پردێ و دەشتەکەی)، دجلە سنووری ڕۆژئاوایەتی و باکووریشی زێی گەورەیە.

بەشی هەرە زۆری ناوچەکە دەشتاییە و زوورگەکان (لێواری بەردینی نزم) شەقار شەقاری دەکەن، تا دەگاتە زنجیرە شاخێکی ڕاستەقینە لە ناوچەکەدا، ئەویش چیای قەرەچووغە کە ٢٨٠٠ پێ بەرزە. لە ڕۆژهەڵاتەوە بە زەوی بەردەلانی بەرز و نزم لە لای چەپی کەناری چۆمی بەستۆڕە و بناری ڕۆژئاوای چیای دێدەوان دەستپێدەکات. لەو پێدەشتەدا ژمارەیەك کانی هەیە باخەکانی میوەجات و چەند دارێك ئاو دەدات. بەرەو ڕۆژئاوا دەشتی بەناوبانگی هەولێرە، خاکێکی بە پیت و فراوانە و بەرز و نزمییەکی کەمی هەیە، لێرە و لەوێش قوللەی کۆنی ئاشووری بەدی دەکرێن. ئەم سەرزەمینە بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر ڕووتەنە، بە فیعلی سەرجەم زەوییەکان بۆ چاندنی گەنم و جۆ تەرخانکراون. کارێزەکان سەرچاوەی ئاوی ئەم ناوچەیەن، زۆربەی هەرە زۆری ئاوەکەش بۆ چاندنی برنج بەکار دێت، ئینجا دەشتەکە بەرەو باکوور دەکشێ تا دەگاتەوە شاری هەولێر، زوورگی چالووك سنووری باکووری دەشتی هەولێرە و زوورگە زراویش سنووری ڕۆژئاوایەتی. ناحیە بەپیتەکەی گوێڕ دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوا و ناوچەیەکی دەشتاییە زۆربەی دەکەوێتە کەناری زێی گەورە. دوو ڕووباری بچووك لەم ناحیە هەن، کە ئاوی کشتوکاڵی هاوینە دابین دەکەن. لە گوێڕیش ژمارەك چاڵە نەوت هەن دەکەونە قەراغ زێیەکە. لە دوای زوورگەزراو، دەشتی کەندێناوە دێت، سەرزەمینێکی ڕووتەنە، خەڵکی ناوچەکە بۆ ئاو پشت بە باران و بیرەکان دەبەستن. دواتر چیای قەرەچووغ دێت کە دەبێتە دوو بەشی گەورە، دوای ئەویش دەشتی قەراجە کە تاکو دجلە و زێی گەورە درێژ دەبێتەوە. مەخموور کە گوندی سەرەکیی ئەم ناوچەیەیە، دەکەوێتە پانتایی نێوان هەردوو بەشەکەی چیای قەرەچووغ، قەراج زۆر ڕووتەن و تەختە، تاکە دڵنەواییەکەشی شوێنەواری شارە وێرانەکان و کەناڵە پەککەوتووەکانە. کشتوکاڵێکی زۆر لە هەردوو کەناری دجلە و زێی گەورە دەکرێت. کەشوهەوای ناوچەکەش وەك کەشوهەوای ناوچەکانی تری باشووری ویلایەتی موسڵە. باران لە نیوەی دووەمی مانگی تشرینی دووەم دەست پێدەکات و تا کۆتایی مانگی نیسان بە شێوەی پچڕ پچڕ بەردەوام دەبێت. ڕێژەی باران بارین لە گوێڕ و مەخموور زۆر لە ڕێژەی ئەو زەوییانەی نزیکی چیاکانن کەمترە. ڕێژەی باران بارین نازاندرێت، بەڵام لە بەشی

ڕۆژهـەڵاتی ناوچـەکە تـا ڕادەیـەك هەمیشـە بـارانی پێویسـت بـۆ مسـۆگەرکردنی داهاتێکی باش هەیە. تاکو مانگی حوزەیران هەوا گەرم نابێت، لـە هـەردوو مـانگی تەمووز و ئابدا بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك گەرمایەکی نالەبار هەیە. هـەوای مـانگی پایز پیس و ناتەندروسـتە، هەنـدێ جـاریش گـەردەلوولێکی تونـد هەڵـدەکات، کـە کوردەکان پێی دەڵێن "ڕەشەبا".

سـەرجەم دانیشـتوانی هـەولێر دەوروبـەری ٦٠٠٠٠ هـەزار کەسـە، بـریتین لـە ٥٥٠٠٠ موسوڵمان و ٢٥٠٠ جوولەکە و ١٥٠٠ مەسیحی و ١٠٠٠ کاکەیی.

من ئێسـتا زۆر بـە دوورودرێـژی شـاری هـەولێر و هـەر پێـنج ناحیەکـە، واتـە هەولێر، گوێڕ، قوشتـەپە، کەنـدێناوە و مـەخموور وەسـف دەکـەم، کـە لـە بەشـی زۆری ساڵی ١٩١٩ دا (نزیکـەی ١٠ مـانگ – وەرگێـڕ) ناوچـەکەیان بەسـەر دابـەش کرابوو.

### شاری هەولێر

شاری هەولێر ڕوخسارێکی بێ هاوتای هەیە، بەشی سەرەکی شارەکە لە سەر قەڵایەکی بازنەیی دروستکراوە کـە بەرزییەکـەی نزیکـەی ١٥٠ پێیـە، وا پێدەچـێت قەڵایەکی زۆر قایم بێت، دیواری لای دەرەوەی خانووەکان بـەرز و زۆربەشـیان بـێ پەنجەرەن، بەڵام هەندێك ئاغای دەوڵەمەند باڵکۆنیان بۆ خۆیان دروست کـردووە. قەڵات[٦] تەنیا دوو دەرگای بۆ چوونە ژوور و هاتنەدەرەوە هەیـە، خانووەکـان بـە شێوەیەکی باش لە کـەرپووچ دروسـت کـراون، دیوەخانـەی ئاغـا دەوڵەمەنـدەکان بەشـــی زۆری لـــە مەڕمـــەڕ دروســـت کـــراون. شـــەقامەکان زۆر زبـــر و تەســـکن. دەوڵەمەندەکان لە سەر قەڵات دەژین، دانیشتوانی ئـەم بەشـەی شـارەکە نزیکـەی ٦٠٠٠ کەسە، کەسیان هەژار نین و بەشـێکی زۆریـان زۆر دەوڵەمەنـدن، زۆربەشـیان تورکمـانن. هـەروەها کۆمـەڵێك خـانووش لـە دامێنـی قـەڵات لـە لای ڕۆژهـەڵات و باکوورەوە هەن، دانیشتوانەکەشی بەشێکی تورکمانە و بەشەکەی تریشی کـوردە، هەروەها لەم شوێنە بـازاڕێکی زۆر فـراوان هەیـە. دوو قەیسـەری هەیـە، دووشـیان وێرانن و ئومێد دەکرێت ساڵی داهاتوو چاك بکرێنەوە. زۆربەی دووکانەکانی تـر لـە شـێوەی پێشـهەیوانن (Stall)، دووکانـدارەکان هـەموو بەیانییـەك کەلوپەلـەکانیان

دەهێننە دەرەوە و شەویش لە خانەکان تەقەتیان دەکەن، بازاڕ پڕ لە کەلوپەلە، دەگوترێ کە لە ڕووی شتومەکەوە لە بازاڕی موسڵ دەوڵەمەندترە. ژمارەیەکی زۆر کورد لە شوێنە دوورەکانەوە ڕوو دەکەنە ئەم بازاڕە بۆ شتومەك کڕین. ڕواندز وێرانەیە[٧]، تەنانەت خەڵکی نەهریش[٨] (Neri) شەکر و چایان بۆ ئەو لێقەوماوانە ڕەوانەی هەولێر کرد.

ژمارەی تێکڕای دانیشتوانی شارەکە نزیکەی ١٤٠٠٠ کەسە و بەشی هەرە زۆریان ژنیان لێك خواستووە، وا پێدەچێت سێ لە سەر چواریان کورد بن و زمانی تورکی بەکار دێنن، حسابکردنی نفووسی تورکمانە ڕەسەنەکان (Origin) زەحمەتە، بە شێوەیەکی گشتی وا پێدەچێت کە ئەم شارە سەنگەری پێشەوەی سەلجووقییەکان بووبێت. چونکە داب و نەریتە خۆجێیەکان (Local tradition) پێمان دەڵێن کە خەڵکێك بە زۆر لە وڵاتی فارسەوە (ڕەنگە لە ئازەربێجانەوە) لە لایەن نادر شاوە[٩] بۆ شاری هەولێر ڕاپێچ کرابن. ڕەچەڵەکیان هەر چییەك بێت، ئەربیللی بووەتە نیشانە و هێمایەکی جموجۆڵی بە جۆش و خرۆش و خووڕەوشتە بەرزییەکەیان. کەسایەتییە ناسراوەکان بە شێوەیەکی نائاسایی ڕووناکبیرن و بە باشی لە سیاسەتەکانی ئەورووپا ئاگادارن. گرنگییەکی ڕاستەقینە بە داهێنان دەدەن و زۆریش بە پەلەن بۆ دەستەبەرکردنی ئەم پەروەردە نوێیە ڕاستە بۆ منداڵەکانیان، زۆر لە دەمارگیریی ئاینییەوە دوورن. مەلا فەندی[١٠]، پیاوێکی ئاینیی ناودارە و بە شێوازی ئەورووپییانە هەڵسوکەوت دەکات.

جگە لەو ٣٠٠ خێزانە جوولەکەیەی کە وەك ئەوانەی شوێنەکانی تر زۆر دەوڵەمەند نین، دانیشتوانەکەی تری شار موسوڵمانی سونە مەزهەبن، ١٦ مزگەوت هەیە، هەروەها ژمارەیەك پیاوی ئاینی بە ناوبانگی لێیە، کە بە هۆی تەقوا و پارێزییان لە تام و چێژی دونیا ناوبانگییان بەشێوەیەکی فراوان و لە ناوچە دوورەکانیشەوە دەرکەوتووە. مەلا فەندی، شێخ جەمال و شێخ ساڵح پیاوە هەرە ناودارەکانی هەولێرن. زۆر بە دەگمەن دەبینین پیاوی موسوڵمان لەیەك کاتدا زۆر دڵسۆزی ئاینەکەی خۆی بێت و بەرامبەر ئاین و داب و نەریتە بیانییەکانیش زۆر لێبووردە بێت.

لە دووری ٣ میل لە هەولێر گوندی عەنکاوە هەیە، کە نزیکەی هەزار کەسی کلدانی تێدا دەژیت، هەموویان جووتیارن و جلوبەرگی کوردیش دەپۆشن. زەوییەکانی گوندەکە بە پیت و فراوانن، کەنیسەیەکی کۆن و گەورەشی لێیە، لەلایەن ٥-٦ قەشە خزمەت دەکرێت، قەشەکان بەڕادەیەك خەڵکیان بریندار کرد و کاری وایان کرد، ئابڕووی ئاینەکەی خۆیان برد. بەشێك لە خەڵکی عەنکاوە زۆر دەوڵەمەندن، بەتایبەتیش خواجا شابۆ و خواجا سیبی، هەردووکیان دوو پیرەمێردی لەڕادەبەدەر جوان و ئێسك سووکن و لە ڕێگای ژنخواستنەوە لەگەڵ هەندێك خێزانی ناوداری موسوڵمانی هەولێر تێکەڵییان هەیە. مەسیحییەکانی عەنکاوە باشترین پەیوەندییان لەگەڵ خەڵکی هەولێردا هەیە، تەنیا قەشەکان نەبن کە بەردەوام بوختان بۆ دراوسێ موسڵمانەکانیان هەڵدەبەستن. هەولێر پیشەسازییەکی خۆجێی بەرچاوی نییە. چەرم خۆشکردن، جۆلایی، خوری و پەمۆ چنین و خمچی بەشێکی زۆری پیشەسازیی دەستی پێکدێنن، بەڵام تەنیا بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ناوخۆیە. لە ڕاستیدا گرنگیی ناوچەکە لەوەدایە کە ناوەندێکی مەزنی دانەوێڵەیە، هەروەها بازاڕی ئاڵوێرکردنی هاوردەی ئەورووپا و کاڵاکانی بەغدایە لەگەڵ کەلوپەلە خاوەکانی ناوچە شاخاوییە کوردییەکان وەك خوری، تووتن، مازوو، بنێشت، مێوە، هەنگوین، دار، تاد. بازرگانی لەگەڵ ئێرانیش قەوارەیەکی بەرچاوی هەیە، گرنگترین و سەرەکیترینیان مافوور، سەماوەر، چەرم، تاد.

لە نێوان کەسایەتییە ناودارەکانی هەولێر دەکرێ ئاماژە بەوانە بکەین:

مەلا فەندی — پیاوێکی ئاینییە و کاریگەرترین کەسی شارەکەیە، ئیمام و خاوەنی گەورەترین مزگەوتی شارە. بنەماڵەکەی بەوە ناسراوە کە هەرگیز ئازاری کەسیان نەداوە، هیچ کەسیش ئازاری نەداون. هەرچەندە خاوەن باوەڕێکی ئاینیی پتەوە، بەڵام خاوەن بیروڕای پێشکەوتوو و لیبڕاڵە و ئازادانە لە بابەتەکانی وەك بنەمای مونڕۆی، سەربەخۆبوونی چیکۆسلۆڤاکیا دەدوێت. ئەو هەر لە سەرەتاوە پشتگیرییەکی شێلگیرانەی لە حکومەت[11] کرد، پشتیگیرییەکی بەهێزیشی لە خەڵکی کرد لە دژی ئاغا زۆردارەکان. لە کاتی وتووێژکردن لەگەڵیدا پیاوێکی زۆر خۆشمەشرەب و قسەخۆش و ڕەوشت بەرزە.

ئەحمەد ئەفەندی[١٢] — سەرۆکی شارەوانی و ئامۆزای مەلا فەندییە. خاوەن وزە و توانایەکی لەڕادەبەدەرە، بە پابەندبوون و دڵسۆزیی شێلگیرانەی بۆ ڕاستی سەلماندوویەتی کە بێگومان کەسایەتییەکی زۆر بایەخدارە. بەردەوام داوای ڕێنماییەکانی ئەو دەربارەی کاروبارە سیاسییەکان دەکرا و پەسەند دەکرا. لە کەس نەدەترسا و ژمارەیەك ئاغای دەسەڵاتدار ڕکیان لێ دەبۆوە، بەهۆی ئەو زانیارییە کەمەی دەربارەی گشت ڕووداوەکان پێشکەشی دەکرد.

سەید عەبدوڵڵا پاشا — نەقیب و پێشەوای سەیدەکانی هەولێرە، گرنگییەکی زۆر بە پرسە ئایینییەکان نادات. ئەو کەسێکی دەوڵەمەندە و تێبینیی ئەوەی لەسەرە کە پیسکەیە (ڕەزیلە). بە هەرحاڵ تەنیا ئەم خاڵە لاوازەی پێوە دیارە. ئەو لایەنگری حکوومەتی ئێستایە.

عەلی پاشا دۆغرەمەچی — وەك ئەوانەی پێشتر ئاماژەیان پێکرا، پێشکەوتنێکی بەرچاوی تێدا بەدی دەکرێت لە توانای وەرگرتنی کولتووری ئەورووپایی، خاوەن ڕەوشتێکی زۆر جوانە، عەلی پاشا سامانەکەی خۆی لە کاتی شەڕدا (شەڕی یەکەمی جیهان — وەرگێڕ) پێکەوەنا و حکوومەتی عوسمانیش پشتیوانی لێدەکرد، ئەو بۆ ماوەی چەند مانگێك بە ئاشکرا بەرهەڵستکاری دەسەڵاتی بەریتانیا بوو، بەڵام دواتر وەك خۆی ڕایگەیاند تێکەڵی هیچ پرۆپاگەندەیەکی دژ بە بەریتانیا نەبووە، لە ڕاستیدا پێموایە ئەو دڵسۆزی سیستەمی تازەیە.

حاجی ڕەشید ئاغا — سیفاتی زۆری هەیە، ئەو پڕ بە پێست نموونەی ئاغایەکی خراپە و لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بەردەوام داوای هاتنی بەریتانیای دەکرد، کەچی ئێستا تورکەکانی دەوێت. تەنیا خەریکی کۆکردنەوەی پارە و پوولە بە هەر ئامرازێك بێت. خۆی و کوڕەکەی لە ناوچەی خۆیان بە شێوەیەك لە شێوەکان تێوەگلاوی هاندانی ئاشووبن.

محەمەد عەلی ئاغا — گەورەترین موڵکدارە و خزمی مەلا فەندییە. هەروەها پیاوێکی خۆشمەشرەب و ڕووخۆش و دەم بە پێکەنینە، بە باشی مامەڵە لەگەڵ ڕای گشتی دەکات و پشتیوانێکی بەهێزی حکوومەتە.

عەبدولڕەزاق ئاغای عوزێری — تەمەنی لە سەرووی ٩٠ ساڵە، بنەماڵەکەی لە سەردەمی عوسمانییەکاندا تێبینی زوڵمکردن و پێشێلکردنی قانوونی لەسەر بوو، حاجی سوداد ئاغای برازای ٥ ساڵە لە زیندانە، ئەو لەو کاتەدا گیرا کە عەبۆ ئاغای عوزێری چالاکترین پیاوی یاخیبووی ناوچەکە بوو.

هەولێر گرنگییەکی گەورەی مێژوویی و ئارکیۆلۆجی هەیە. لە لایەن ئاشوورییەکان بە شارێکی پیرۆز ناوبانگی دەرکردبوو. پاشاکان دوای سەرکەوتن دەهاتنە ئەم شارە، تاکو سوپاسگوزاری خۆیان پێشکەش بکەن، ناوی شارەکە (ئەربێلا) بە ١٥ شەرگەی مەزنی دنیا بەخشراوە. مەزەندە دەکرێت پاشماوەی پەرستگای عەشتار لە سەر گردۆڵکەیەك بێت لە دەرەوەی شار. لەو شوێنەی شارەکەی لێ دروستکراوە گردێکی بازنەیی (قەڵات — وەرگێڕ) هەیە، ڕەنگە ژمارەیەکی بێشوماری خەزنەی ئارکیۆلۆجی تێدابێت. لە ڕۆژئاوای شارەکە منارەیەکی[١٣] (منارەی چۆلی — وەرگێڕ) کۆنی جوان هەیە بەرزییەکەی ١٢٥ پێیە و بۆ سەردەمی خەلافەتی عەباسی (میرنشینی ئەتابەکی) دەگەڕێتەوە، ئەمەش باس لەوە دەکات کە ناوەندی شارەکە لێرە بووە و دواتر گواستراوەتەوە بۆ سەر قەڵات[١٤].

### ناحیەی هەولێر

ناحیەی هەولێر ٦٥ گوند لەخۆ دەگرێت. نیوەی بەشی باکووری زەوییەکی بەرز و نزمە و بەرد و چەوێکی زۆری هەیە، بەڵام ئەو بەشەی دەکەوێتە باشووری شاری هەولێر دەشتێکی دەوڵەمەند و بەپیتە، دانیشتوانەکەی هەموو کوردن، ئەو ٢٠ گوندەی بەشی باکوور کە دەکەونە سەر بەستی بەستۆڕە گەردیین، ئەو گوندانەشی کە دەمینێتەوە نزیکەی هەمووی بۆ ژمارەیەك کەسایەتی ناوداری هەولێر دەگەڕێتەوە، دانیشتوانەکەشی بریتین لە جووتیاری هۆزەکانی گەردی[١٥]، دزەیی، شێخان و هۆزەکانی تر. ماوەیەکی دوورودرێژە هیچ پەیوەندییەکی عەشایرییان لە نێوانیاندا نەماوە. پێنج شەش گوند هەن لەم ساڵانەی دوایی لە لایەن هەندێك ئاغای دزەییەوە دەستیان بەسەردا گیرا. وا پێدەچێت نزیکەی هەموو گوندەکانی ئەم ناوچەیە لە ڕووی عەشایرییەوە یان سەر بە هۆزی گەردین یان سەربەخۆن. تەنانەت لەماوەی ئەم نیو سەدەیەی دواییدا ئاغاکانی هەولێر بە

یارمەتی مەئموورەکانی تاپۆ ژمارەیەکی زۆر زەوییان لەسەر خۆیان تاپۆ کردووە. زەوییەکی بێشومار هەیە کە جێگەی مشتومڕی نزیکەی هەموو گوندنشینەکانی ئەم گوندانەیە. هەروەها زەوییەکی زۆریش موڵکی حکوومەتە.

لە گۆشەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ناحیەکە ژمارەیەك گوندی بناری شاخی دێدەوان هەن لە بنەڕەتدا لە لایەن محەمەد ئاغای باوکی سواراغای بلْباس دەستیان بەسەردا گیرابوو، بەڵام دوای ئەوەی ئەم بەشەی بلْباسەکان ڕەویان بەرەو ڕانیە کرد، ئەم گوندانە چۆڵ بوون یان بەشێوەیەکی پچڕپچڕ ئاوەدان بوون. ئێستا ژمارەیەکی کەم بلْباس ماونەتەوە، وەك تاقمێکی توند و تووش دێنە بەرچاو.

عەشیرەتی گەردی گرنگی خۆی هەیە، چونکە دەتوانێت سەد تا دووسەد چەکدار کۆکاتەوە، کە لە ٥٠٠ چەکداری هۆزەکانی تری ناوچەکە باشترن. لە دێر زەمانەوە دزەییەکان لە پەناگەیەك دەگەڕان. باپیری جەمیل ئاغای (جەمیل ئاغای گەورەی گەردی – وەرگێڕ) لە کەندیناوا نیشتەجێ بوو و بووە پشتیوانی کوردەکان لە دژی هۆزی عەرەبی تەی[16]. کاکل ئاغای[17] کوڕی لەسەر زەوییەکانی پیرزین لەگەڵ دزەییەکان بەشەڕ دێت، ٢٠٠ گەردی بەرگری دەکەن و ٢٠٠٠ دزەیی ناچار دەکەن پاشەکشە بکەن ( ڕەنگە وسووی کاکە خانیش هەر لەم شەڕەدا کوژرابێت – وەرگێڕ). جەمیل ئاغای گەردی شوێنی کاکل ئاغا دەگرێتەوە، مەجید ئاغای برا گەورەی جەمیل ئاغا لە دێرێ دەژی و لە لایەن عەشیرەت خۆشەویست نییە. جەمیل ئاغای گەردی لە ناوەڕاستی تەمەندایە، پیاوێکی کەتە و قەڵەوە، هەرچەندە تەنیا زمانی کوردی دەزانێت، بەڵام بیروڕاکانی لە زۆر سەرۆك عەشیرەتەکانی تر پێشکەوتووترە. لە سەردەمی عوسمانییەکان بەوە ناسرابوو کە وەلای بۆ حکوومەت (بەریتانیا – وەرگێڕ) هەبووە، تاکو ئێستاش هەمان کەسایەتی خۆی پاراستووە. ئەو لە دوژمنایەتی شەخسی ڕزگاری نەبووە و بەردەوام بەدوای نەیارەکانییەوەیە.

ئەم بەشەی هۆزی گەردی لقێکە لە مێژە لە هۆزە سەرەکییەکەی (ئەسڵییەکە) نزیك نەهری[18] (Neri) جیابۆتەوە. ئەوانە بە گەردییەکانی کۆیە (گوندی ئەشکەوسەقا – وەرگێڕ) و بەشەکەی میراودەلی لای پشدەرەوە پەیوەستن.

### ناحیەی قووشتەپە

قووشتەپە ناحیەیەکی بەناوبانگی دزەیییەکانە و بە پیتترین بەشی دەشتی هەولێر لە خۆ دەگرێت. لە چیای دێدەوانەوە بەرەو زوورگەزراو درێژ دەبێتەوە تا لە سنووری باشووری دەگاتە زێی بچووك. لە سنووری رۆژهەلاتی ناحیەکە دوو یان سێ گوندی سەیدەکانی بەرزنجی هەیە، گەورەکەیان شێخ مەعرووفە کە پیاوێکی پیری رووخۆشە، بەلام کاریگەریی زۆر فراوانی نییە. ٥-٦ گوندی تریش هەن دانیشتوانەکانی مەنتکن. مەنتك بەشێکن لە هۆزی سوورچی و بەشێکیان هەموو هاوینێك بۆ کوێستانەکان کۆچ دەکەن. ئازارێکی زۆریان لە شەڕ چێشت و زۆریشیان بەلاوە گرنگ نەبوو. ئەوان هیچ ئاغایەکی بەناوبانگیان نییە. ژمارەیەکی کەم گوند لە کەنار زێی بچووك هەن سەربە هیچ هۆزێك نین. هەندێك گوندیش سەر بە دانیشتوانی پردێن (ئالتوون کۆپری). بە هەرحاڵ هەموو دەشتە بە پیتەکان لەلایەن دزەیییەکانەوە داگیرکراون، جگە لە چەند گوندێکی کەم نەبێت کە کەوتۆتە دەست ئاغاکانی هەولێر. پێش شەڕ (شەڕی یەکەمی جیهان - وەرگێڕ) ئەم دەشتە نەکێڵدراوە و ئەوەندەش بەرچاو نەبووە، تاکو ئێستاش هەمان هەلومەرج لە دەوروبەری گوندە گەورەترەکان، کە لە دووسەد تا سێسەد خانوو پێکهاتووە لە ئارادایە. زۆربەی هەرە زۆری زەوییەکانی گوندە عەشایرییەکان موڵکی شەخسیی ئاغایە.

ئەم ناحیە لەسەردەمی حوکمڕانیی عوسمانییەکاندا گرنگییەکی سیاسیی گەورەی هەبوو و تا پێش چەند ساڵێك هەمیشە یەکێك لە سەرانی دزەیی دەکرا بە بەڕێوەبەری ناحیەکە. دەڵێن عەشیرەتی دزەیی پێش سێسەد چوار سەد ساڵ لە دزەی ئێرانەوە کۆچیان کردووە بۆ ئێرە. تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم ئەوان تەنیا دەستیان بەسەر قووشتەپە و گوندەکانی دەوروبەریدا گرتبوو و خەراجیان (جزیە) بە عەرەبی هۆزی تەی دەدا. سەرەنجام خۆیان لە کۆتی عەرەب ڕزگار کرد و دەستیان بەسەر دۆڵی بەپیت و بەیاری کەندێناوەدا گرت. دواتر سەرۆکی ئێستای هۆزەکە برایم ئاغا[19] لەو کاتەی کە باوکی لە ژیاندا مابوو، دوای ئەوەی عەرەبەکانی عەشیرەتی شەممەری ڕاونا، گەیشتە مەخموور و دەستی بە چاندنی دەشتی قەراج کرد.

دزەیی هۆزێکی بەهێزە و لە توانایدایە شەش سەد سوارە و ژمارەیەکی لەوەش زۆرتر جەنگاوەری پیادە تەییار بکات. بە هەر حاڵ ئەوان پتر ناوبانگییان بە جەردەیی و تاڵانکردن دەرکردووە، نەك بە هێزێکی سەربازی. لە سەردەمی عوسمانییەکاندا هەر گوندێك ئاغای خۆی هەبووە و هەر ئاغایەکیش دەستەیەك خوبزەی[٢٠] هەبووە، کە پیشەیان تاڵانکردنی کاروانەکان بووە و بەشێکیش لە دەسکەوتەکەیان بە گەورەکەیان (ئاغای گوندی) دەدا. لەم ساڵانەی دواییدا شەڕێکی توند لە نێوان سەرۆکە ڕکابەرەکاندا ڕوویدا، لە هەر لایەکیش ژمارەیەکی بەرچاو کوژران. تێبینی ئەوە دەکرێت کە ڕەگەزی جووتیارەکان لەگەڵ ئاغاکان جیا بێت و سۆزێکی کەمیان بۆیان هەبێت. گوندەکان پتر بەسەر چوار بنەماڵە دابەش دەکران، سەرۆکی هەر بنەماڵەیەکیش تاڕادەیەك وەك سەرۆك هۆز دەناسرا. ژمارەیەك گوند سەر بە هیچ سەرۆك هۆزێك یان کەسێك نەبوون. تەنیا وەلایەکی دوور بە دووریان بۆ برایم ئاغا هەبوو. پێموایە ماوەیەکی زۆری پێناچێت، کە هەستی عەشایری بە تەواوی لە نێوان دزەییەکاندا نامینێت و هەموو گوندەکانیش سەربەخۆ دەبن. ئاغاکانی دزەیی بەسەر چوار کەرت[٢١] (بنەماڵە یان بەرەباب – وەرگێڕ) دابەش دەبن، هەر هەمووشیان پەیوەندیی خزمایەتییان لەگەڵ یەکتریدا هەیە. ئێستا هەردوو لایەنیان یەکیان گرتووە و بوونە بە دوو گرووپی سەرەکی.

***یەکەم : ئەو بنەماڵەی برایم ئاغای کوڕی بایز ئاغا*** سەرۆکییەتی[٢٢] (بەرەبابی بایز – وەرگێڕ)، گەورەترین بەشی عەشیرەتەکەیە و خۆیان و هاوپەیمانە بچووکەکانیان نزیکەی ٨٠ گوندیان هەیە، نیوەی دەکەوێتە ناو سنووری ناحیەی قووشتەپە، نیوەکەی تریش دەکەوێتە سنووری کەندێناوە و مەخموور و چەند گوندێکی کەمیش لە سنووری هەولێرە. کەسایەتییە ناودارەکانیان ئەمانەن:

***برایمی بایز ئاغا*** سەرۆکی فیعلی هەموو عەشیرەتەکەیە و ئەمەش لە گشت بۆنە جەماوەرییەکاندا سەلمێندراوە، چەند ساڵێك پێش کۆچی دوایی بایز ئاغای باوکی چووەتە مەخموور و لەوێش نیشتەجێ بووە و ئێستاش هەر لەوێ دەژێت. دوای ئەوەی مەخموور بە خاکی تاج (بەریتانیا – وەرگێڕ) ناسرا، ئەو بۆ ماوەی

چەند ساڵێك شەڕێکی سەختی لە دژی حکوومەتی عوسمانی کرد و بەردەوامیش لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتە ڕکابەرەکانیدا میهرەبان بووە. لە ساڵانی ڕابوردوودا شەڕێکی زۆری لەگەڵ ئەحمەد پاشا و حاجی پیرداود ئاغا کرد و کوڕە نۆبەرەکەشی لەم کێشەدا کوژرا، ئەو تەنیا کوڕێکی ماوە، ناوی موشیرە، کە کابرایەکی دڕ و زۆر دەستبڵاوە و باوکی بە هیچ جۆرێك نایەوێت ببێتە جێنشینی. برایم ئاغا پیاوێکی دانا، خۆشەویست و ڕووخۆشە. گرنگییەکی ڕاستەقینە بە بواری کشتوکاڵ دەدات. ئەو سەرۆك عەشیرەتێکی نموونەییە لە شێوەیەکی پاتریارکیدا.

***قورشیدی بایز ئاغا*** — برای برایم ئاغایە و لە ناحیەی کەندێناوە دەژیت و هەمان شێوەی ئەو دەدات، عەلی ئاغای کوڕی یەکێکە لە باشترین کەسە ڕووناکبیرەکانی ناو ئاغا دزەییەکاندا، ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە سەرۆکی عەشیرەتەکە.

***ڕەحمانی بایز ئاغا*** — برایەکی تری برایم ئاغایە و لە گوندی دووگرتکانی سەر بە قووشتەپە دەژیت، ئەو پیاوێکی زۆر بەتوانا و ڕاستگۆیە. دوژمنایەتی لەگەڵ دراوسێکانیدا نییە، کە ڕواڵەتی زۆر لە ئاغا دزەییەکانی ترە. لە نێوان سەرانی ئەم بنەماڵەیەدا دەکرێ ئاماژە بە حوسێنی مەلا بکەین کە لە ناحیەی هەولێر دەژێت، هەروەها جوکل ئاغای کوڕی حەوێز ئاغا کە لە گوندی قۆڕیتانی سەر بە ناحیەی قووشتەپە دەژێت، هەردووکیشیان ئامۆزای برایم ئاغان.

***دووەم:— بنەماڵەی مەحموود کاکە خان*** — (بەرەبابی کاکە خان — وەرگێڕ) خاوەنی ١٢ گوندن لە قووشتەپە و کەندێناوە، مەحموود کاکە خان بە ڕێگر ناسرابوو، ئەو پێش داگیرکردنی هەولێر لە لایەن ئێمەوە، کۆچی دوایی کردووە.

***ڕەسوڵ ئاغا*** ئێستا ئەو سەرۆکی ئەم بنەماڵەیەی دزەییانە، بەڵام دان بە باڵادەستیی دەسەڵاتی برایم ئاغا دەنێت، ئەو پیاوێکی زۆر باڵا بەرز و ئازایە، ڕووناکبیرێکی بە توانایە. ئەو لە ئامانجی تایبەتی بەدەر نییە، سەرۆك بنەماڵەکانی تر تا ڕادەیەك بە نزمی سەیری دەکەن. ئەو لە دیبەگە کە ناوەندی ناحیەی کەندێناوەیە دەژییێت.

***عەلی ئاغا*** کوڕی گەورەی مەحموود کاکە خانە و تەمەنی تەنیا ٢٠ ساڵە و توانای هزریشی لاوازە، میراتێکی بایەخداری زۆری لە باوکییەوە بۆ بەجێماوە.

***سێیەم: بنەماڵەی ئەحمەد پاشا***[٢٣] (بەرەبابی پاشا – وەرگێڕ) ئەم بنەماڵە لە ئەحمەد پاشا و شەش کوڕەکەی (هەشت کوڕی هەبووە – وەرگێڕ) و یەك دوو زاوای پێك دێت، ١٨ گوندیان هەیە، کە گەورەترین و بەپیتترین گوندەکانی ناحیەی قووشتەپەن.

ئەحمەد پاشا کوڕی حوسێن ئاغایە، لە ئاستی دەسەڵاتی عەشایری دوای برایم ئاغا لە پلەی دووەمدا دێت، پیرەمێردێکی خۆشمەشرەبە، بەڵام شێوازی زبرە و تەواو نەخوێندەوارە، لە سەرەتای ژیانیدا دەستکورت بووە، بژێویی خۆی بە رێکخستنی مێزەکانی یاری لە چایخانەکانی هەولێر دابین کردووە، ڕۆژێکیان جووتێك هێستر دەدزێت و دەچێتە کەندێناوە و دەست دەکات بە زەوی چاندن. بە زمان لووسی توانی قەرزێکی کشتوکاڵی لە حکوومەتی عوسمانی وەرگرێت و بەم جۆرە پیشەی مورابی (ڕیباخۆری) دەستپێکرد[٢٤]. ئێستا پتر لە ٥٠٠٠٠ پاوەندی بە ڕیبا کۆکردۆتەوە بە وەرگرتنی لە سەدا ٣٣,٣٣ (سێیەك – وەرگێڕ) لە هەر گوژمەیەك پارە. دەڵێن بایی ٢٠٠٠٠٠ پاوەندیش زێڕی لە ماڵەوە هەیە. ئەوە بوو پرۆژە کشتوکاڵییەکانی گەشەیان کرد و پێشکەوتن. ئەحمەد پاشا لە وەگیرهێنانی زەویوزار زۆر سەرکەوتوو بوو، ئەو پتر بازرگانە تا سەرۆك عەشیرەت بێت، لە لای خەڵکیش خۆشەویست نییە. سامانەکەی پێگە و کاریگەرییەکی مسۆگەری پێبەخشیبوو و وای کردبوو کە حکوومەتی عوسمانی هەمیشە لایەنگیری بکات، هەروەها پیاوێکی زمان شڕە، لە قسەکردندا زۆر بەفیز و لووتبەرزە، خدر ئاغای کوڕە گەورەی ڕووخۆش و بە لوتفە و هەروەها کوڕەکانی تری هەر هەموویان زۆر لە باوکیان باشترن.

***چوارەم:– بنەماڵەی حاجی پیرداود ئاغا*** – (بەرەبابی فارس – وەرگێڕ) نزیکەی ١٨ گوندیان هەیە و بەسەر سێ ناحیەدا دابەش بووینە. لە سەردەمی عوسمانییەکاندا یاخیترین بەشی عەشیرەتەکە بوون و تاکو ئێستاش بە ڕێگری ناسراون. حاجی پیرداود ئاغا بەم دواییە خۆی بە جەستە و بە گیان پێشکەش بە ئەحمەد پاشا کرد. ئەو پیاوێکی زیرەك، خوێندەوارێکی باش و لە کاتی

قسەکردندا بێ پێچ و پەنا و بێ فیزە. بەفرتوفێڵ دەژی و جێگەی متمانە نییە، بوونی بە خزمەتکاری ئەحمەد پاشا وایکرد کاریگەریی خۆی لە ناو بنەماڵەکەدا لە دەست بدات. سولەیمان ئاغای ئامۆزای بێ ئابڕووترین ئاغایە لە ناو هەموو ئاغا دزەییەکاندا. لە سەردەمی عوسمانییەکاندا دزی دەکرد و تەنانەت شتومەکە دزراوەکانیشی بۆ خاوەنەکەی نەدەگەڕاندەوە، هەرچەندە بە پێی داب و نەریتی (عورف و عادەت) دزەییەکان دەبوایە شتومەکی دزراو لە کاتی ئاشکرابوونیدا وەکو باجێك بۆ خاوەنەکەی بگەڕێندرێتەوە.

## ناحیەی کەندێناوە

ناحیەی کەندێناوە دۆڵێکە دەکەوێتە نێوان زوورگە زراو و چیای قەرەچووغ. لە سەدەی ڕابوردوو ئاوەدان بۆتەوە و ٧٠ گوند لە خۆ دەگرێت. زەوییەکەی بەپیتە، بەڵام بەرهەمەکەی وەکو دەشتی هەولێر باش نییە و وەکو مەخموریش بە بڕشت نییە. ناوچەیەکی تەواو بێ دار و درەختە و سەرچاوەی ئاویشی بیرەکانە. هەموو زەوییەکان، جگە لە پێنج گوند نەبێت موڵکی سەنییەیە. دیبەگە ناوەندیی ناحیەکەیە، ڕەسوڵ ئاغای لێ نیشتەجێیە. سەرجەم دانیشتوانەکەی دزەیین. سەید عومەر ئەفەندی برای سەید ئەحمەد خانەقای کەرکوك، لە کەناری زێی بچووك دەژییێت. دوای ئەوەی عەرەبەکانی کەنار دجلە خرانە سەر موسڵ، کەندێناوە وەك ناحیەکی سەربەخۆ نەمایەوە و خرایە سەر مەخموور.

## ناحیەی مەخموور

ناحیەی مەخموور تەنیا بەر لە نزیکەی سی ساڵ لە لایەن برایم ئاغا ئاوەدان کرایەوە. زەوییە بەپیتە سەرنجڕاکێشەکانی وایکرد، عەبدولحەمید (سوڵتانی عوسمانی — وەرگێڕ) یەکسەر بە زەوی سەنییەی لەقەڵەم بدات. لێرە بڕی دانەوێڵە یەك بە سەدە، بەڵام ئەو کاتە ڕوو دەدات کە بارانێکی زۆر ببارێت، بە داخەوە ئەو بارانە زۆرەش زوو زوو نابارێت، گوندەکانی دزەیی بە درێژایی بناری ڕۆژئاوای قەرەچووغ بڵاوبوونەتەوە و گەر ساڵەکەش هات بێ تاکو بیابانیش دەچێت. گەر ساڵەکەش نەهات بێت، گوندەکان دووبارە دەبنەوە بە بیابان و وەك کەلاوەیان لێدێت.

مەخموور ناوەندی ناحیەکەیە و بارەگای برایم ئاغاش گوندێکی گەورە و چەند باخێکە (پێی دەگوترێت قەرات – وەرگێڕ). بینایەکی جوانی حکوومی لە مەخموور هەیە، هەروەها چوار خانووش بۆ فەرمانبەرەکان لەگەڵ خانێکی گەورە و بازاڕێك و ئۆردوگای سەربازی هەن، هەر هەمووشیان لە بەرد و گەچ لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە دروستکراون. وێڕای گوندە کوردەکان ژمارەیەکی کەم گوندی عەرەبان هەن کە هۆزی تەی خاوەنییەتی، شێخ حەنەش سەرۆکی هۆزەکەیە، لاوێکی بێ کەسایەتییە و خوشکێکی (سەکتە – وەرگێڕ) شووی بە برایم ئاغا کردووە.

بە درێژایی دجلە و زێی بچووك ژمارەیەك گوندی عارەبان هەن، لە هاویندا خۆیان بە چاندن خەریك دەکرد. چەند بەشێکی هۆزی جبوور لەو شوێنە نیشتەجێن، ئەوانە قسەکردنیان پتر بە مەیموون دەچێت وەك لە ئادەمیزاد و سەرۆکێکی ناوداریان نییە. کەسایەتییە دیارەکانیان بریتین لە عیسا ئەلتورك لە حلوە[٢٥] و مەلا عەتیە لە عوساجە. ئەم عەرەبانە لە کێشەکانی ناوچەکە و ئەو شەڕ و پێکدادانەی لەگەڵ عەرەبەکانی ئەو بەری زێ، ڕۆڵێکی بەرچاویان هەیە، ئەوان ژمارەیەکی زۆر تفەنگی تازەیان هەیە و تفاقێکی زۆریشیان لەو شەڕانەدا وەگیرکەوت، کە لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٧ لە ناوچەکەدا ڕوویدا.

لە گوندی سوڵتان عەبدوڵڵا مەزارێکی پیرۆز هەیە و بە باشی پارێزراوە، هەروەها لەو دەوروبەرە پاشماوەی شارێکی دێرین بەدی دەکرێت ناوچەیەکی فراوانی بە ڕووبەری چەندین میل دووجای داگیرکردووە. شوێنەواری کەناڵی گەورەش لە دەشتی قەراج هەیە، بەتایبەتیش لەو شوێنەی کە زێی بچووك لێی دوور دەکەوێتەوە، نزیك گوندی عەتیرا.

## ناحیەی گوێڕ

ناحیەی گوێڕ ، هەروەها بە شەمامکیش ناسراوە (شەمامك بە دەشت و گوندەکانی دەوروبەری گوێڕ دەگوترێت – وەرگێڕ). بە شێوەی سەرەکی لە دەشتێکی بە پیت پێکهاتووە و باران بارینیشی لە مەخموور مسۆگەرترە و ٤٥ گوند لە خۆ دەگرێت، لە ڕابوردوودا ئەم ناحیەش بیابان بووە و ڕەوەندی (بەدو)

عەرەبان هاموشۆیان کردووە. کورد و عـەرەب لـە گونـدەکان نیشـتەجێن و بەشـی هەرە زۆریشیان سـەربەخۆن و سـەر بـە هـیچ ئاغایـەکی دەرەکـی نـین. زەویـەکان هەمووی مـودەوەرەن (Mudawwarah) [٢٦]، جگـە لـە سـێ چـوار گونـدی حـاجی ڕەشید ئاغای دانیشتووی هەولێر نەبێت، وا مامەڵـە دەکـات وەك مـوڵکی ئـەو بـن. کوردەکان سەر بە هیچ عەشیرەتێکی دیارکراو نین و عەرەبەکان لە هۆزی (تـەی)ن یان سەر بەم هۆزەن. لە ناحیەکە پیـاوێکی نـاودار نییـە، جگـە لـە شـێخ محەمـەد ئەلفارس نەبێت، کە لە ڕەچـەڵەکی بـەناوبانگی حاتەمـە. بنەماڵەکـەی سـەردەمێك فەرمانڕەوایی هەموو ناوچەکەی دەکرد، بەڵام ئەو ئێستا دەبینێـت کـە کوردەکـان پـەیتا پـەیتا عەرەبـەکان بـەرەو دواوە پـاڵ پێـوە دەنـێن و پرۆسـەکەش هـەروا بەردەوامە. گومانم لەوە نییە سالأنێکی زۆری پێناچێت، عـەرەب بـە تـەواوی لـەم ناحیـە نامینێـت، ئـەوان نـاتوانن کێبڕکـێ لەگـەڵ پیشەسـازیی باڵادەسـت و وزەی کورداندا بکەن.

گوێڕیش وەك مەخموور بینایەی جوانی فەرمی لێیـە و دوبەیـەکیش هەیـە بـۆ پەڕینەوە[٢٧] لە زێی گەورە. خەڵکی ئـەم ناحیەیـە زۆر فێڵبـازتر و شـێلگیرترن لـە ئاسـتی ڕك و کینـەی شەخسـی بـە بـەراورد لەگـەڵ ناوچـەکانی تـری هـەولێر. دوژمنکـاریی ڕەگـەزیم لـە نێـوان کـورد و عەرەبـدا بـەدی نـەکرد و خۆیـان بـە هاوپەیمانیی یەکتری دادەنێن لە بەرەنگار بوونەوەی پیلانە دوانەبڕاوەکاندا.

سەرجەم خەڵکی ئەم ناحیە وەك ناحیەکانی تر موسوڵمانی سوننە مەزهەبن، جگە لە دوو گوند نەبێت کە کاکەیین. خودی گوێڕ و یەك دوو گونـد لـە ڕابـوردوودا چاویان لە موسڵ کردبوو و بە پێچەوانەی عەرەبـەکان ببوونـە پـەیڕەوی مەزهـەبی حەنەفی، ئەوی تر هەمووی پەیڕەوی مەزهەبی شافعیین.

کاکەییـەکان دەڵـێن ئـەوان عـەلی ئیلاهـیین یـان وەك وانـن ، ئـەوان لەلایـەن موسڵمانەکانەوە ئازار دەدرێـن. موسـوڵمانەکان هـەموو جـۆرە ڕێوڕەسمـە فسـق و فجوورەکانیان بۆ کاکەییـەکانیان دەگەڕێننـەوە، ئـەوان لـە کـەنار زێ لـە گونـدی سفەییە و مەتراد (هەردووکیان سەر بە ناحیەی گوێڕن – وەرگێـڕ) دەژیـن و سـەر بە هۆزی سارەلوون، موختارەکەیان ناوی عەبد عەلییە، ئەوان زۆر سەرکەوتوون.

## هەلومەرجی سیاسی لە هەولێر لە ساڵی ١٩١٩ دا

بێگومان جگە لە ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێت، هەموو پێشوازییان لە هاتنی حکوومەتی بەریتانیا بۆ هەولێر کرد. کەمێك دوای داگیرکردنی هەولێر، هەموو سەرکردە ناسراوەکان، جگە لە عەلی پاشا ( دۆغرەمەچی — وەرگێڕ)، بە زۆریش لە ژێر کاریگەریی مەلا فەندی مەزبەتەیەکیان (ڕاگەیاندنی پشتیوانی لە بەریتانیا — وەرگێڕ) مۆر کرد. تاقمێکیش کە زۆربەیان ئاغا بوون، بە خێرایی خۆیان ساز و تەیار کرد، ئەوانە چیتر نەیاندەتوانی ئارەزووی دزی و گەندەڵییەکانیان تێر بکەن، بۆ نموونە چیتر فەرمانبەرە تورکە شرەخۆرە لادراوەکانیان بۆ کاری گەندەڵی لەبەر دەست نەبوو. ئاژاوەگێڕە دیارەکان بریتی بوون لە: عەتاوڵڵا ئاغای کوڕی حاجی ڕەشید ئاغا، شێخ محەمەد ئەفەندی موڵکدار، ڕەمزی بەگ، سەید ئەفەندی، فەرمانبەرانی پێشووی تورك بوون (ئەمانە و هەندێك کەسایەتی تری وەك عەلی پاشا، حاجی پیرداود ئاغا و ئەحمەد پاشا کۆمەڵەیەکی نهێنییان بۆ دژایەتیکردنی بەریتانیا پێکهێنا بوو — وەرگێڕ). هەرچەندە شێخ مەحموود کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە سەر ناوچەی هەولێر نەبوو، بەڵام سەرهەڵدانەکەی (Rising) سلێمانی هاندەرێکی گەورەی ئەم بێزارییە بوو. فەرمانبەرە حکوومییەکان ئەوانەی تاکو ئێستا ڕاستگۆ بوون، ئیتر خۆیان دایە دەست گەندەڵییەکی ڕەها و ئابڕووی حکوومەتیان برد. لە هەمان کاتدا زەبت و ڕەبت (دیسپلین) لە ڕیزەکانی جەندرمە و پۆلیس خاو بۆتەوە و بەمەش خەڵکیان زۆر بێزار دەکرد. لە ڕۆژانی قەیرانی دزەییدا، کاروبارەکان بەرەو یاخیبوونێکی ئاشکرای پۆلیس دەچوو بەتایبەتیش دوای نمایشکردنی شانۆگەرییە عەرەبییەکە و کوشتنی عەریف (سێرگیەنت) مێسیون. دوای سزادانی سەرانی دزەیی و دەرکردنی فەرمانبەرە گەندەڵە سەرەکییەکان، ئاشووبەکە پەیتا پەیتا هێور بۆتەوە و یاخیبوونەکە ئێستا لە دووتوێی گرووپێکی زۆر بچووکدا ئابڵووقە دراوە، کە زۆر کەم سەری خۆیان دەردەخەن. چەند مانگێکە عەلی پاشا خۆی تێکەڵ پڕۆپاگەندەی یاخیبووەکان ناکات و بە ئاشکرا دۆستایەتیی خۆی بۆ حکوومەت ڕاگەیاندووە. کوشتارەکەی ئامێدی و ئاکری[٢٨] بووە هۆی نەبوونی هیچ پشێوییەك، تەنها چۆلکردنی ڕواندزیش[٢٩] مقۆمقۆیەکی فراوانی پەیدا کرد. زێی

گەورە هەولێری لە پەیوەندیكردن بە باكوورەوە دابڕیوە و هەواڵەكانی موسڵ و ئاكرێ تا دوای چەند ڕۆژێكیش ناگەنە شار، بەڵام هەواڵی ڕووداوەكانی كۆیە و ڕواندز زوو دەگەن.

گەورەترین سیمای هەلومەرجی سیاسی لە شار و ناوچەكە ئەو ململانێیەیە كە لە نێوان خەڵك و ئاغا زۆردارەكاندا هەیە. تا حكوومەت بەرهەڵستیی ئاغاكان بكات، ئەوا بێگومان كۆمەلانی خەڵك پشتیوانی دەبن؛ تەنیا لەو كاتانەی كە گەندەڵی تەشەنە دەكات، ئاغا ئەو دەسەلاتە ڕەهایەی هەیە كە هەرچی بیەوێت بیكات، ئەمەیش بێزارییەكی گشتی لێ پەیدا دەبێت. لەم پێودانگەدا دواكەوتنی پرۆسەی ئاشتی لەگەڵ توركیا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئاشووبێكی گەورە، خەڵكیش مەترسی ئەوەیان هەیە كە بەریتانیا خیانەتیان لێ بكات و ولات بەجێبێڵێت و دیسان بكەونەوە ژێر دەسەلاتی ئاغا و فەرمانبەرە گەندەڵە هاوپەیمانەكانیان.

پێكهێنانی لیوای هەولێر جێگەی ڕەزامەندییەكی گەورەی هەموو خەڵكە، خەڵكی شار خاوەنی ویژدانی سیاسیین و تامەزرۆی ئەوەن بەشێك لە جڵەوی كاروبارەكانیان بگرنە ئەستۆی خۆیان و بە شەوقەوە چاوەڕوانی پێكهێنانی ئەنجوومەنی لیوا و ژیاندنەوەی ئەنجوومەنی شارەوانین.

ڕۆژێكیان لە میانەی گفتوگۆیەكدا مەلا فەندی گوتی:" هەموو كەسێك ئارەزوو دەكات ولاتەكەی خۆی بە سەربەخۆیی ببینێت. ئێستاش كە ئێمە بە هۆی ئیرەیی و ناكۆكییەوە پچڕ پچڕین و كەسێكیشمان نییە تەواو دەسەلاتدار بێت، داوات لێدەكەین پشتیوانیمان لێبكەیت تا ئەو كاتەی ئارامی و ئاسایش سەقامگیر دەبێت و دەتوانین خۆمان فەرمانڕەوایی خۆمان بكەین".

## بارودۆخی عەشایری

هۆكاری سەرەكی لە بارودۆخی عەشایریدا دیسان بریتییە لە خەباتی جووتیار لە دژی ئاغا و هەوڵی ئاغا بۆ پاراستنی دەسەلاتی خۆی. پلەوپایە و مووچە درا بە سەرۆكەكان (سەرۆك عەشیرەتەكان – وەرگێڕ) لە كوردستانی سەربەخۆدا، بەتایبەتیش سەرۆكەكانی خۆشناو، ئەمەیش بووە هۆی دلگرانییەكی

گەورە لە لای سەرۆکەکانی دزەیی. هیچ ئاماژەیەك یان بزاڤێك بۆ سەربەخۆیی لەم ناوچەیەدا نییە، هەروەها هیچ جۆرە هەستێکی ئاینی دژی حکومەتی ئێستا نییە؛ هۆی هەر کێشەیەکیش کە ڕوویداوە یان ڕوو دەدات تەماحکاری یان ئیرەیی کەسییە.

ئاغاکانی دزەیی لە سەردەمی حوکمڕانیی عوسمانیدا پتر بەرهەڵستکاری دەوڵەت[٣٠]بوون و بەردەوام شەڕیشیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد. ژمارەیەکیان زۆر دەوڵەمەند بوون و بیرۆکەیەکی باشیان دەربارەی گرنگیی پێگەی خۆیان هەیە. چەند ڕۆژێکی کەم پێش داگیرکردنی هەولێر، دزەییەکان نزیکەی هەموو عەمبارەکانی ( عەمباری دانەوێڵە – وەرگێڕ) ناوچەکەیان تالآن کرد. ڕەسوڵ ئاغای دانیشتووی دیبەگە تاکە کەس بوو کە موڵکی حکوومەتی پاراست. مێجەر موری هەولێدا بەشێك لە دانەوێڵە تالآنکراوەکە بگەڕێنێتەوە و سەرکەوتووش بوو، بەلآم دوای ئەوەی بۆ ماوەی یەك دوو ڕۆژ ئەحمەد پاشای زیندانی کرد. هەروەها فەرمانی قەدەغەکردنی چەك هەڵگرتن تاڕادەیەکی زۆر کێشەی لەگەڵ عەشیرەتەکان و ئاغاکان دروست کرد، بەتایبەتیش ئەحمەد پاشا کە هەڵوێستێکی نەیارانەی[٣١] بەرامبەر حکوومەت پەیڕەو کرد.

بەرزکردنەوەی پلەی شێخ مەحمود بۆ "حوکمدار" ی کوردستان، تەنیا هەندێك سەرسووڕمانی لەلایەن دزەییەکانەوە دروست کرد و ئەوان بۆچەندین جار هەموو جۆرە پەیوەندییەکیان لەگەڵ ڕەت کردەوە و دووپاتیان کردەوە کە ئەو هیچ نییە؛ بەلآم ئەو پلە و پارەیەی بە سەرۆکەکانی خۆشناو دران بووە هۆی پەیدابوونی ئیرەیی و بێزارییەکی بەرچاو. ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحموود ئەوانی سارد کردەوە، دزەییەکان نامەیەکیان لە شێخ مەحموودەوە پێگەیشت، برایم ئاغا لە وەلآمدا گوتبووی کاتێك نوێنەری شێخ مەحموودی لە کەرکووك بینی، باسی ئەو کارانەی لەگەڵدا دەکات کە لە توانادایە ئەنجام بدرێت. بەلآم یاخیبوونەکەی سلێمانی بە شێوەیەکی تر کاری کردە سەر ناوچەکە؛ هەموو بەڕێوەبەر و فەرمانبەرەکانی داهات (خەزنەدارەکان – وەرگێڕ) بینییان حکوومەت لاوازە و پێیان وابوو مانەوەشی بەردەوام نابێت، ڕاستگۆیی خۆیان بەلاوەنا و ملیان دایە گەندەڵییەکی فراوان. تەنیا پیاوێك نەبێت، ئەویش ئەنوەر ئەفەندی

مدیر ناحیەی مەخموور (ئێستا مال مودیرە) هەوڵیدا مافـەکانی (سـامان و ئـابڕوو) حکوومەت بپارێزێت و ئاگـاداری سـەرەوەی خـۆی کـردەوە کـە بەروبوومـەکان لـە ناحیــە دراوســێکاندا بــە خراپــی مەزەنــدەکراون. مێجــەر مــوری فەرمانیــدا بــە دووبارەکردنەوەی مەزەندەکردنەکە لە هەر شـوێنێك خـۆی بـە پێویسـتی بزانێـت، بڕی داهاتیشی بە ڕادەیەکی باش زیاد کرد. ئەمەش بووە مایەی بێزاری هەر چـوار سەرۆکەکەی دزەیی، ئەوان یەکتریان بینی و نامەیەکی هاوبەشیان بۆ یاریـدەدەری حاکمی سیاسـی نـارد، تیایـدا نووسـیبوویان کـە سـەرجەم بەڕێوەبـەرەکان (مـدیر ناحیــەکان – وەرگێــڕ) گەنــدەڵن یــان ئــازاری خــەڵکی دەدەن. داوایــان کردبــوو بەڕێوەبەرەکان لە خەڵکی ناوچەکە دابندرێن. داینەمۆی ئـەم کـارە ئەحمـەد پاشـا بوو و دوای زەحمەتێکی زۆر تـوانی قەناعـەت بـە بـرایم ئاغـا بکـات نامەکـە ئیمـزا بکات، لە کاتێکدا ڕەسوڵ ئاغا دژی سـەرتاپێی نەخشـەکە بـوو و تـاکو بـرایم ئاغـا ئیمزای نەکرد ئەو ملی نەدا.

نامەکــە یاریــدەدەری حــاکمی سیاســی زۆر بێــزار کــرد و فەرمانیــدا هــەموو سەرۆکەکان بێنە هەولێر، ئەوان داواکارییەکەیان ڕەت کردەوە و گوتیان سـەرقاڵی ڕێوڕەسمی جەژنن، هەرچەندە شەش ڕۆژ بەسەر جەژندا تێپـەڕیبوو، دوو فـەرمانی تریشیان بۆ ناردرا و دوایی کاپتەن هــەی لــەو کاتــەی کۆبوونــەوەیان لــە میرخـوزار (سەر بە ناحیەی قووشتەپەیە – وەرگێڕ) هەبوو، سـەردانی کـردن[٣٢]، بـەڵام ڕازی نەبوون بێنە هەولێر. هەندێك پڕۆپاگەندە، ڕەنگە نادروستیش بێـت، بڵاوبـۆوە کـە ئــەوان خــەریکی کۆکردنــەوەی هێزێکــی پیــادەن. دەســەڵاتی ســەربازیی بــەریتانی کەوتەخۆ و زرێپۆشەکان نێردرانە قورشاغلوو و فڕۆکە جەنگییەکان خۆپیشاندانیان ساز کرد. سەرۆك عەشیرەتەکان هاتنە باداوە کە دوو میـل لـە هـەولێر دوورە و لـە ماڵی مەلا فەندی میوان بوون. ئەوان زۆر ترسابوون، پێیان وابـوو هاتنیـان بـۆ نـاو شار ڕەنگە تووشی سزای لەسێدارەدان یان دوورخستنەوەیان بکات. مەرجەکانیان بۆ ناردرا کە "دەخالەیان"[٣٣] (Dakhalah) قبـووڵ دەکرێـت ئەگـەر بێتـوو سـزای ٢٠٠ تفـەنگ و بـڕە پـارەی ١٥٠٠ پاوەنـد بدەنـە حکوومـەت، ئـەوان تـا ئێسـتاش باوەڕیان بە حکوومەت نییە و باداوەیان بەجێهێشت و گەڕانەوە گونـدەکانیان، لـە ڕێگـادا بـرایم ئاغـا بـە شـێوەیەکی کتـوپڕ گەڕایـەوە و دەخالـەی خـۆی لـە مـاڵی

یاریدەدەری حاکمی سیاسی جێبەجیٚ کرد، هەموو سەرۆکەکانی تریش ڕۆژی دواتر هاتن. لە کاتێکی گونجاویشدا تفەنگ و پارەکان تەسلیم کران، ئەوەی لەم یاخیبوونەدا تێبینی دەکرا ئەوە بوو کە عەشیرەت پاڵپشتی سەرۆکەکانی نەکرد. دزەیییەکان زۆر دەوڵەمەندن و خاوەن بەروبوومێکی زۆروزەبەندن، سەربازەکان بەئاسانی دەگەنە سەرزەمینەکەیان. بەپێی ئەم لێکدانەوەیە زۆر زەحمەتە ئەوان بیر لە چەك هەڵگرتن بکەن دژی حکوومەت. یاخیبوونەکە و ئەنجامەکەی کەلێنێکی جدی لە نێوان سەرۆکەکانی دزەیی هێنایە کایەوە، یان باشتر بڵێین کەلێنە کۆنەکانی کردەوە، مشتومڕێکی زۆر لە نێوان هەر چواریان ڕوویدا دەربارەی ئەوەی کیٚ بەرپرسیاری تەسلیمکردنی تفەنگ و پارەکانە. برایم ئاغا و ڕەسولٚ ئاغا، کە بە دوودڵییەوە پەیوەندییان بە یاخیبوونەکەوە کرد بڕیاریاندا لە ناخەوە پشتگیری لە حکوومەت بکەن، بەڵام ئەحمەد پاشا و حاجی پیرداود ئاغا خولیایان داوەتە بوختان هەڵبەستن لە دژی ڕکابەرەکانیان و داڕشتنی نەخشە بۆ ڕێگرتن و پەکخستنی ئەو دەسەڵاتەی هەیە.

دوای ئەوەی سەرۆکەکانی دزەیی غەرامەکەیان دا و بەڵێنیاندا لە داهاتوودا ڕەوشتیان باش بێت. بڕیار درا بەڕێوەبەرەکان (بەڕێوەبەری ناحیەکان – وەرگێڕ) لەوان بن، بەڵام بەڕێوەبەری بیٚ مووچە و بیٚ دەسەڵاتی دارایی دەبن و تەنیا دەسەڵاتی دادوەرییان دەبێت. ئەحمەد پاشا چەندین جار جەختی کردەوە، کە هیچ پۆستێکی فەرمی وەرناگرێت و پێشنیازی کرد یەکێك لە کوڕەکانی پۆستەکە وەرگرێت. ئەمەیش بۆ برایم ئاغا کە ئامادەیی خۆی دەربڕیبوو پۆستێك وەرگرێت سووکایەتی بوو گەر ڕێگە بدات سەرۆکێکی لە خۆی بچووکتر پۆست ڕەت بکاتەوە و بیداتە کوڕەکەی. سەرەنجام پۆستەکان بەم جۆرە دابەش کران: برایم ئاغا بۆ مەخموور داندرا و حاجی پیرداود ئاغا بۆ قووشتەپە و ڕەسولٚ ئاغا بۆ دیبەگە. لە کۆبوونەوەی سەرۆکەکاندا حاجی پیرداود ئاغا لە وەڵامی پێشنیازێکی ئەحمەد پاشا گوتی ئەو زۆر سەرقاڵە و ناتوانێت پۆستەکە قبولٚ بکات و داوای کرد ئامۆزا ناوزڕاوەکەی، سولەیمان ئاغا بە وەکیلی (Wakil) ئەو دابندرێت، ئەمەش دیسان سووکایەتییەکی گەورە بوو بۆ حکوومەت و برایم ئاغا، بۆیەش ڕەحمان ئاغای برای برایم ئاغا بۆ قووشتەپە داندرا. ئەم ڕێکخستنە تاکو ئێستا سەرکەوتووە. لە

ماوەی پێنج مانگی ڕابوردوودا ژمارەیەکی زۆر کەم سکاڵا لە گوندەکانی دزەییەوە وەرگیراوە، پێموایە تەنیا یەك ڕووداوی دزیش لە ناوچەی دزەیی ڕووی نەداوە. هەڵگرتنی چەکیش بەتەواوی وەستاوە. سەرەتا هەوڵدرا قەناعەت بە عەشیرەتی جبوور لە ناحیەی مەخموور بکرێت سکاڵاکانیان پێشکەشی برایم ئاغا بکەن، بەڵام ئەنجامەکان جێگەی ڕەزامەندی نەبوون. لەم ماوەی دواییدا برایم ئاغا خۆی وەك لایەنگیرێکی سەرسەختی حکوومەت نیشاندا و کاریگەرییە فراوانەکەی بۆتە هۆی سەقامگیری و پاراستنی هێمنی، چونکە بڕیارە باشەکان پشتیوانی لێدەکرێت. ئەحمەد پاشا و حاجی پیرداود ئاغا بوونەتە کەمینەیەکی زۆر لاواز و لەلایەن گوندەکانی بنەماڵە ڕکابەرەکاندا گەمارۆ دراون و دەترسن جووڵە بکەن؛ کوڕەکانی ئەحمەد پاشا سەرکۆنەی باوکیان دەکەن سەبارەت بە هەڵوێستە ناشایستەکەی بەرامبەر حکوومەت، هەروەها بنەماڵەی حاجی پیرداود ئاغا گلەییان لە سەرۆکەکەیان کرد بەهۆی بوونی بە پاشکۆی ئەحمەد پاشا سەرەنجام ناکۆکی دەکەوێتە نێوان ئەم دوو سەرۆکە.

کاریگەریی ئەحمەد پاشا زۆر ڕوو لە کەمبوونە و دەسەڵاتی کەم بۆتەوە؛ بەپێی مەزەندەکردنێکی گشتی ٧٥٪ هاتۆتە خوارەوە. کەیسی زەوی باشتەپە لەبەردەم دادگایە؛ ئەگەر ئەو لە نیوەی زەوییەکانی گوندەکە دەربکرێت، واتە لەو زەوییانەی کە بڕیاری دابوو دەستیان بەسەردا بگرێت، ئەوا بێگومان دەبێتە شکستێك بۆ ئەو.

## ناحیەی هەولێر

گەردییەکان لە ساڵی ١٩١٩ هیچ کێشەیەکیان نەبوو و جەمیل ئاغای گەردیش لە کاتی یاخیبوونەکەی دزەیی و ئاشووبەکەی ئاکرێ، زوو پشتگیریی خۆی بۆ حکوومەت ڕاگەیاند. ئەو یاوەری مێجەر هەی کرد لەو گەشتە سەربازییەی کە لە مانگی کانوونی یەکەم بۆ ڕواندز ئەنجامیدا، یارمەتییەکەی زۆر سوودبەخش و ڕەنگە بایەخداریش بووبێت. لە بەهاردا کێشەیەك لە نێوان خەڵکی گوندی قەفەری کەنار چۆمی بەستۆڕە و هەرکییەکانی نیشتەجێی ئەو بەری چۆمەکە ڕوویدا. لە هەر کەنارەی پیاوێك بانگهێشت کرا و بەخێرایی "سوڵح" (Fasl) لە نێوانیاندا کرا.

دانیشتوانی گوندی قەفەر عەشیرەتی زرارین، لە دەوری دێرێ کۆبوونەتەوە. ئەوان گرنگییەکی ئەوتۆیان نییە و بە شەڕئەنگێزی و دزی ناسراون.

خەیلانی عەشیرەتێکی کۆچەری بچووکی ١٠٠ خێزانییە، سەرەتای ئەمساڵ لە ناحیەی هەولێر نیشتەجێ بوون و لە کانوونی یەکەمدا دیسان دەستیان کرد بە گەڕانەوە، هیچ کێشەیەکیان نییە.

دەربارەی ئەو گوندانەی ناحیەی هەولێر کە سەر بە هیچ هۆزێك نین شتێکی ئەوتۆ نییە ئاماژەی پێبکرێت جگە لەوە نەبێت کە عەبۆ ئاغای گەزنەی برای حاجی سەعید ئاغای (عوزێری — وەرگێڕ) پێویستە لە نزیکەوە چاودێری بکرێت، چونکە ئەو بەرپرسی بلاَوبوونەوەی زۆرێك لە پڕۆپاگەندە ترسناکەکانە.

## ناحیەی گوێڕ

لە ناحیەی گوێڕ کێشەی بەردەوام لە نێوان گوندەکان لە سەر زەویوزار و مەسەلەی تر هەیە. هەروەها تۆمەتبارکردنی فەرمانبەرە حکوومییەکان بە گەندەڵی، وەك ورووژاندنێکی تایبەتی، دەرچوو هەندێکی ڕاستە هەندێکیشی ڕاست نییە. لە کاتی سەرهەڵدانی کێشەی دزەیی، چەند کەسێکی ناسراو قەناعەتیان بە فەرمانـدەی جەندرمەی ناوچەکە کرد، کە مەسیحییەکی زۆر تووڕەیە تا ژمارەیەك کەسی ناسراو، کە دوژمنی شەخسییان بوون، دەستگیر بکات بەو تۆمەتەی کە گوایە دژی حکوومەت پیلان دەگێڕن. سەرەنجام ئەو کەسانە گیران، بەلاَم دوایی دەرکەوت کە ئەو تۆمەتانەی ئاڕاستەیان کرابوو بێ بنەمان. شێخ حەسەن موختاری گوندی زمارەیە[٣٤] و هۆکاری زۆربەی کێشەکانە، ئەو کابرایەکی عەرەبی هیچ و پووچە.

## ناحیەی مەخموور

عەرەبەکانی سەر دجلە کەمێك کێشەیان هەیە. لەمانگی ئاب هەندێك لایەنگرانی شێخ شەلەش و شێخ بنەیان لە کەناری ئەو بەری دجلە پەلاماری گوندی شومەیتیان (شومیط — گوندێکی عەرەبنشینە — وەرگێڕ) دا و لە ئاکامدا چەند کەسێك بریندار بوون، دوایی لە سەر دەستی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی تەلەعفەر سوڵحیان کرد. دەگوترێت ئەم عەرەبانە بەرپرسی ناردنی ئەو چەکانەن

کە لە شەڕەکەی شەرگات بە تاڵان دەستیان کەوتبوو، بۆ ئێران و ناوەڕاستی کوردستان لە ڕێگەی ئەحمەد پاشای دزەیی و بلّباسەکانەوە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت چەکداماڵینی ئەوانە زۆر بە سوود دەبێت.

**قانوون و فەرمان**

ئاماری تاوانەکان لە ناوچەکە بەم شێوەیەیە:

| | |
|---|---|
| حوکمدراو بە کوشتن ...... | ٤ |
| حوکمدراو بە تاڵان و جەردەیی .... | ١٧ |
| حوکمدراو بە دزی .... | ٤٣ |
| حوکمدراو بە دزی سووک ...... | ٢٤ |
| حوکمدراوە دواخراوەکانی تر .... | ٣٤ |
| حوکمدراوە دەستبەجێکانی تر ..... | ٢٠٩ |

تاوان بەربڵاو نییە و لە ساڵی ١٩١٩ دادگا تەنیا سێ دانیشتنی بۆ کەیسەکان ئەنجام داوە، بەشی زۆری ئەو تاڵان و بڕۆیە کەمەی ڕوویانداوە نزیکەی هەمووی لە نێوان هەولێر و چەمی بەستۆڕە بووە. لە زۆر حاڵەتدا مەحاڵە بەڵگەی تەواو بۆ تاوانبارکردنی هەر کەسێك پەیدا بکرێت، ڕەنگە باندێك بە هەماهەنگی لەگەڵ چەند کەسێك لە هەولێر کارەکەیان ئەنجام دابێت. وا مەزەندە دەکرێت کە سەرۆکی باندەکە موختاری گوندی بنەسڵاوەی بچووك بێت کە پیاوی حاجی ڕەشید ئاغایە. تەنیا ئەو کاروانانەش ڕووت دەکرانەوە کە لە دوو یان سێ ئاژەڵ پێکهاتبوون.

لە شاری هەولێر باندێکی دزی هەیە کە زۆربەی ئەندامەکانی ئێستا لە زیندانن و حوکمی درێژخایەن بەسەر دەبەن، بەشێك لە گیرفان بڕە لاوەکان لە لایەن پۆلیسەوە کۆنترۆڵ کران. هاتنی کوردە برسییەکان لە ناوچە شاخاوییەکانەوە لە مانگەکانی زستان بووە هۆی ڕوودانی هەندێك سووکە دزی.

کوشتنی ژنان لەبەر گومانی خیانەتەوە لەلایەن مێردەکانیان یان براکانیان پێدەچێت لە ناو هۆزەکانی ئەم ناوچەیەدا کەم نەبێت، زانیاری دەربارەی ئەم جۆرە کوشتنانە دەگەیشت، کەسیش بەڵگەیەکی پێشکەش نەدەکرد. بۆیە مەحاڵە کەیسەکە لە دادگای تاوان یەکلا بکرێتەوە.

ئـەو سـێ كەیسـەی ( لـە سـاڵی ١٩١٩ – وەرگێـڕ) خرانـە بـەردەمی دادگـا ئەمانەن:

***یەكەم: كەیسـی حەسـەنە شـەل***[٣٥] لـە مـانگی نیسـانی ڕابـوردوو هێرشـێكی چەكداری كرایە سەر كاروانێك لە نزیك كەڵەك، لـە ئاكامـدا كەسـێك كـوژرا و دووش بریندار بوون. هەواڵێك لە مەخموورەوە گەیشت دەربارەی ئەو گوندەی كە نزیكـی شوێنی دوو دزەكەیە، جەندرمە ناردران و هـەردوو پیاوەكـە بـە هەنـدێك كەلوپـەلی دزراوەوە لـە گردمامـك دەسـگیركران. دواتـر حەسـەنە شـەل موختـاری گـەڕەكی خانەقا زانیاری پێشكەش كرد بۆ دۆزینەوەی ئەندامانی تری باندەكە. لە كۆتاییـدا ئەندامێكی باندەكە بەڵگەیەكی بایەخداری (شاهانە) پێشكەش كرد و دەركەوت كە سەرۆكی ڕاستەقینەی باندەكە خودی حەسەنە شەلی موختارە و خـۆی ڕابەرایـەتی هێرشی سەر كاروانەكەی كردووە، بەڵام كە بینیبووی چەند ئەنـدامێكی باندەكـەی دەسگیركران، بەڵگەی لە دژی ژمارەیەك بەشداربووانی تاوانەكە پێشكەش كرد بـۆ ئەوەی گومان لەسـەر خـۆی لاببـات. سـەرەنجام حەسـەنە شـەل و دووانـی تـر لـە سێدارەدران و ئەوانی تریش بە زیندانیی درێژخایەن حوكمدران.

***دووەم: كوشتنی سێرگێنت مێسیوون***[٣٦]– لە نۆی مانگی حـوزەیران حـاجی سەید ئاغا كەسایەتیی ناسراوی هەولێر، كە بە سەرخۆشـی و ناقـانوونی ناوبـانگی دەركردبوو. بـۆ ئـەوەی تۆڵـەی ئـەو سـووكایەتییە بكاتـەوە، كـە گوایـە پۆلیسـێك دەرهەق بە كوڕەكـەی ئـەنجامی داوە، لـە كـاتی ئاهـەنگێكی چـەند سـەماكەرێكی عـەرەب ئاشـووبێكی دروسـت كـرد. سـێرجێنت (عـەریف) مێسـیوونی ئەفسـەری مەخفەر ویستی لە شوێنەكەی دوور بخاتـەوە، بـەڵام لـە لایـەن لایـەنگرانی حـاجی سەید ئاغـا تەقـەی لێكرا و كـوژرا. سـێرجێنت كێنـارد مەشـقپێدەری جەندرمـەش برینـدار كـرا. عەبـدوڵڵا ئەفەنـدی (خـاڵی دڵـداری شـاعیر – وەرگێـڕ) فەرمانبـەری (مەئموور) پێشووی تورك لە سێدارەدرا، یونس ئاغای كـوڕی حـاجی سـەعید ئاغـا حـوكمی زینـدانی هەتاهـەتایی بـۆ بڕایـەوە، حـاجی سـەعید ئاغـا بـە پێـنج سـاڵ زیندانیی قورس حوكمدرا.

***سێیەم: كوژراوەكەی تەل ئەلبەعرور***– لە دەوروبەری كۆتایی تشرینی یەكەم مەسیحییەك لە موسڵەوە ڕووی كردە ئەم ناوچەیە بە مەبەستی كڕینـی مـەڕومالآت

و کوژرا. ئەو شەوەکەی لە گوندی تەل ئەلبەعرور (ناوە کوردییەکەی شەمامەرە و سەر بە ناحیەی گوێڕە) مابووەوە و ویستبووی دراوە ڕوپییەکانی بە لێرە بگۆڕێتەوە، بەم شێوەیە زانرا کە بڕێکی زۆری پارە پێیە. ڕۆژی دوایی گوندەکەی بەجێهێشت، بەڵام یەکێك لە دانیشتوانی گوندەکە شوێنی کەوت و تەقەی لێکرد. بکوژەکە مێرمنداڵێکی تەمەن ١٧ ساڵان بوو، کەیسەکە خرایە بەردەم دادگا و مێرمنداڵەکە لە بەر کەمی تەمەنی تەنیا بە حەوت ساڵ زیندانیی قورس حوکمدرا. لە سەرەتای ساڵ دەرکەوت کە جێبەجێکردنی بڕیاری قەدەغەکردنی چەك هەڵگرتن کارێکی قورسە، بەڵام پێدەچێت عەشیرەتەکان بڕیارەکەیان قبووڵ کردبێت، لە مانگەکانی دواتر ژمارەیەکی زۆر کەم چەك دەستی بە سەردا گیرا. لەبەر ڕۆشنایی ئەمە و باری گشتیی ئاسایشی ناوچەکە بە پێویست نازانرێت مۆڵەتی چەك بدرێت.

**دادگاکان**

ئاماری دادگاکان بەم شێوەیە:

*دادگای شەرع*

ژمارەی ئەو داواکارییانەی وەرگیراون ....... ٩٨٠

ژمارەی ئەو بڕیارانەی دراون ........ ٦٢٥

ژمارەی کەیسە هەڵواسراوەکان ........ ٢٢

*دادگای ئاشتەوایی* (Peace)

ژمارەی ئەو کەیسانەی مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە ... ١٢٥٠

ژمارەی ئەو حوکمانەی دراون ... ٤٤٢

ژمارەی کەیسە گواستراوەکان ... ١٣

ژمارەی ئەو کەیسانەی لە چاوەڕوانیدان ... ١٥

*قازی* — محەمەد ڕەشید ئەفەندی پیاوێکە زۆر هەست بە بەرپرسیارێتی دەکات، هیچ گازاندەیەك لە حوکمەکانی نەکراوە. لە مانگی ئەیلوولیشەوە سەرۆکایەتی دادگای ئاشتی دەکات لە شوێنی دەروێش دانش ئەفەندی کە گەڕاوەتەوە ماڵی خۆی لە ماردین ، ئەویش هەروا جێگەی ڕەزامەندی بوو.

**بارودۆخی ناوچەکە**

عەشیرەتەکان هەمیشە بایی ئەوەندەیان هەبوو پێی بژین، بەڵام خەڵکی شار بەڕادەیەك دەوڵەمەند بوون، زۆر بە دەگمەن موحتاج دەبوون. نرخی گەنم بەشێوەیەکی نائاسایی بەرزە، لە دوای ساڵی ١٩١٩ بەروبووم بەرز بۆوە لەجیاتی ئەوەی نزم بێتەوە، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کڕینی گەنم لەلایەن فەرمانبەری کڕین لە کەرکووك. لە کۆتایی ساڵدا نرخی یەك تەن گەنم گەیشتە ٥٠٠ ڕوپیە و تەنێك جۆش گەیشتە ٣٨٠ ڕوپیە. ئێستا باران بارین دوا کەوتووە و کەمە، خەڵکیش خەریکی عەمبارکردنی گەنمەکەیانن تا ئەو کاتەی لە بەرهەمی ساڵی ئاینده دڵنیا دەبن.

بە هۆی خراپیی بەرهەمی بەڕوو لە شاخەکان ژمارەیەك کوردی برسی لە کانوونی یەکەم ڕوویان کردە هەولێر. ڕەنگە پێویست بێت لە زستان بڕێکی کەم دانەوێڵەیان لە ڕێگەی شارەوانییەوە پێبدرێت.

**جەندرمە**

لە زۆربەی ئەو ماوەی باسی لێوە دەکەین، ژمارەی دەزگای جەندرمەی هەولێر گەیشتە ١٦٠ کەس، بەڵام دوای پێشکەشکردنی داواکارییەکی زۆر بۆ دامەزراندن ژمارەی هێزەکە گەیشتە ٢٠٠ کەس. تاکو یەکی تشرینی دووەمی ١٩١٩ ئەرکی ڕێکخستنی ئەم هێزە لە دەست فەرماندەیی جەندرمەی موسڵ بوو.

ژمارەیەك پۆست لە ناوەندی هەموو ناحیەکاندا هەیە، سەبارەت ئەو ئەرکانەی بە جەندرمەی ئێستا سپێردراون بریتین لە دەسگیرکردن، ڕاپێچکردنە بەردەم دادگا، گەیاندنی پەیامەکان و یارمەتیدانی فەرمانگەکانی وەرگرتنی پیتاك و باج. پێشنیازەکان پێشکەش کران بۆ پێکهێنانی هێزێك لەو ٢٠٠ جەندرمە بەهێزانەی ئێستا بۆ کۆکردنەوەی پیتاك و بەرزکردنەوەی قەبارەی پۆلیسی ناوچەکە بە مەبەستی باشتر ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان لە لایەن هێزەکەی ئێستا. بەم جۆرە هێزەکە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئاشووبە عەشایریەکانیش ئامادە دەبێت. بەشی گەورەی هێزی جەندرمە لە خەڵکی هەولێر، کەرکوك و موسڵ پێکهاتبوو و بەشێکی بچووکیشی لە ژمارەیەك کورد و عەرەبی ناوچەکە. پاش ماوەیەك چەند

مەسیحییەکی دانیشتووی عەنکاوەش خۆیان لە ریزی هێزەکە ناونووس کرد. ئەو جەندرمانەی پێشتر لە ژێر دەسەلاتی تورك خزمەتیان کردووە، ناتوانن دەستبەرداری شێوازی تورکەکان بن. ژمارەیەکی زۆر لەمانە دەرکران و کەسانی لاو لە شوێنیان داندران. لەم چەند مانگە کەمەی دوایی ژمارەیەکی زۆر کەم سکالا لەسەر ئازاردانی خەڵك لە دژی جەندرمەکان تۆمار کراوە. گەورەترین بەشی جەندرمە ٣٠٣ پارچە چەکی هەیە؛ لەگەڵ ئەوەش تا ئێستا کەلوپەلەکانیان زۆر ناتەواون.

هیچ ئەفسەرێکی بەریتانی نەنێردراوە بۆ هەولێر بۆ سەرپەرشتیکردنی جەندرمەکان، جگە لە چەند ڕۆژێکی تشرینی دووەم نەبێت. سێرجێنت کێنارد لە مانگی شوبات وەك مەشقپێکەر گەیشتە هەولێر، زیرەکیی ئێستای ئەو پیاوانە توانایەکی گەورە بە بەهرەی ئەو دەبەخشێت.

بەلاّم هەندێك ئەفسەری خۆجێی عەرەب سەرکەوتنی خۆیان سەلماند. یەکەم: یوزباشی عیسا ئەفەندی کاری نەکرد؛ دووەم: محەمەد عەلی ئەفەندی دوای سەرەتایەکی باش تەمبەڵ و گەندەڵ بوو. بەهەر حاڵ یوزباشییەکەی ئێستا، سەید عەلی ئەفەندی (عەرەبێکی سورییە — وەرگێڕ) لە دوو سێ بۆنەدا ئازایەتی خۆی سەلماندووە و زۆر ئیشکەرە و هەروەها لێهاتووشە. مولازم جەمیل ئەفەندی کە سەرەتای ساڵ لە گوێڕ بوو، ناوبانگی بە ڕاستگۆیی و بەتوانایی دەرکردووە. گشت جەندرمەکان بە خێرایی پێشکەوتن و دەستیان کرد بە گەشەپێدانی گیانی دەستەیی. بەشێکی بچووکیان هەڵوێستێکی زۆر چالاکانە و ژیرانەی لە کاتە ئەستەمەکانی ڕواندز نواند لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٩دا.

### پۆلیس

ساڵی ڕابوردوو ڕێکخستنی پۆلیس لە ئەستۆی کاپتەن جی. ئێف. ویلکنس فەرماندەی پۆلیسی موسڵ بوو، بێگومان ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل دەنووسێت. پۆلیسی هەولێر لە ژێر فەرماندەیی ئێچ. سی. ڕۆبنس کاری نایابی ئەنجامدا، تا ئەو ڕادەی کە نزیکەی هەر هەموو ئەو تاوانبارە پیشەکارانەی پێشتر شاریان لە زەواق نابوو ئێستا لە زینداندان. لێهاتوویی ئەم هێزە مایەی پێزانینێکی زۆرە و

ئەوان شـەقامەکانیان خۆشـتر و ڕازاوەتـر کـردووە. جارێکیـان سـکاڵایەکی زۆر لـە پۆلیس کرا و مەسەلەکەش بە کوژرانی سێرجێنت مێوسیوون تەواو بوو، کە پێشتر باسی لێوەکرا. دواتر دوو سێ کەسی خراپ دەرکران و لەو کاتەوە هـیچ سـکاڵایەك پێشکەش نەکراوە.

پەیوەست بەو کوشتنەی لە سەرەوە ئامـاژەی پێکـرا، دەمـەوێت ئامـاژە بـە لێهاتوویی و توانای هزری باشکاتب (ئێستا ی. ئەفسەری پۆلیسە) عیزەدین بکەم، کە تـوانی هـەموو ئەوانـەی کـە خـەڵکیان بێـزار دەکـرد یەکسـەر دوای ڕووداوەکـە دەستگیر بکات.

ئاماری کەیسەکان کە پۆلیس مامەڵەی لەگەڵدا کـردوون لـە سـاڵی ١٩١٩ بـەم شێوەیەیە:

| | ژمارەی کەیسەکان | کەسە دەستبەسەرکراوەکان | حوکمدراوەکان |
|---|---|---|---|
| حوکمی نا دەستبەجێ | ١٥ | ٤٣ | ٢٧ |
| حوکمی دەستبەجێ | ١٩٠ | ٢٩٨ | ٢٧٠ |

## کشتوکاڵ

ڕەنگە ناوچەی هەولێر دەوڵەمەندترین ناوچەی بەرهەمهێنەری گـەنم بێـت لـە میزۆپۆتامیا و پـێش شـەڕ بڕێکـی زۆر دانەوێڵـە بـۆ بەغـدا و تەنانـەت مارسـیلیاش دەناردرا. "ڕەشگوڵ" و "قەندەهاری" دوو جۆری سەرەکی گەنمەکە بوون. ئێستا زەوییـەکی زۆر بـە نەکێڵـدراوی ماوەتـەوە نـەك لەبـەر کـەمیی دانیشـتوان وەك شـوێنەکانی تـر، بـەڵکو لەبـەر ئـەوەی تورکـەکان هـەموو ئاژەڵـەکانی جووتیـان بردووە. لە سـاڵی ١٩١٩دا نزیکـەی ٣٠٢ گوێرەکـەی نێـر لـە لایـەن هـەردوو بەشـی دارایی و کشتوکاڵ دابین کران، بەڵام ئەوە بە هیچ شـێوەیەك پێداویسـتییەکان بـە تەواوی دابین ناکات. ئەو ئاژەڵەی بەشـێوەی سروشـتی بـەکاردێت هێسـترە و دوو هەزار هێستریش بۆ کاری کێڵان لە ناوچەکە پێویستە.

**بەروبوومە زستانییەکان**

ئەو شێوە چاندنەی بەروبوومە زستانییەکان کە ئێستا پەیڕەو دەکرێت، هەمان ئەو شێوەیەیە کە پێش چەند سەدەیەك پەیڕەو دەکرا، بەڵام ئێستا خەڵك بە تاسەوە داوای ئامێرە کشتوکاڵییە نوێیەکان دەکەن. زەوی لە زستان و بەهار شۆ و وەرد دەکرێت و لە کۆتایی هاوین و لە پایز تۆ دەکرێت. بەدەگمەن لە کاتی تۆکردندا ئاو دەدرێت (ڕەباس)[٣٧]. لە زستانی ١٩١٨–١٩١٩ زەوییەکی زۆر کەمی ئامادەکراو هەبوو. لەگەڵ باران باریندا زەوییەکان کێڵدران و یەکسەر تۆ کران، ئەم جۆرە چاندنە پێی دەگوترێت "تەڕەکار"[٣٨]. ئەم زستانەش بەشێکی زۆری تۆکردنەکە بە شێوەی تەڕەکار بوو. بەرهەمی ئەم شێوە چاندنە "تەڕەوەز" ٢٥٪ تا ٥٠٪ – کەمترە لە بەرهەمی ئەو دانەوێڵەیە کە لە زەوییەکی باش ئامادەکراو دەچێندرێت. کێڵانەکە زۆر قووڵ نییە و "وەرد" – ەکەش لە مانگەکانی هاوین بە حوشترالووك و گیاوگۆڵی (بژار) تر دادەپۆشرێت. کێڵانی قووڵ ئەنجامی زۆر بە سوودی هەیە.

بەرهەمی ١٩١٩ مامناوەندی بوو، ئەمەیش بۆ کەمی باران لە مانگی ئادار و سەرەتای نیسان دەگەڕێتەوە. ئەو بارانە زۆرەی لە کۆتایی مانگی نیسان و لە ئایاردا باری زیانی بە جۆری گەنمەکە گەیاند. دانەوێڵەی دەوروبەری مەخموور بە تەواوی فەوتا، بەڵام لە ناحیەی گوێڕ تاڕادەیەك لە سەرووی ڕێژەوە بوو.

بەپێی خەمڵاندنی بەشی داهات بووایە دەبوو داهاتەکە زۆر لەوەی هەیە کەمتر بێت، هەموو بەرهەمی ناوچەکە لە ساڵی ١٩١٩ بەم شێوەیە بوو:–

گەنم ............... ٧٣٩٧ تەن

جۆ ............... ٥٩٥٥ تەن

پێش شەڕ ڕەنگە ژمارەکان پێنج بەرابەری ئەو بڕە بووبن. لە ژێر سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی فەرمانبەری فەرمانگەی موسڵ چەند تاقیکردنەوەیەك ئەنجامدران بۆ دۆزینەوەی ڕێژەی بەرهەمی دانەوێڵەکان پەیوەست بەو زەوییانەی داچێندراون و ئەم ئەنجامانەشی لێکەوتەوە:

| دانەوێڵە | ژمارەکان نزیککراونەتەوە بە پاونێك لەهەر هێکتارێك | | |
|---|---|---|---|
| | پلەی یەکەم | پلەی دووەم | پلەی سێیەم |
| گەنم | ١٤٠٣ | ٨٧٦ | ٣٠٧ |
| جۆ | ١٨٣٤ | ١١١٩ | ٤١٥ |

بەروبوومە زستانییەکانی تر بریتین لە گاگۆز و کیزێن کە جۆرە دانەوێڵەیەکە دەرخواردی ڕەشەوڵاغ دەدرێت.

**بەروبوومە هاوینییەکان**

بەروبوومە هاوینییەکان لە ناوچەکە بە ڕادەی بوونی ئاوەوە بەندە کە بەشە هەرە زۆرەکەی لە ڕێی کارێزەکانەوە دابین دەکرێت. کارێزەکان زۆر کۆنن. دەگوترێ کە لە سەردەمی خەلافەتدا (Khlifate)، ٣٦٥ کارێز لە نێوان هەولێر و پردێدا دروست کراون. پەنجا تا شەست دانەیان ماوە، هەندێك کارێزی کۆنیش نۆژەن کراونەتەوە، هەرچەندە پارەیەکی یەکجار زۆری تێدەچێت. برایم ئاغا پار ساڵ سێ کارێزی لە مەخموور لێدا بەلام بە ڕادەیەکی کەم سەرکەوتوو بوو. دەبێت بڕێکی زۆر ئاو لە قووڵاییەکی کەم لەهەر شوێنێکی دەشتی هەولێر هەبێت و پێویستە هەوڵیش بدرێت بۆ ئەوەی دەستەبەر بێت. ڕەنگە ئاشی با لەم بوارەدا کاریگەر بێت.

بەروبوومی هاوینەی سەرەکی برنجە، لە دەشتی هەولێر یەك بە ٣٠٠ یان ٤٠٠ بڕ دەکات. هەندێك جار گەیشتۆتە یەك بە هەزار. ئەو جۆرەی زۆر دەچێندرێت پێی دەڵێن "گردە"، لەکاتی لێنان دەنکەکانی گەورە و قورس دەبن. ئەم ساڵ لە هەندێك شوێنیش جۆری عەنبەر و سەدری تۆ کران. بەرهەمی ١٩١٩ لە ڕێژە بە سەرەوەتر بوو، جگە لە چەند پارچە زەوییەکی بچووکی بنار شاخەکان نەبێت کە بەرهەمەکەی بەهۆی جۆرێك کوللەوە بە تەواوی فەوتا.

دووەمین بەروبوومی گرنگ دەرەی سپییە (الذرة البيضاء)، بە ڕادەیەك کە عەرەبەکانی سەر دجلە و زێی بچووك زەوییەکی زۆریان بۆ تەرخان کردووە. لە ڕێگەی بەرزکردنەوەی ئاستی ئاو، ئاودێری دەکەن. ئەم ساڵ دانەوێڵەکان زۆر خراپ دووچاری بەڵای جرجەکان ببوون.

سەرجەم داهاتی دانەوێڵە هاوینییەکان بە پێی خەمڵاندنی بەشی دەرامەت بەم شێوەیەیە:

| بەرووبوومەکان | تەن | کیلۆگرام |
|---|---|---|
| برنج (زستانە) | ٥١٨ | ٦٠٠ |
| گەنمەشامی | ١٤ | ٤٨٥ |
| دەرەی سپی (الذرة البيضاء) | ١٠٢٥ | ٩٥٠ |
| هەرزن | ٦٨ | ٥٠٠ |
| کونجی | ١٠ | ٢١٠ |
| نۆك | ٣ | ٧٢٥ |
| ماش | ١٦ | ٩٠١ |

**پەمۆ**

پەمۆ لە زۆر شوێنی ناوچەکە بە بڕێکی کەم بۆ دابینکردنی پێداویستی ناوخۆ دەچێندرێت. جۆری پەمۆکە زۆر خراپە. لە ساڵی ١٩١٩ بەرهەمی پەمۆ لە گوێڕ باش بوو، بەڵام لە زۆر شوێنی تر خراپ بوو. هەندێك لە بەرپرسە خۆجێیەکان چاودێری تاقیکردنەوەی دانەوێڵەیان کرد، کە فەرمانبەرانی فەرمانگەی موسڵ ئەنجامیاندا و پێی سەرسام بوون. داواکارییەکی خۆجێیی زۆر لە سەر تۆی ئەمریکی هەیە. بەرهەمی پەمۆ لە ساڵی ١٩١٩ بە ١٩ تەن خەمڵێندرا.

**سەوزەوات**

سەوزە هاوینییەکان، وەك تەماتە، باینجان، بامیە، کاڵەك... تاد، زۆر بە خراپی گیرۆدەی کەڕەکیفە بوون. بەشی هەرە زۆری ئەم سەوزەواتەش لە دەرەوەی شار دەچێندرێن. سەوزەواتە زستانییەکانی وەك شێلم، توور، کەرەوز، کەوەر و سپێناغ زۆر زۆرن. خەڵك زۆر بە پەرۆشەوەن بۆ ئاشنابوون بە جۆری نوێی سەوزە بە تایبەتیش پەتاتە.

**باخەکان**

باخی میوە و ڕەزی ترێ لە دەوروبەری هەولێر و گوندەکان زۆر کەمن. بەتایبەتیش لە بناری (Submontane) ناوچەکە، جگە لەو باخانەی کە تەنیا

پێداویستیی خاوەنەکانیان دابین دەکات. ڕەزەکـانی تـرێ لـە سـاڵی ١٩١٩ لـە زۆر حاڵەتدا تووشی کەڕەکیفە بوون، کە ڕەنگە بەهۆی ئەو بارانە ناوەختە بێت کە بـە درەنگەوە باری. ئەو مێوەیەیەی لە ناوچەکە دێتـە بەرهـەم بریتییـە لـە: قەیسـی، خۆخ، هەڵووژە، سێو، هەنجیر، هەنار... تاد.

لیفتنانت – کۆلۆنێل جەی. ئێم برچ فەرماندەی فەرمانگەی موسڵ لـە بۆنـەی جیاجیادا ناوچەکەی بەسەر کردەوە.

**قەرزەکان**

لە زسـتانی سـاڵی ١٩١٩ قـەرزێکی سـنووردار بـە جووتیـاران درا. زۆربەشـی وەرگیرایەوە تەنیا ئەوەی مەخموور نەبێت، وا بە پێویست زانرا بۆ سـاڵی داهـاتوو دوابخرێت. نزیکەی ٩٠٠٠ ڕوپیە پـارەی کـاش درایـە عەرەبـەکانی کـەنار دجلـە بـە مەبەستی کۆمەککردنیان لە چاندنی دەرەی سپی، هەروەها بڕێك تۆش بۆ تۆکردن بـە قـەرز درایـە جووتیـاران. زۆر پێویسـتە لـەم ناوچـەیە قـەرزە کشـتوکاڵییەکان دەسـتی پێوەبگیرێـت، چـونکە لـە زۆر حاڵەتـدا خـاوەن زەوییـەکان ئاغاکـانن و پێویستە خۆیان تۆ بۆ وەرزێرەکانیان دابین بکەن، خاڵی مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە چۆن یارمەتی ئـەو گوندانـە بـدرێت کـە جووتیارەکـان خۆیـان خـاوەن زەویـن. خشتەی ئەو تۆیەی بە قەرز دراوە لە پاشکۆکاندا هەیە (تەماشای پاشکۆی دووەم بکە).

لە سـاڵی ١٩١٩ بـە شـێوەیەکی بەرچـاو ئـاگر لـە پـووش و پـاوانی ناوچـەکە بـەربوو و تـەواوی ناوچەکەشـی گرتـەوە بـە بنـاری شـاخ و گردۆڵکەکانیشـەوە، هەرچەندە ئاگرکەوتنەکە زیانێکی بچووکی بە دانەوێڵەکان گەیاند، بەڵام لەوەڕگە و پاوانـەکانی فەوتانـد. موختـاری گونـدەکان پارەیـەکی باشـیان لـە بەکرێـدانی پاوانـەکان دەسـت دەکـەوت لـە کـاتی کۆچـکردنی عەشـیرەتەکانی ناوچـە شاخاوییەکان بەرەو پێدەشتەکان.

**کەشوهەوا**

باران بارین هاوکات لەگەڵ ڕۆژی داگیرکردنی هەولێر (١٩١٨/١١/١١) دەسـتی پێکـرد. بـاران بارینەکـە لـە مانگـەکانی کـانوونی یەکـەم و کـانوونی دووەمـیش

بەردەوام بوو، تا ڕادەیەکیش لە مانگی شوبات. پلەی گەرما لە سەرەوەی ئاسایی بوو. مانگەکانی ئادار و نیسان بێ باران بوون، بەڵام دواتر ناو بەناو تا ناوەڕاستی مانگی ئایار دەباری، لە سەرەتای مانگی تەمووز بڕێکی زۆر کەم باری. پلەی گەرما تاکو مانگی تەمووز مامناوەندی بوو. لە دوایین دوو هەفتەی تەمووز و یەکەمین هەفتەی ئاب زۆر گەرم بوو بە ڕادەیەکی پتر لە ناوچەکانی تر. لە ڕۆژەکانی تری ئاب پلەی گەرما مامناوەندی بوو. هەوا لە مانگەکانی ئەیلوول و تشرینی یەکەم خنکێنەر(Stuffy) بوو، سەرباری ئەوەی لە تشرینی یەکەمدا گەردەلوولێکی توند هەڵیکرد. هەردوو مانگی تشرینی دووەم و کانوونی یەکەم سامالْ و خۆش بوون، تەنیا لە ١٦ تا ٢٠ — ی کانوونی یەکەم باران باری. پێوەری باران بارین تاکو مانگی نیسان نەگەیشتبوو. بڕی باران لەدوای ئەو کاتەوە بەم شێوەیە بوو:

| مانگ | ژمارەی ڕۆژەکانی باران بارین | بڕی باران بارین |
|---|---|---|
| نیسان | ٢ | ١.٣٥ |
| ئایار | ٦ | ٤,١٥ |
| کانوونی یەکەم | ٨ | ٥٧,٠٠ |

**داهات**

لە کاتی داگیرکردنی هەولێر، هەندێك عەمبار بڕێکی باشی گەنم و جۆ تێدا بوو. بەڵام ئەوانی تر لە لایەن کوردە دزەییەکانەوە تاڵان کران و دواتر بەشێکی زۆری گەڕاندرایەوە. دانەوێڵەکە لە ساڵی ١٩١٨ کۆکرابووەوە و بریتی بوو لە بەرهەمی دانەوێڵە زستانییەکان و هەروەها ئەو بەشە زۆرەی کە بۆ مەبەستی سەربازی دەستی بەسەردا گیرابوو. بەشێکی زۆر لەم دانەوێڵەیە بە قەرز بۆ تۆکردن درایە جووتیاران و پارەکەشی درایە دەسەڵاتدارێتی سەربازی. چاو لە قەرزەکانی بەروبوومە هاوینییەکانی ١٩١٨ پۆشرا.

**ڕێکخستن**

تاکو ئەیلوولی ١٩١٩ شێوەی ڕێکخستنی ناوچەکە وەك سەردەمی تورکەکان مابووەوە، بۆ نموونە هەر ناحیەك بەڕێوەبەرێك (مدیرێك -Mudir) بەڕێوەی دەبرد

و هـەردوو دەسـەڵاتی دادوەری و دارایـی هـەبوو، عـەلی بـەگی مـال مـودیر (Mal Mudir) کە پاشماوەی سەردەمی تورکەکان بوو، زۆر خاو و خلیچ بوو و زۆر خۆی بە کۆنترۆڵکردن یان یارمەتیدانی مدیر ناحیەکانەوە مانـدوو نـەدەکرد، لـە کۆتـایی ئەیلوول لەسەر کار لادرا و ئەنوەر ئەفەندی لە شوێنەکەی داندرا، کـە کارمەنـدێکی بەتوانا و لێهاتوو و بێ کێشە و بوغز بـوو. لەهـەمان کاتـدا بەڕێوەبـەری ناحیـەکان ناوونیشان و دەسەڵاتی دادوەرییان لێ سـەندرایەوە و بوونـە (مـەئموور شـوعبە — Mamur Shubah) و لە هەموو ڕوویەکەوە سەر بە مال مودیر بوون.

### فەرمانبەرەکان

پێدەچێت زۆر زەحمەت بێت بەڕێوەبەرێك یان مـەئموورێك پەیـدا بکـەیت کـە لەهەمان کاتدا دڵسۆز بێت و کارامەش بێـت. مـدیر ناحیـە تورکـەکانی مـەخموور و گـوێڕ، دوای داگیرکـردن ماوەیـەکی زۆر کـورت لـە پۆسـتەکانیان مانـەوە و دوایـی لادران، چونکە نەیانتوانی خۆیان لەگەڵ سیستەمی حکوومەتی تـازەدا بگـونجێنن. بەڕێوەبەری ناحیەی قووشـتەپە لـە ئـابی ١٩١٩ لادرا لـە بـەر ئـەو کەمتەرخەمییـە گەورەیەی دەربارەی خەملاندنی زستانە کردبووی، هەروەها گومـانی گەندەڵیشـی لێدەکرا. عەزیز ئەفەندی کەرکووکلی بەڕێوەبەری ناحیـەی گـوێڕیش دوای ئـەو بـە چەند هەفتەیەکی کەم لادرا، لە بەر ئەوەی بە هەندێك کرداری گوماناوی تۆمـەتبار کرابوو لەمەڕ خۆدزینەوە لـە دادگـا لـەو کاتـەی تۆمـەتێکی مەترسـیداری خرابـووە پاڵ. ئەحمەد ئەفەندی بەڕێوەبەری ناحیەی هەولێر، تورکێکی عوسمانی بوو، ئـەو ڕۆژەی وادەی مانەوەی لە پۆستەکەیدا تـەواو بـوو، دەسـتی لـە کـار کێشـایەوە و گوژمەی ٦٠٠٠ ڕوپیەش لە بودجەی کـورتی (عجـز) هێنـابوو. سـەرەنجام لـە نزیـك ڕواندز دەستگیرکرا، دوای پێکدادانێك کە دوو پیاوی تێدا کوژرا و ئێستا لە هـەولێر لە زیندانە. بەشێکی زۆری پـارەی عەجزەکـەی گەڕانـدەوە. مـەئموور شـوعبەکانی ئێستا زۆر دەستپاك و ئیشکەرن سەرەڕای ئەوەش بـەتوانان، بـەڵام زۆر بـە خـاوی فێری ڕێگە ڕاستەکانی چۆنییەتی پاراستنی دەرامەت دەبن.

لـە سـاڵی ١٩١٩ هەنـدێك بارەگـای نـوێ بـۆ مـەئموورەکان لـە قووشـتەپە و دیبەگە دروست کران، هەروەها نووسینگەیەك و مێوانخانەیەك لـە گونـدی سـەفینە

بەرامبەر شەڕگات لە سەر دجلە دروست کران و ئەم دووانەی دوایی تەسلیمی حاکمی سیاسیی موسڵ کران.

### کۆدە

کۆدە (سەرانە – وەرگێڕ) بەشێوەی یەك ڕوپیە بۆ هەر سەر حوشترێك یان گامێشێك و هەشت عانە (نیو ڕوپیە – وەرگێڕ) بۆ یەك سەر مەڕ داندرا. سەرژمێری ئاژەڵەکان بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە نەچوو، بەلام فەرمان بە موختارەکان درا لیستێك بە ژمارەی مەڕومالاتی گوندەکانیان بدەنە مودیرەکان (Mudirs). هەڕەشەی سەپاندنی غەرامەیەکی زۆر لە هەر کەسێك کرا کە خۆی لە باجەکان بدزێتەوە. سەرژمێرییەکە تا ڕادەیەك جێگەی ڕەزامەندی بوو و زۆربەی ئەو گوندانەی سەر بە هیچ هۆزێك نەبوون ژمارەی دروستیان دا، بەلام ئاغا دزەییەکان بێگومان نەختێکیان کەم کردەوە.

### بەروبوومە زستانییەکان

خەملاندنی بەروبوومە (دانەوێڵە) زستانییەکان لە حوزەیران و تەمووز ئەنجامدرا، بەشێك لە هۆی دواکەوتنەکە پشێوییەکەی سلێمانی و هەڵوێستی ناڕازییەکەی ئاغا دزەییەکان بوو، ئەمەیش بووە مایەی ناڕەزامەندییەکی زۆر و ڕەنگە دوو سێ لاخ[٣٩] دەرامەت فەوتابێت. لە مەخموور بەروبوومەکان کەم بوون و خەملاندنەکەش مەعقوول بوو، هەروەها لەوەتای زانیومە مودیر ناحیەی گوێڕ بڕێکی زۆر پارەی کۆکردۆتەوە ئەنجامەکان ئەوەندە خراپ نین، بەلام لە سێ ناحیەکەی تر بەروبوومەکان پەنجا لە سەد یان پتر لە ژێر ئاستی خەملاندن بوو. مێجەر موری بۆ خۆی هەندێك جۆی لە کەندێناوە سەرلەنوێ خەملاندەوە. هەروەها جێگرەکەی هەمان کاری سەبارەت گەنم لە ناحیەی قووشتەپە کرد. لە حاڵەتی دووەمدا بینرا کە خەرمانی حاجی پیرداود ئاغا بە سێ تەن خەملێندراوە، بەلام دەرکەوت کە نزیکەی ١٥ تەن دەبێت، هەرچەندە لە زۆربەی هەرە زۆری گوندەکان خەملاندنی دووەم دوو بەرابەری خەملاندنی یەکەم بوو. لە میانەی هەرای دزەیی، لە ناحیەی کەندێناوە خەڵکەکە لە لایەن مودیر و خەملێنەرەکان دەرفەتی (Advantage) خۆدزینەوەیان پێدرا تا گەنمەکانیان هەڵگرنەوە (لادەن).

هەر بۆیەش دووبارە خەملاندنەوەی گەنمەکە ئیمکانی نەبوو، بەڵام داواکاری لە سەر گەنم بەڕادەیەك زیادی کرد تا گەیشتە ئاستی داواکاری لە سەر جۆ. لەم ناحیانە هەندێك شت کرا بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخەکە. بەڵام دەربارەی خەملاندن لە ناحیەی هەولێر زانیارییەکان بە ڕادەیەك زۆر درەنگ گەیشتن، کە دەرفەتی هیچ کارێك لە ئارادا نەمابوو.

دانەوێڵەکان بە شێوەیەکی هەڕەمەکی خەملێندران و خەملاندنە سەرپێییەکان زۆر ورد نەبوون و لەم ناوچەیە هێشتا هەژمارکردن (حسابکردن) ناتەواوە. دەرامەتی دانەوێڵە زستانییەکان بەم شێوەیە کۆکرانەوە: ١٠ لە سەد بۆ زەوییە تاپۆکراوەکان و ١٧,٥ لە سەد بۆ زەوییە مودەوەرەکان (Mudawwarah) خەملاندنەکان کۆنەکرانەوە و بێگومان هەستم کرد کە کاریگەریی پێشکەشکردنەکە بگەڕێتەوە بۆ کەمبوون یان باشتر زیادبوونی دەرامەت. هیچ ئاستەنگێك لە بواری کۆکردنەوەی دەرامەت نەهاتە پێش و ژمارەکان لە پاشکۆی سێیەم دەبیندرێن.

### بەروبوومە هاوینییەکان

دەرامەتی بەروبوومە هاوینییەکان بەهەمان ڕێژە کۆکرانەوە، جگە لەو بەروبوومانەی لە سەر ئاوی کارێزەکانی حکوومەت دەکرێن، ٣٠ لە سەدیان لێ وەرگیرا و کانییەکانیش ٢٠ لە سەد. سێ جۆرە ئاستی خەملاندن پەیڕەو کران: یەکێك بۆ کارێزەکان و یەکێك بۆ کانییەکان وەك ئەو کانییە بچووکانەی پتر لە بنار شاخەکان هەن و سێیەمیش بۆ زەوییە کشتوکاڵییەکانی سەر زێی دجلە. هەرزنی هۆزی جبوور لە سەر بنەمای لاسك (بە سەوزی – وەرگێڕ) خەملێندرا ئەم هۆزە پسپۆڕە لە شاردنەوەی دانەوێڵەکەیان، هەروەها خەملاندنی پەمۆش بەم شێوەیە بوو، بەڵام برنج، گەنمەشامی، کونجی، تاد پتر بە کۆمەڵ (Heap) دەخەملێندرا. سەوزەوات و کاڵەك بە بەهاکانیان دەخەملێندران نەك بە کێش، ئەو کشتوکاڵانەش کە بە لە کەنار ڕووبار (River-bed) دەکرێن باج لە سەر بنەمای ژمارەی چاڵە لێدراوەکان هەژمار دەکرێت و هەر چاڵێك بە نیو عانە مەزەندە کرابوو.

سەبارەت باخەکانی میوەجات هەندێك جار بەهای بەرهەمەکە دەکرا بنەمای خەملاندن، هەندێك جاریش ژمارەی درەختەکان هەژمار دەکرا و ڕێژەیەکی لێ دەردەهات بۆ حسابکردنی خەملاندنەکە کە بریتی بوو لە ٢,٥ کیلۆ تریّ بۆ هەر دار مێوێك کە تەمەنی لە ١٥ ساڵ کەمتر بێت و یەك کیلۆ تریّ بۆ هەر دار مێوێك کە تەمەنی لە ١٥ ساڵ پتر بێت.

لە کانوونی یەکەمی ١٩١٩ هەر سیّ کارێزی گوندەکانی دۆغان دەرە، سەعداوە و ئەبو جەردە (هەر سێکیان سەر بە ناحیەی گوێڕن – وەرگێڕ) خرانە سەر ساڵی ١٩٢٠. کارێزەکەی سەعداوە لە مەزاد گەیشتە گوژمەی ١٢٠٠٠ ڕوپیە، بەڵام دووەکەی تر ڕەواج و کرێیان کەمتر بوو، کارێزی دۆغان دەرە گەیشتە ٥٠٠٠ ڕوپیە و ئەوەی ئەبو جەردەش گەیشتە ٤٧٥٠ ڕوپیە.

## گومرگ، تووتن و داهاتە جۆراوجۆرەکان

لە کاتی داگیرکردنی هەولێردا ژمارەیەك دەزگای لێك جیا هەبوون بۆ وەرگرتنی باجی تووتن، داهاتی جۆراوجۆر، بەشی گشتی و گومرگ. دوای هاتنمان ئەم سێیەی دوایی یەکسەر بەیەکەوە گرێدران و دواتر لە مانگی تەمووز ١٩١٩ – وە هیچ پێویستییەك بۆ دەزگای پەراکەندەی تووتن نەما. سەبارەت باجی تووتن، باجەکانی مازوو و کەتیرە و گومرگ بڕی پارەی وەرگیراو تاکو مانگی ئاب زۆر کەم بوو، وەك ئەو دەزگایانەی کە باجیان لە ڕواندز و شەقلاوە کۆدەکردەوە. بەهەر حاڵ بە چۆڵکردنی ڕواندز گومرگ و باجی مازوو و کەتیرە بوونە سەرچاوەیەکی گرنگی داهات. لە لایەکی ترەوە داخستنی عەمبارەکانی تووتن لە شەقلاوە لە کۆتایی ساڵدا، وا دەکات داهاتی تووتن لە هەولێر بە شێوەیەکی بەرچاو زیاد بکات.

لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩١٩ دەزگای کۆکردنەوەی دەرامەت لە هەولێر پێکهاتبوو لە:

یەك بەڕێوەبەر، دوو کاتب، چوار سوارە و دوو قۆڵچی (پاسەوان) پیادە.

لە ساڵی ١٩١٩ هیچ کۆگایەکی باش نەبوو بۆ عەمبارکردنی تووتن لە هەولێر، تەنیا باجی سەر ئەو تووتنە کۆکرایەوە کە بۆ بەکارهێنانی ناوخۆ تەرخان کرابوو

و لە هیچ شوێنێکی تر باجی لێ وەرنەگیرابوو. باج و خەراج (میرانـە) بـۆ موسـڵ و شوێنەکانی تـر بـە وریـایی و پارێزگارییـەوە دەنـاردرا. لـە سـەردەمی حـوکمڕانیی عوسمانییەکانـدا ڕێـژەی ١٢,٥٪ — ی بـەهای تـووتن وەردەگـیرا وەك دەرامـەتی زەوی و لە هەر کیلۆیەکیش ٥,٢٠ پارە (٠,١٣ قرووش) وەردەگیرا وەك بـاج، دوای لادانی ٣٣,٣٣٪ بۆ لاسك (Stalk). ئێمە ڕێژەیەکی چەسپاومان دانا کە بریتی بوو لە هەشت عانە بۆ هەر کیلۆیەك. لە ساڵی ١٩١٩ بڕێکی بەرچاو تـووتن لـە ناوچـەی هەولێر چاندرا سەرەڕای ئەوەی کە لە سەردەمی عوسمانییەکاندا قەدەغە کرابـوو. ئـەم بـڕە مەزەنـدەکرا و بـاجی هەشـت عانـە بـۆ هـەر کیلۆیـەك لـە جووتیارەکـان وەرگیرێت. ئەو تووتنەی دەهاتە هەولێر سەرچاوەکەی ڕواندز و شەقلاوە بوو.

ڕێژەی باجی سەر مازوو و کەتیرە ١٢,٥٪ — ی بەهاکەیـەتی. بـڕە زۆرەکـەی ئەم بەروبوومانە لـە کۆتـایی سـاڵدا هـات. بەرهـەمی ١٩١٨ بـوو و لـەو کاتـەوە لـە ڕواندز و دەوروبەری عەمبار کرابوو. لە ساڵی ١٩١٩ دانەوێڵە خراپ بوو.

بەپێی فەرمانی حاکمی سیاسیی موسڵ باجی دە عانە لە سەر کیلۆیەك خوێ هەڵگیرا و لە جیاتی ئەوە فرۆشیارەکان پسوولەی میرانەیان (Fee) بـە بـەهای ١٥ ڕوپیە بۆ یەك ساڵ پێدەدرێت.

سـەبارەت بـاجی ئـارەق و شـەڕاب، تـەنیا دوو شـوێنی ئـارەق دروسـتکردن (Still) و دوو فرۆشیاری خاوەن مۆڵـەت لـە هـەولێر هەیـە. بـۆ هـەر ١٠٠ کیلـۆگرام مێوژی بەکارهاتوو بۆ شەڕاب باجی ٤٦—٤٨ ڕوپیەی لە سەر داندراوە و باجەکەش کۆکرایەوە. نرخی فرۆشتنی مۆڵەتی ساڵێك ٢٥ ڕوپیەیە. ئەو شەڕابەی لە هەولێر و عەنکاوە دروست دەکرا باجی دوو عانە لە هەر کیلۆیەك تـرێ وەردەگیرێت. بـاجی هـەنگوین هەشـت عانـە لـە هـەر پلوورەیـەك (کوورەیـەك) وەردەگیرێت. بـە پێـی سەرژمێری مەئموور شوعبە ١٣٦٦ کوورەی هەنگ لە ناوچەکە هەیە. باجی ماسـی گرنگ نییە چونکە ماسی تەنیا لـە مـانگی شـوبات لـە زێـی گـەورەوە دەهێندرێتـە هەولێر، ئەو کاتەی کە ئاو لێڵە و ماسییەکان بە تۆڕەکانەوە دەبـن، هـەروەها ئـەو کاتەی کە هەتاو گـەرم نییـە و ماسـییە ڕاوکراوەکـان بـە ڕێگـاوە تـا دەگەنـە شـار بۆگەن نابن. باجی ڕاوە ماسی ٣١٥ ڕوپیەیە بۆ سـاڵێك. بـاجی فـەڕوە ٢,٥٪ — ی نرخەکـەیتی. مۆڵـەتی یـاریش کەمـە. سـەرجەم دەرامەتەکـەمان لـە یـەکێك لـە

پاشکۆکان دیاری کراوە (بڕوانە پاشکۆی سێیەم). تا دەستبەردار بوونی ڕواندز گرنگی دەرامەتی گومرگ دەرنەکەوت. لە پێشان پۆستەی هەولێر بۆ وردبوونەوە لە مەبەستەکان داندرابوو. دوای دەستبەردار بوون لە ڕواندز، مەئموورێکی گومرگ بنکەیەکی لە تەنگەی کانی وەتمان دانا و هەموو ئەو کالاَیانەی دەپشکنی کە لەوێوە ڕەت دەبوون و زانیارییەکانی بە درێژی دەرنادە هەولێر، واتە بۆ ئەو شوێنەی کە باجەکانی لێ وەردەگیرا. بەلاَم بۆ ئەو بارە نا ئاسایشییەی لە ناوچەی ڕواندز هەیە دەرامەتەکە زۆر بەرچاوترە. ئامارەکان لە پاشکۆی چوارەم ببینە.

قایمکردنی (پاراستنی) سنوورەکان هەروا ناتەواوە، بەلاَم پێدەچێت قاچاغچێتی زۆر کەم بێت. بنکەی جەندرمە لە گردمامك، کەڵەکی نوێ و گوێڕ لەسەر زێی گەورە هەیە، لەو شوێنانەی کەڵەکی لێیە، هەروەها لە قووشتەپە لە نێوان هەولێر و پردێش بنکە هەیە. داواکراوە ژمارەی قۆڵچییەکان (پاسەوانەکان) زیاد بکرێن، بەو مەبەستەی دەورییەکان لە کەڵەکەوە لە سەر زێی گەورە تاکو هەولێر و پردێ سەر زێی بچووك ڕێکبخرێن. ئەم کارە کاریگەر دەبێت بۆ ڕێگە گرتن لە هەر جموجۆڵێکی قاچاغچییەتیکردن بە بڕێکی گەورە لەو کالاَیانەی باجیان لەسەرە.

### تاپۆ

مەسەلەی زەوی یەکێکە لە دژوارترین مەسەلەکانی ناوچەکە وەك زۆربەی ناوچەکانی تر. تۆمارەکانی تاپۆ لە لایەن مەئموورە گەندەڵەکانەوە ڕێکخرا بوون، ئەوانە لەسەر داوای ئاغاکان بە دەگمەن لە شوێنەکانیان دوور دەکەوتنەوە، ئەو ئاغانەی کە تەماحەکانیان لە سەرەوەی هەر ئیعتیبارێکە. قۆچانەکان لە بواری وەسفکردنی سنوورەکاندا ناوی ئەوتۆی بەکارهێناوە کە بوونی نییە یان ماوەیەکی دوورە فەرامۆش و لەبیرکراوە. ئەم تێکەڵوپێکەڵییەی لە ناوی سنوورەکاندا هەیە ئەگەر دانیشی پێدا بندرێت، هیچ ئاکامێکی نابێت. ئەو کاتەی زەوییەکانی میری تاپۆ کران، لە زۆر حاڵەتدا جووتیارەکان زەوییەکانیان لە سەر ناوی خۆیان تۆمار کرد. بە هەر حاڵ لە میانەی ٣٠ ساڵی ڕابوردوودا ئاغاکان بە فرتوفێڵ بێت یان بە

بەرتیل بەشێکی زۆر لەم زەوییانەیان بەناوی خۆیان کردووە و جووتیارەکانیش بوونەتە کۆیلە (Serf). یاساکانی میرات وەك نەریتێکی عەشایری، پاشاگەردانییەکی (فەوزا) تری دروست کرد کە زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەوەی بە ڕەسمی دانیپێدانراوە. ئەنجامەکە ئەوە بوو کە مافی تەسەروفکردن بە زۆربەی ئەو پارچە زەوییانەی تاپۆی هەیە، کێشەی لە سەرە. سەبارەت زەوییەکانی سەنییە بارودۆخەکە جیاواز نییە، چونکە حکوومەت باندێکی ئازادی خۆی هەیە بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکان. کێشەی تخووبی زەوییەکان بەردەوامە، ئاغاکان خۆیان کردە خاوەن گوندەکان بە هەمان ڕێگەی کە لە شوێنەکانی دیکەی ناوچەکە کردوویانە. لە سەردەمی عوسمانییەکان پۆستی موختاری (Mukhtarship) گوندی سەر زەوییەکانی سەنییە بە ٥٠٠ پاوەند دەفرۆشرا. جووتیارەکان لەو باوەڕەدان کە ئاغاکان هیچ مافێکیان بەسەر ئەوانەوە لە زەوییەکانی سەنییەدا نییە. ئەگەر دوای گەیشتن بە ئاشتی زەوییەکان کەوتنە ناو سنووری بەریتانیا، ئەوا چاوەڕوان دەکرێت بە لێشاو داواکاری لە دژیان پێشکەش بکرێت. سەبارەت بە بابەتی زەوییەکانی سەنییە، بە سوودە کە ئاماژە بەوە بکەین کە لە دوای سەرهەڵدانی بزاڤی تورکیای لاوەوە هیچ هەوڵێك بۆ پەرەپێدانی ئەم زەوییانە نەدرا لە ڕێگەی گەڕان بە دوای کارێزەکاندا، دروستکردنی ئاش و کاری لەم جۆرە. ئێستا لە سەر حکوومەت وەك خاوەن موڵك، پێویستە بەپێی توانا کاری لەم جۆرە دەست پێبکەن.

دەربارەی خاوەندارێتی لە شاری هەولێر (خانوو، دووکان، تاد) تۆمارگەکانی (سجلەکان) تاپۆ زۆر وردن و لە مانگی شوباتەوە فەرمانگەی تاپۆ کرایەوە و تەنیا معامەلەی ئەو جۆرە موڵکانەی خوارەوە دەڕوێنێت:

گواستنەوەی موڵك بە هۆی فرۆشتن یان دیاری، ڕەهن و هەڵوەشاندنەوەی ڕەهن.

ژمارەی سەرجەم ئەو معامەلانەی ساڵی ١٩١٩ تۆمار کران بەم جۆرەیە:

فرۆشتن ........................... ٨٣

دیاری ........................... ٥

ڕەهن ........................... ١٨

ڕەهن هەڵوەشاندنەوە ............ ٣٣

لە مانگی تشرینی یەکەمەوە ڕێگە درا بە تۆمارکردن لە ڕێگەی میراتەوە. ئامارەکان لە پاشکۆی پێنجەم دەبیندرێن. ڕێگە بە فرۆشتنی زەویی کشتوکاڵی نادرێت بەهۆی ئەو دۆخەی تۆمارگەکان تووشی هاتوون. ئومێد دەکرێت بەم زووانە چەند نەخشەیەك ئامادە بکرێت بۆ ئەنجامدانی فرۆشتن، بەڵام تۆمارکردن هەر مەحاڵ دەبێت. لیژنەی چەسپاندنی سنوورەکانی زەوی، لە کاتی سەردانەکەی بۆ ناوچەکە کارێکی زۆری دێتە پێش. ئەگەر کات هەبێت نیاز هەیە تۆمارگەکانی موڵکایەتی کۆبکرێنەوە تا لەگەڵ هاتنیان ئامادە بێت.

زەوییەکی زۆری بە تاپۆ کرانە زەوی مەحلول[٤٠] (Mahlul)، بە واتایەکی تر لە بەر زۆر هۆ ئەمە شکستێکی حکوومەتە، هەروەها هەندێك موڵکی ڕەهنکراو لە لایەن بانکی کشتوکاڵی هەیە. بڕیارەکانی موڵکایەتی کێشەی زەوی تەنیا دەربارەی ١٦ حاڵەت وەرگیرا، هەندێکیان تەواو گرینگ نین. ئەو حاڵەتانەی شیاوی باسکردنن ئەمانەن:-

١-حاڵەتی باشتەپە - لە کۆنەوە گوندی باشتەپە کرابووە دوو پارچە - پارچەیەکیان ئەحمەد پاشای دزەیی خاوەنی بوو؛ ئەوی تریشیان جووتیارەکان. دەڵێن پێش سێ ساڵ ئەحمەد پاشا پارچەکەی تریشی بە زەبری هێزێکی چەکدارەوە خستۆتە سەر بەشەکەی خۆی. ئەم حاڵەتە یەکەم جار لە مانگی حوزەیران لە گەرمەی ڕاپەڕینەکەی سلێمانی باس کرا و ئەو کات کارێکی سیاسیی دانایانە نەبوو ئەحمەد پاشا دەربکرێت. دواتر هاوار بردرایە بەردەم حاکمی سیاسیی موسڵ و کەیسەکە دووبارە ورووژێندرایەوە، ئێستا کەیسەکە چاوەڕێی بڕیارە. دەرکردنی ئەحمەد پاشا گرنگییەکی سیاسیی بەرچاوی لە ناوچەکەدا دەبێت.

٢- کەیسی گردجووتیار- کێشەیەك بوو لە نێوان مەسیحییەکانی عەنکاوە و جەمیل ئاغای گەردی. گردجووتیار پێش ٤٠ ساڵ بوونی نەبوو. بەپێی بەڵگەکانی تاپۆ پێدەچوو جۆگەیەکی ئاو سنووری نێوان هەردوو بەشی گوندەکە بێت، بەڵام شوێنی ئەم جۆگەلەیە لە سەر زەوی لەمێژە سڕاوەتەوە. جۆگەلەیەکی گونجاوی تر دیاری کرا و هەمان ناوە کۆنەکەی لێندرا و کرایە سنووری نێوانیان و هەردوولا ڕازی بوون. بەشەکەی جەمیل ئاغاش لە ڕاستیدا "مەحلول"-ە.

٣- کەیسی پیرزین – ڕۆژگارێك گوندی پیرزین بووە هۆی شەڕێکی گەورە لە نێوان هەردوو عەشیرەتی گەردی و دزەیی، لەم ساڵانەی دواییدا و بەر لەوەی دادگاکان گرنگی بە زەوییەکان بدەن، خەڵکەکە بەردەوام سکاڵای هەبوو هۆیەکەش بە زۆری بۆ بوختانەکانی موختار دەگەڕێتەوە. سێ ئاغا مافی خاوەنییەتی گوندەکەیان هەبوو. ئەوان لە نێوان خۆیاندا کێشەیان هەبوو و هەروەها لەگەڵ خەڵکی گوندەکەش کە فێڵیان لێکرابوو. باشترین چارەسەر ڕەنگە دەرکردنی هەر سێ ئاغاکە بێت و واش لە خەڵکەکەش بکرێت قەرەبوویان بکەنەوە، وەك ئەوەی لە بنەڕەتدا لە بری کرێی زەوی پێیان دەدان، کە لە ڕاستیدا ناکاتە شتێکی ئەوتۆ. بە هەرحاڵ ئەوە دەبێتە پێشینەیەکی مەترسیدار و پێشنیازەکە دەبێتە زەنگێکی گەورە بۆ ئەشرافەکانی هەولێر و تووشی دڵەخورپێیان دەکات. دواتر لیژنە سەردانی گوندەکەی کرد و زەوییەکانی دابەش کرد. هەندێ لایەنی کەیسەکە هێشتا ماوە بڕیاری لە سەر بدرێت.

**وەقف**

هەموو موڵکەکانی وەقف لەلایەن موتەوەلییەکانەوە (Mutawallis) بەڕێوە دەچن و لە هەولێر هیچ مەئموورێك[٤١] نییە. زۆربەی مزگەوتەکانی شارەکە بەخششێکی باشیان پێدراوە و ئێستا بە باشی و جوان نۆژەن کراونەتەوە. مەلا فەندی موتەوەلی مزگەوتی گەورەیە و خاوەنی بەخششێکی گەورەیە. سەبارەت وەقفی شێخ شێروان پارەی موتەوەلی هەمووی بە ڕێکوپێکی ڕێکنەخراوە؛ هەر بۆیەش ئەو تەنیا دەتوانێت پارە لە ژێر سەرپەرشتیکردنی ڕاستەوخۆی حکوومەت خەرج بکات.

پێنج گوندی سەر زەوییەکانی سەنییە لە کەناری چەپی دجلە وەقفی مەزاری سولتان عەبدوڵلان. چەند مانگێك گرفتێکی قورس هاتە پێش، ئەویش ئەوەیە کە ئایا متەوەلی مافی ئەوەی هەیە دەیەك (ushr) و هەقی عەرد (haqq-i-ardh) پێکەوە وەرگرێت یان تەنیا دەتوانێت ئەمەی دوایی وەرگرێت؟ سەرەنجام بە زەبری فەرمانەکانی سەلماندی کە مافی کۆکردنەوەی هەردووکیانی هەیە.

**پەروەردە**

ڕێکخستنی پەروەردەیی لە هەولێر زۆر دوورە لەو ئاستەی ئارەزوو دەکرێت. بینایەی قوتابخانە شێدارە، تەسکە و کەلوپەلی پێویست و باشی تێدا نییە. مامۆستاکان وێڕای ئەوەی ڕەنگە هەرچی لە توانایاندایە بیکەن، بەڵام هێشتا دوورن لەوەی کە لە ئاستێکی نایابدا بن، هەروەها کتێبیش نییە. خەڵکی هەولێر گرنگییەکی زۆر بە پەروەردە دەدەن و کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی شارەوانی لە کۆتایی ساڵ خوازیار بوو دەنگ بدات بە تەرخانکردنی هەموو ئەو زیادەیەی لە بودجەدا هەبوو، کە ٢٠٠٠٠ ڕوپیەیە بۆ سێکتەری پەروەردە. ئارەزوو دەکرێت بەم زووانە هەلی ئەوە بڕەخسێت قوتابخانەکە بۆ بینایەکی باشتر بگوێزرێتەوە. بەشی زۆری دانیشتوانی شارەکە بە تورکی قسە دەکەن. لە ئێستادا پێویستە تورکی ببێتە ئامرازی فێربوون (زمانی خوێندن — وەرگێڕ). تەنیا زمانی کوردی دەکرێ شوێنی تورکی بگرێتەوە.

قوتابخانەکەی هەولێر لە ١١ — ی تشرینی دووەم کرایەوە، دوو مامۆستا و ٣١ قوتابی هەبوو، پێش هاتنی پشووی هاوین ژمارەی قوتابیان گەیشتە چل. دوای پشووی هاوینە ژمارەی مامۆستا و قوتابییەکان زیادی کرد و گەیشتە ٩٥ قوتابی و پێنج مامۆستا. بەڕێوەبەری قوتابخانە مستەر ئێس. وای. بەلوچ هەفتەی ١٢ سەعات زمانی ئینگلیزی دەڵێتەوە. خەڵکی زۆر ئارەزوومەندن فێری زمانی ئینگلیزی بن و هەروەها منداڵەکانیشیان فێر بکرێن. قوتابخانەکەی گوێڕ لە ١٥— ی کانوونی دووەمی ١٩١٨ کرایەوە. مامۆستایەك و ٢٠ قوتابی هەیە. لە مەخموور ئارەزوو هەبوو بۆ کردنەوەی قوتابخانەیەك، بەڵام لێکۆڵینەوەکان دەریانخست کە ژمارەی ئامادەبووان هاندەری هەنگاوێکی لەم جۆرە نییە.

بەخشینێکی مانگانەی ٥٠ ڕوپیەیی بە قوتابخانە مەسیحییەکەی عەنکاوە دەدرێت، کە ٦٠ قوتابی هەیە. مامۆستای قوتابخانەکە، باسل کەسێکی بەتوانایە، لێهاتووە و شارەزاییەکی باشی لە زمانی فەڕەنسی هەیە.

**سەربازی**

پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەو هێزە سەربازییەی لە شارەکە جێگیرە دۆستانەیە و زۆر کەم سکاڵایەك لەوانەوە یان لە دژیان هەبووە. گواستنەوەی ئەو کاروانانەی

سەربازەکان دەیانپارێزن لە باتاس یان ڕانییەوە لە ماوەیەکی کورتدا تەواو دەبێت. هیچ ئاستەنگێك لە کڕینی پێداویستییەکاندا نییە. هیچ کاتێك پێویست نەبووە داوای یارمەتی سوپا بکرێت لەم ناوچەیە، جگە لەو سەردانەی زرێپۆشەکان بۆ قووشتەپەیان کرد و هەروەها ئەو خۆدەرخستنەی فڕۆکە جەنگییەکان لە کاتی هەرای دزەیی ئەنجامیاندا. ئەم بەتالیۆنانە (Regiments) یەك لەدوای یەك لە حامیەی هەولێر نیشتەجێ بووینە:

ماهراتاس ١١٦، گوورخاس ٣/١، پەنجاب ٨٧.

**شارەوانی**

مێجەر موری لەگەڵ گەیشتنی بۆ هەولێر بینی شارەوانی لەم دەستەیە (ستافە) پێکهاتووە:

سەرۆکی شارەوانی (١)، باشکاتب(١)، نووسەر (کاتب) (١)، خەزنەدار (١)، پشکنەر (وردبین) (١)، باشچاووش (١)، چاووش (پۆلیس) (١٠)، چاودێری ئاو(٢)، مەئمووری ناشتن (١)، دەرگەوان (١).

بەرنامەی کاری شارەوانی ئەنجوومەنێکی شەش[٤٢] کەسی دایدەڕێژێت. ئەم ئەندامانە بە هەڵبژاردن دیاری دەکرێن و ماوەی ئەنجوومەنەکەش چوار ساڵە و لەگەڵ تەواوبوونی ماوەکەشی هەڵبژاردنێکی نوێ دەکرێت. هەر پیاوێك بڕی گوژمەی ٥٠ قرووش یان پتر بدات دەتوانێت دەنگ بدات و هەر پیاوێکیش ١٥٠ قرووش یان پتر بدات، بۆی هەیە لە هەڵبژاردن خۆی بپاڵێوێت.

ئەنجوومەن هەر کاتێك پێویست بێت کۆدەبێتەوە، هەفتەی جارێك کۆبوونەوەیەك ساز دەکات و بڕیاری لەسەر گشت ئەو مەسەلانە دەدا کە پەیوەندییان بە شارەکەوە هەیە و هەموو خەرجییەکانیش لەلایەن ئەم ئەنجوومەنەوە بڕیاری لەسەر دەدرێت.

هیچ نەخۆشخانەیەکی مەدەنی بوونی نییە، بۆیە ئەو بینایەی ئێستا وەك نەخۆشخانەی سەربازی بەکار دێت. بەهەر حاڵ پزیشکێکی مەدەنی و سەیدەلانییەك هەیە. پزیشکەکە دامودەزگای خۆی هەیە و لە ماڵی خۆی نەخۆش دەبینێت و بە پێی حاڵەتەکەی بڕێك پارە لە نەخۆش وەردەگرێت. سەیدەلانییەکە

بەرپرسی ئەو دەرمانخانەیەیە کە لە شارەوانییە و تەنیا بە شارەوانییەوە پەیوەستە. دەرمانەکان لە بودجەی شارەوانیی دەکڕدرێن و بە خەڵکی دەفرۆشرێن، بەڵام بۆ خەڵکێکی زۆر هەژار بە بێ پارەیە.

هەر موختارێك بەرپرسی گەڕەکی خۆی بوو و تەرتیباتی خۆی دەکرد. قۆنتەراتی پاککردنەوەی گەڕەکیش بەردەوام بە موختار دەدرا و خەرجییەکەش شارەوانی دەیدا.

### باجەکان

باجەکان (خشتەکە لە پاشکۆی ژمارە شەشدا هەیە) وەك ئێستان، جگە لە باجی کڕین و فرۆشتنی ئاژەڵ کە لە سەدا یەکە و دواتر داندرا. میرانەی مۆڵەتی حەمامەکان، چایخانەکان، تاد کۆکرایەوە. لە سەردەمی داگیرکاری بەریتانیادا، وا تێبینی دەکرێت کە باجەکان لە یەکی ئاداری ١٩١٨ — وە، بۆ ماوەی یەك ساڵ نێردرابن. ئەم گرێبەستە هەڵوەشایەوە، گرێبەستەکان لەو زیانەی پێیان گەیشتبوو قەرەبوو کرانەوە و بەم جۆرەی لێ هات و باجەکان سەرلەنوێ بۆ ماوەی سێ مانگ، لە مانگی کانوونی دووەمەوە تا ئادار نێردران. لە مانگی ئادار کە بازرگانی ئاسایی بووەوە بڕیار درا باجەکانی شەش مانگ بنێردرێن. زۆر پێویستە ماوە ماوە غەرامەی قورس بخرێتە سەر مولتەزیمەکان (Multazims) ئەوانەی زیاتر لە سنووری خۆی باجی زەوی لە کوردە نەخوێندەوارەکان وەردەگرن.

لەوەتای ئێمە هاتووین ئەم گۆڕانکارییانەمان ئەنجام داوە.

ژمارەی دەستەی دامەزراوەی شارەوانی کەم کرایەوە و بەم شێوەیەی لێ هات:

سەرۆکی شارەوانی، یەك نووسەر، سەرۆکێکی چاووش، دوو چاووش، یەك خەزنەدار، یەك چاووشی ئاو و یەك دەرگەوان

سەرۆکی شارەوانی لە هەموو شتێکی شارەکە لە بەردەم حاکمی سیاسی بەرپرسیارە، ئەگەر حاکمی سیاسیش هەر کارێکی خواست کە پەیوەندی بە شارەکەوە هەبێت، ئەوا لەڕێگەی سەرۆکی شارەوانییەوە ئەنجام دەدرێت. پێش

ماوەیەکی کەم سەرۆکی شارەوانی پلەی قازی پلە سێی پێدرا و لەمەودوا هەموو کەیسە بچووکەکانی پەیوەست بە شارەکە کە پێشتر لە ئەستۆی حاکمی سیاسیدا بوون، سەرۆکی شارەوانی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکات.

### ئەنجوومەن

لە کاتی داگیرکاریی بەریتانیادا ئەنجوومەنێکی نوێ لە سەرۆکی شارەوانی و پێنج ئەندام پێکهات، کە لەلایەن یاریدەدەری حاکمی سیاسی پاڵێورابوون و لە کەسایەتییە دیارەکانی هەولێر بوون. ئەم ئەنجوومەنە دەسەڵاتی جێبەجێکردنی نەبوو و ئەرکەکانی تەواو ڕاوێژکاری بوون دەربارەی ئەو پرسانەی پەیوەستن بە شار، وەك چەند گوژمەی پارە لە بودجە بۆ بینایە گشتییەکان تەرخان بکرێت باشە بۆ ئەوەی باشترین سوود بەخەڵکی بگەیەنێت، ئەوانیش ڕاپۆرتێکیان پێشکەش کرد کە تەواو سروشتێکی ڕاوێژکاری هەیە.

ئەم ئەنجوومەنە هەموو ڕۆژێکی دووشەممە کۆدەبۆوە، بەڵام دوایی لە لایەك بە هۆی ئامادەنەبوونی هەندێك ئەندام و لە لایەکی ترەوە بەهۆی ئەو ڕاستییەی کە زۆربەی ئەو پرسانەی کە پێویستییان بە ڕاوێژکاری بوو، ئیشیان لەسەر کرابوو، کۆبوونەوەکان تا دەهات کەمتر و کەمتر دەبوون تا وای لێهات هەر نەما. ئێستاش هەر کاتێك حاکمی سیاسی دەربارەی هەر مەسەلەیەك پێویستی بە ئامۆژگاری بێت، ئەوا داوای ئەنجوومەنە کۆنەکە دەکات، کە ئەندامەکانی پێش داگیرکردنی هەولێر لەلایەن بەریتانیاوە، خەڵك هەڵیبژاردبوون. ئەمانە هەموویان کەسانێکی بەڕێزی شارەکەن و دەتوانن بە باشترین شێوە نوێنەرایەتی ڕا و بۆچوونی دانیشتوان بکەن. نەخۆشخانەی مەدەنی دروست کرا و لە برگەیەکی تر باسی لێوە دەکەین.

### تەندروستیی گشتی

دوای پرۆسەی داگیرکاریی بەریتانیا، سەرۆکی شارەوانی بەرپرسی تەندروستی گشتی شار بوو. سی پاککەرەوە (کەنناس) دەمەزرێندران و ئامرازی پێویست وەك عەرەبانەی زبڵ، تاد دابین کرا. خەڵك خاشاکیان لە شوێنێکی دیارکراو دادەنا و دواتر پاککەرەوەکانی شارەوانی ئەو خاشاکەیان لە هەموو

بەشەکانی شار کۆدەکردەوە و دەیانگواستەوە بۆ شوێنێکی دیارکراو لە دەرەوەی شار و لەوێ فڕێدەدرا. داوا لە پزیشک کرا هەفتانە شار بپشکنێت و ڕاسپاردەی پێویست پێشکەش بکات، دواتر لە مانگی حوزەیران پشکنەرێکی تەندروستی لە موسڵەوە بۆ هەولێر ڕەوانە کرا و هەموو کاروباری تەندروستی گشتی خرایە ژێر دەستی و لەم بارەشەوە ئەو تەنیا لە بەرامبەر حاکمی سیاسی بەرپرسیار بوو.

شارەکە کرایە چەند بەشێکی دیاریکراو و بۆ شەقامەکانی هەر بەشێکیش ژمارەیەك پاککەرەوە تەرخان کران. پاککەرەوەکانی تریش ئەرکی کۆکردنەوەی خاشاکی کەڵەکەبووی ناو شاریان پێسپێردرا. ئەو خاشاکەی لە ناو شار کۆدەکرایەوە، سەرەتا لە دەوروبەری شار کۆمەڵ کۆمەڵ دەکرا و سەرەنجام بە گالیسکەکانی خاشاکی شارەوانی فڕێدەدرایە ئەو شوێنەی لەدەرەوەی شار دیاریکرابوو. هەولێر لە سەرەتای داگیرکردن شارێکی لەڕادەبەدەر پیس و پۆخڵ بوو؛ بەڵام تێستا تا ڕادەیەکی باش خاوێنە و دوای ئەوەی بازاڕ و خانووە کاولەکان سەرلەنوێ دروست دەکرێنەوە باشتریش دەبێت. ئاودەستخانەی گشتی لە شارەکەدا نییە و ئاودەستخانەی مزگەوتەکان ئەم کارە مەیسەر دەکەن.

## موختارەکان

موختارەکان بە پێی یاساکانی شارەوانی لە لایەن خەڵکەوە بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵدەبژێردرێن. بەڵام زۆر لە موختارەکانی ئێستا ئەوە دە ساڵە بەبێ دووبارە هەڵبژاردنەوە لە سەر کارن. لە سەردەمی عوسمانییەکان پارەیان پێنەدەدرا، بەڵام لەمەولا چیتر نابێت چاوەڕێی یارمەتییان لێ بکرێت ئەگەر بێتو بەرامبەر ئەو خزمەتەی پێشکەشی دەکەن پاداشت نەکرێن. بڕیار درا موختاری چوار گەڕەکی گەورەی هەولێر مانگانەیەکیان بە گوژمەی ٣٠ ڕوپیە بۆ ببڕدرێتەوە. گەڕەکەکانیش ئەمانەن: سەرای (لە قەڵاتە – وەرگێڕ)، عەرەب، خانەقا (یەکەم گەڕەکی خوار قەڵاتە و لە سەردەمی ئەتابەکییەکان دروست کراوە – وەرگێڕ) و تەعجیل[٤٣]. سێ گەڕەکی بچووکتر هەن ئەمانەن؛ سەعدووناوە، تۆپخانە (لە قەڵاتە – وەرگێڕ) و تەکیە ( لە قەڵاتە – وەرگێڕ).

موختارەکان ئەرکیانە سەرۆکی شارەوانی لە هەر ڕووداوێکی گرینگ

ئاگادارکەنەوە کە لە گەڕەکەکەیان ڕوودەدات و هەر کاتێکیش داوای یارمەتییان لێکرا دەبێت هەرچی لە توانایاندایە پێشکەشی بکەن.

**کارەکان**

بۆ بینینی لیستی بودجەی شارەوانی ساڵی ١٩١٩ – ١٩٢٠ (تەماشای پاشکۆی حەوتەم) بکە. بڕە پارەیەکی ساڵانە کە دەگاتە سەد هەزار (lakh) بەشێکی بەرچاوی بۆ کارە گشتییەکان چووە. سەرباری تەندروستی گشتی و ڕۆشنکردنەوەی شەقامەکان بە شەوان، ئەم بابەتانەش جێبەجێ کران :–

١– باشکردنی تۆڕی ئاوی خواردنەوە.

٢– چاککردنەوەی ڕێگەی کۆیە و ئەو گۆمە پیسە پڕ کرایەوە کە لە دەروازەی شارەکە بوو.

٣– دروستکردنی ژمارەیەك شوێنی چەرم خۆشکردنی سەر بە شارەوانی.

لە سەردەمی عوسمانییەکاندا پڕۆژەی ئاوی خواردنەوە خراپ بوو و ببووە هۆی سەرەکی فراوان نەبوونی شارەکە. ئاوەکە لە کارێزێك دێتەدەر و بە هۆی جۆگەیەکی کۆن لەو لایەی کە ئاوەکە دەڕژێتە زەلکاوێکی پڕ لە مێشوولە و دەگواسترێتەوە بۆ شار و دواتر بەلای گۆڕستان بە جۆگەیەکی دانەپۆشراو تێپەڕ دەبێت، لەو شوێنەشدا خەڵك خۆیان و جلەکانیان و ئەسپەکانیان دەشۆن. لە کۆتاییدا ئاوەکە دەڕژێتە ناو عەمبارێکی قوڕی سەر واڵا کە دەکەوێتە ناوەڕاستی شارەکە. ئێستا ئاوی خواردنەوە بە بۆڕی فوخاری لە ژێر زەوییەوە دەبردرێتە ناو تانکییەکی شێرەدار. جۆگەکەی لای گۆڕستان سەری داپۆشراوە و ئاوەکەشی دەڕژێتە ناو عەمبارە کۆنەکە و بۆ مەبەستی شوشتن بەکار دێت. هەوڵ درا سەری جۆگەکە داپۆشرێت بەڵام جارێ زۆری ماوە. بڕیارە بۆڕی ئاسنیش بەکار بێت و لە ساڵی داهاتوو مەیسەر دەبێت.

یەکێك لە شتە سەرنجڕاکێشەرەکانی هەولێر بوونی ژمارەیەك منداڵی بچووکە، زۆربەیان کچن و بەکاردێن بۆ سەرخستنی ئاو بە هەورازێکی ڕك بۆ سەر قەڵات، ئومێد دەکرێت کە زۆری پێنەچێت ترومپایەك (Pump) پەیدا بکرێت بۆ سەرخستنی ئاو بۆ سەر قەڵات. خەڵکیش ئامادەن بۆ جێبەجێکردنی پڕۆژەکە ساڵانە پارە بدەن. ساڵی ١٩١٩ گوژمەی ٥٠٨٤ ڕوپیە بۆ پڕۆژەی ئاو خەرج کراوە.

ئەو ڕێگەیەی لە هەولێر بەرەو کۆیە دەڕوات لە دۆخێکی زۆر خراپدایە. بە ناو ژمارەیەك کەلاوەی شاردا دەڕوات و سەرەنجام بە شوێنێکی نزم کۆتایی دێت، کە زستانان ئاوی لێ کۆ دەبێتەوە و لە هاوینیش بۆگەن دەکات. ئێستا ڕێگەکە تەخت کراوە و شوێنە نزمەکانیش پەیتا پەیتا پڕدەکرێنەوە.

شوێنی کۆنی چەرم خۆشکردن دەکەوێتە ناوەڕاستی گەڕەکی عەرەب و شوێنەکە هەوا و بۆنێکی ناخۆشی هەیە. ئێستا شوێنێکی نوێ بۆ چەرم خۆشکردن بە گوژمەی ١٠٥٠٠ ڕوپیە لە نزیك قەسابخانە دروست کراوە، شوێنەکە کەمێك لە دەرەوەی شارە، لە لای ڕۆژهەڵات.

سەرەڕای ئەم کارانەی پێشتر باس کران، ژمارەیەك پردی بچووکیش دروست کران یان نۆژەن کرانەوە، هەندێك بەرەوپێشچوونیش لە ڕیگاوبان بەدەستهاتووە. ئاودەست و ئاوەڕۆی مزگەوتەکانیش چاك کرانەوە و ئەوەیشی ماوە خراوەتە ناو بەرنامە. لە ساڵی ١٩١٩ کاری زۆر گرنگ ئەنجام دراوە پتر لەو ١٦ ساڵەی پێشتر کە ماوەی بوونی شارەوانی هەولێرە.

هێشتا زۆر کار ماوە ئەنجام بدرێت، ژمارەیەك کەلاوە پێویستە لابردرێن یان نۆژەن بکرێنەوە. شەقامەکانیش کە ، لە دوو شۆستەی بەرز و کەناڵێکی تەسکی ئاوەڕۆ پێکهاتوون، پێویستییان بە ڕاستکردنەوە و تەختکردن هەیە. کەمی بەرد و کەرەستە بە هەرحاڵ کۆسپێکی گەورە بوون لە بەردەم کارە گشتییەکان و شارەوانی و چالاکییەکانی تری حکوومەت. پرۆژەکانی کەرتی تایبەتیشی لە بواری بیناکردن بە تەواوی پەکخستووە. لە زستانی ١٩١٨-١٩١٩ ژمارەیەکی زۆر کۆچبەری کورد لە شارەکە بوون و شارەوانیش دەبوایە بە ئەرکی فریاکەوتنی هەژاران هەستێت، دانەوێڵە بە تایبەتیش ساواریان لەجیاتی پارە بە سەردا دابەش کرا. ئەو کەسانەی شایستەی مووچەی خانەنشینی نین بڕی ٥ تا ٤٥ ڕوپیەیان پێدەدرێت. سەرجەم ئەو بڕە پارەیەی شارەوانی لە ڕۆژی داگیرکردنەوە تاکو کۆتایی ساڵی ١٩١٩ بۆ فریاکەوتنی هەژاران خەرجی کردووە بریتییە لە ١٦١١.٤ ڕوپیە.

لە ٢٨- ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩ کۆیوونەوەیەکی ئەنجومەنی شارەوانی سازکرا بۆ گفتوگۆکردن لە سەر دەسەڵاتەکانی داهاتوو و پێکهاتەی ئەنجومەنەکە

و شێوەی خەرجکردنی ئەو ٢٠٠٠٠ ڕوپیەی لە بودجە زیادی کردووە. ڕەزامەندی درا لە سەر نەگۆڕینی پێکهاتەی ئەنجوومەن، وا بە باش زاندرا دەسەڵاتەکە دواتر پەیتا پەیتا و هەر کاتێك پێویست بوو دیاری بکرێت. ئەنجوومەن خوازیار بوو هەموو پارە زێدەکەی بودجە بۆ پەروەردە و فێربوون تەرخان بکرێت. وە بەشێکی کەمیش بۆ نەخۆشخانە تەرخان بکرێت، وەك بەشدارییەك بۆ ئەوەی بینایەی قوتابخانەکە چۆل بکرێن[٤٤] ئەو شتانەی لە بەرنامەدا بوون و باسیان لێوە کرا بریتی بوونە لە: دروستکردنی پردێك لە سەر ئەو ئاوەی لە لای باشوورەوە بە کەناری شاردا دەڕوات، دابینکردنی ئاو بۆ قەڵات، چرای کارەبا و پانکەکان (Fans). پردەکە بڕی ٤٠٠٠ ڕوپیەی بۆ خەملێندرا.

خەڵکی هەولێر نیشتمانپەروەرن و زۆر حەز لە گەشەکردنی شارەکەیان دەکەن. بەو هیوایەی دەرفەت بڕەخسێت دەسەڵاتێکی کراوە بە ئەنجوومەنی شارەوانی بدرێت. دەمەوێت لێرە ئاماژە بە وزەی ماندوونەناس و وەلای پتەوی ئەحمەد ئەفەندی سەرۆکی شارەوانی بکەم. ئەو ساڵانێکی زۆری لە دادگاکان بەسەر بردووە و قازییەکی بە ئەزموونە، هەمیشە دۆستی خەڵکی و دوژمنی ئەو ئاغانەیە کە زوڵمیان لێدەکەن. ئەو متمانەپێکردنەی ئەو، حاکمی سیاسی لە زۆر ئەو گیروگرفتانە پاراستبوو کە لە ئاکامی سەرپەرشتیکردندا پەیدا دەبوون، هەروەها تا ڕادەیەکی زۆر ئامۆژگارییە سیاسییەکانی ڕاست دەرچوون.

## نەخۆشخانە

خەڵکی هەولێر حەز ناکەن سەردانی نەخۆشخانە بکەن و زۆربەیان حاڵیان باشە و پێیان باشترە لە ماڵی خۆیان پشکنینی پزیشکییان بۆ بکرێت. نەخۆشخانەیەکی مەدەنی لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩١٨ دامەزرا و دکتۆر عەبدولئەحەد[٤٥] کرایە بەرپرسی یەکەمی نەخۆشخانەکە؛ هەر چەندە دکتۆرێکی زۆر چالاك نەبوو بەڵام جێگەی متمانەی خەڵك بوو. سەرەنجام بەهۆی کەمیی مووچەکەی دەستی لە کار کێشایەوە. دکتۆر فایەق هاتە شوێنەکەی، بەڵام زۆر سەرکەوتوو نەبوو. لە کاتی چوونی بۆ بەغدا ئەویش دەستی لەکار کێشایەوە. دکتۆر سارسان هاتە شوێنەکەی کە دکتۆرێکی زۆر ئیشکەرە و پێدەچێت

لێهاتووش بێت. نەخۆشخانەکە لە بینایەی قوتابخانەیەکی کۆنە، بینایەکی پیس و شێدارە و ئومێد دەکرێت بەم زووانە بۆ شوێنێکی باشتر بگوێزرێتەوە.

تەندروستی خەڵکی شارەکە باشە تەنیا ئەوە نەبێت کە لە پایزی ١٩١٩ زۆربەی هەرە زۆریان تووشی مەلاریا یان ئەنفلەوەنزا بوون، پێدەچێت ئێستا مەلاریا کەمتر بێت بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی حوکمڕانی عوسمانییەکان. جگە لە کۆکە ڕەشە هیچ پەتایەکی تر لە ئارادا نییە. دکتۆرێکی (نەشتەرگەر) مەدەنی لە موسڵ بەرپرسی سەرپەرشتیکردنی باری تەندروستی شارەکە و نەخۆشخانەکەیە و چاوەڕێ دەکرێت ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل ئامادە بکات. ئەو ئامارانەی پەیوەستن بە ئامادەبووان (نەخۆشەکان)، تاد لە پاشکۆی هەشتەم دەبیندرێت.

## ڕێگاوبان و پەیوەندییەکان

نزیکەی هەموو گوندەکانی ناوچەکە ئۆتۆمبێل دەیانگاتێ. ڕێگا سەرەکییەکانیش بریتین لە :-

١- هەولێر بۆ پردێ تا دەگاتە کەرکووك. هەندێك کار لەم ڕێگایە لە لایەن دەسەڵاتداریێتی سەربازییەوە ئەنجام درا و هیچ ئاستەنگێکی ئەوتۆ نەماوە. هاتوچۆ دوای باران زۆر زەحمەتە بەڵام زەوییەکە زوو وشك دەبێتەوە.

٢- ڕێگای هەولێر - گوێڕ. ئەمە ڕێگای سەرەکی چوونی ئۆتۆمبێلە بۆ موسڵ. پردێکی باش لە سەر  ڕووباری ئەبو جەردە (گوندێکیش بەهەمان ناو لە ناوچەکە هەیە و سەر بە ناحیەی گوێڕە- وەرگێڕ) لە نزیکی گامێشتەپە هەیە. دوو یان سێ ڕووباری دیکەش هەن کە پەڕینەوە لێیان ئاسانە، بەڵام دوای باران بارین زەحمەت دەبێت. ڕێگەکە لە ژێر سەرپەرشتی دەسەڵاتداریێتی سەربازی باشتر کرا.

٣- هەولێر - کەڵەکی نوێ بەسەر زێی گەورە. ئەمەیان نزیکترین ڕێگایە بۆ موسڵ و ڕێگەی ئاسایی کاروانەکانە. ڕێگەکە تا دەگاتە سەر زێ بۆ ئۆتومبێلیش بەکار دێت بەڵام ناخوش و سەختە.

٤- هەولێر - ڕووباری بەستۆڕە. بەرەو دێرێ و ڕواندز دەڕوات، ئۆتۆمبێل تا دێرێ دەچێت. هەندێك شوێنی ڕێگاکە چاڵی گەورەی تێدایە.

٥- هەولێر – گوێڕ بە دیبەگەدا. جاران ئەمە ڕێگەی پەیوەندیی سەرەکی بوو لەگەڵ هێزەکانی تورك لە کەرکووك، بەڵام ئێستا کەم بەکار دێت. ڕێگاکە لە لای دیبەگە زۆر خراپە و لە نێوان دیبەگە و گوێڕ کەند و کۆسپێکی زۆر هەیە ئێستا ئۆتۆمبێلەکان ناتوانن پێیدا بڕۆن و بە ئاسانی پەکیان دەکەوێت.

٦- گوێڕ بۆ شەڕگات بە هۆی کەڵەکەوە هەروەها لە ڕێگای مەخموور یان گوندی سوڵتان عەبدوڵلا. ڕێگاکە هەمووی باشە جگە لەو شوێنەی کە کەلاوەی بەربلاوی شارێکی دێرینی لێیە لە نزیك گۆڕستانی سوڵتان عەبدوڵلا.

دەکرێت گەشتێك بە ئۆتۆمبێل بە ناوەندی ناحیەکان بکەیت وەك؛ قووشتەپە، دیبەگە، مەخموور و گوێڕ. ڕێگاکە بە گوندی قورشاغلووی ئەحمەد پاشادا دەڕوات. ڕێگاکە لە مەخموورەوە بەرەو گۆڕستانی حوسێنی غازی شۆڕ دەبێتەوە و بە چیای قەرەچووغدا تێدەپەڕی کە ڕێگایەکی زۆر ڕك و خراپە و ئۆتۆمبیل ناتوانێت پێیدا سەرکەوێت. تەقاندنەوەیەکی بچووك ڕێگاکە ڕاست و تەخت دەکات.

ناوچەی هەولێر لە سێ لاوە بە رووباری گەورە دەور دراوە، پرد و کەڵەك و دوبە (Ferry) بۆ ناوچەکە زۆر گرنگن. چاکردنەوەی پردەکەی پردێ پەیوەندی لەگەڵ کەرکووك لەلای باشوور مسۆگەر دەکات. لە سەر دجلە لای شەڕگات و دوێزات، ئەوەی یەکەم (شەڕگات) گرنگییەکی زۆری هەیە لەبەر ئەوەی ئێستا هێڵی شەمەندەفەری گەیشتووتێ، ئەمەش سەرەکیترین ڕێگای پەیوەندییە لە نێوان هەولێر و بەغدا و بڕێکی بەرچاوی شتومەك لەم خاڵەوە بە رووبار تێدەپەڕێت. دوبە و کەڵەکەکان لە بارێکی خراپدان و توانای پەڕاندنەوەی ئۆتۆمبیلیان نییە، ئەوە بوو پێشنیاز کرا کە پێویستە لە گەیارە پردێك لە بەلەم (Boat bridge) دروست بکرێت. ئەمەیش پەیوەندی لەگەڵ بەغدا و موسڵیش دروست دەکات. بیناکردنی ئەم پردە زۆر بنەڕەتییە بۆ کاروباری کارگێڕی و بووژاندنەوەی بازرگانی تا ئەو کاتەی هێڵی شەمەندەفەری کفری دەگات. لە ساڵی ١٩١٩ دا پەیوەندی لەگەڵ موسڵ لە ڕێگەی دوبەوە دامەزرا کە لە گوێڕ ئۆتۆمبێلیشیان دەپەڕاندەوە، بەڵام بەرگەی لافاوێکی بەهێز ناگرێت. لە ٢٥- ی نیسانی ١٩١٩ ڕووداوێکی دڵتەزێن ڕوویدا، کاتێك دوبەیەك وەرگەڕایە سەر ئەو

پارچە گوریسەی (كێبڵەی) دوبەكەی لەو بەری ڕووبارەكەوە پێبەستراببۆوە و لە ئەنجامدا ژمارەیەك كەس خنكان. لە كەڵەكی نوێ توركەكان پردێكی زۆر جوانیان دروست كردووە، بەڵام كەماسی لەو بەشە بنەڕەتییە هەیە كە دەكەوێتە سەر ئەو شوێنەی ڕێڕەوی سەرەكیی ڕووبارەكەی پێدا دەڕوات. توركەكان بە نیازی ئەوە بوون پردێكی هەڵواسراو (Suspension) دابنێن، بەڵام یەكێك لەو ستوونانەی بە بەری درابوو ڕووخا، ئەوەش بەو مانایەیە كە ئەساسی هەموو بیناكە جێگەی ڕەزامەندی نییە و مەحاڵە كارەكە تەواو بكرێت. ئێستا تەنیا كەڵەكێك لەژێر پردەكە دێت و دەچێت. هاتنی هێڵی شەمەندەفەر بۆ شەرگات ڕێچكەی بازرگانی هەولێری بەرەو لایەكی نوێ گۆڕی، بەڵام ئارەزووش دەكرێت بەم زووانە هێڵی شەمەندەفەری كفری درێژ ببێتەوە تاكو ڕاستەوخۆ بگاتە سامانەكانی ناوچەكە.

### كانزاكان

تاكە سامانی كانزایەكی ناسراو لە ناوچەكەدا ئەو كانییە نەوتییانەن كە لە گوێڕ هەن. ئەوانە دەكەونە كەناری زێی گەورە و لە وەرزی بەهاردا دەكەونە ژێر لافاو. پێویستە بەنداوێكیان لە دەورەی دروست بكرێت پێش ئەوەی كاری ڕاست و دروستیان لە سەر بكرێت. كانی گۆگردیش (كبریت) لە شاخی قەرەچووغ هەیە.

### ئاهەنگ و بۆنەكان

جەژنی ڕەمەزان لەگەڵ مۆركردنی ڕێكەوتننامەی ئاشتی هاوكات بوو و كەیفخۆشییەكی گشتی كەوتە ناو خەڵكی و شار ڕازاندرایەوە (ڕۆشن كرایەوە). هەروەها جەژنی قوربانیش بە جەژنە پیرۆزانە و تەقەكردن یادی كرایەوە[٤٦].

لە ڕۆژی كریسمسدا بە سۆزەوە ڕوویان كردە ئەو فێستیڤاڵ و چالاكییە وەرزشییانەی لەژێر چاودێری فەرمانگەی فەرماندەیی سەربازەكان ساز كران.

### بارەگای تازەی حاكمی سیاسی

بە گونجاو نەزاندرا چیتر حاكمی سیاسی لە شار نیشتەجێ بێت، بارەگایەكی نوێ لەسەر پانتایی سێیەكی میلێك لە لای ڕۆژئاوا لە دەرەوەی شار دروست كرا. بڕی ٢٥٠٠٠ ڕووپیەی تێچوو. ئومێد دەكرێت لە ساڵی داهاتوو نهۆمی سەرەوەشی بۆ

بکرێت. نەخشەکە لە لایەن مێجەر میورای و ئەندازیارێکی تەلارسازی بەتوانا کە لە موسڵەوە هێنرابوو، داندرا.

**سەید تەها**

سەید تەهای شەمدینان(٤٧) لە ڕێگەی چوونی بۆ بەغدا و گەڕانەوەشی بە هەولێردا تێپەڕی. ئەو هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ناوچەکە نییە جگە لە پێگەیەکی لاوازی ناو گەردییەکان نەبێت.

**خورشید بەگ**

خورشید بەگی سەرۆکی عەشیرەتی پنیانیش خۆی و لایەنگرەکانی لەسەرەتای شەڕدا و بە هۆی بەرەوپێشچوونی ڕووسەکان، باشقەڵایان (شارێکە لە باکووری کوردستان – وەرگێڕ) بەجێهێشت و لە شەقڵاوە نیشتەجێ بوون. ئەو بەنی عەباسییە و پێشتر کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو، بەڵام بە هۆی ئەو زوڵم و زۆرداریيەی کردی، ئێستا لە ناو عەشیرەتەکەی خۆی خۆشەویست نییە. ئەو لە سوارەی حەمیدیە قایمقام بوو. لە مانگی ئەیلوول هەوڵدرا خۆی و لایەنگرەکانی لە گوندێکی چۆلکراو لە ناوچەی هەولێر نیشتەجێ بکرێن، بەڵام بەهۆی ئەو ڕاستییەی کە هیچ کەس لە لایەنگرانی نایەوێت لەگەڵ ئەودا بژیت و پێیان باشترە لەسەر یارمەتی حکوومەت یان کارێکی شەرافەتمەندانە لای کەسانی تایبەت بژین، دانوستانەکان بە ئاکام نەگەیشتن. هەروەها هەوڵیشدرا بگەڕێتەوە، بەڵام ئەو پارەیەی داوای کردووە بۆ سەفەرکردنەکەی گەلەك زۆرە و گومانیش لەوە هەیە کە ئایا بە ڕاستی ئەو دەیەوێت بگەڕێتەوە. سەرەنجام مووچەیەکی کەمی بۆ بڕایەوە و ئێستا لە گوندی کۆڕێی نزیك شەقڵاوە دەژیت. هەندێك لە خزمەکانیشی لە گوندی بەحرکە لە ژێر مەرحەمەتی جەمیل ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی گەردی نیشتەجێ بوون.

هەفتا تا هەشتا کەسی عەشیرەتەکەی چەند ساڵێکە لە هەولێر دەژین، عوسمانییەکان دوو سێ جار پارەیان پێدان تاکو بگەڕێنەوە سەر زێدی خۆیان بەڵام ئەوان هەرگیز نەگەڕانەوە. لە مانگی تشرینی یەکەمدا داواکارییەکی هەمان چەشنیان پێشکەش کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ ئامادەییەکیان بۆ گەڕانەوە

پیشان نەدا، هیچیان پێنەدرا. ئەوانە ناوبانگێکی خراپیان لە شاردا هەیە بە هۆی تەمبەڵی و بەدڕەوشتییان.

## نووسینگە

بە درێژایی ئەو ماوەی ڕاپۆرتەکەی تێدا نووسراوە، دەستەی نووسینگە زۆر کەم بوو. تا کۆتایی ساڵەکەش هیچ کاتبێکی بەریتانی پەیدا نەبوو. مێجەر موری یاریدەدەرێکی زۆر لێهاتووی هەیە، مستەر ئەنیس سەیداوی کە لە حوزەیرانی ١٩١٩ چووە موسڵ و بووە نووسەر لە "الموصل"[٤٨]. ئەوەی هاتە جێگەشی دوای ماوەیەکی کورت دەرکرا و چیتر کەس لەم پۆستە دانەندرا. مستەر عەبدولکەریم پیاوێکی ئەرمەنییە و شارەزاییەکی باشی لە زمانی ئینگلیزی هەیە و هەموو تۆمارگە و دۆسییەکانی گرتە ئەستۆی خۆی و تەنیا کەسێکیشە کە ئیشی وەرگێڕان دەکات. بە پێی ئەو کارە زۆرەی کە ئەنجامی دەدات، ئەو شیاوی متمانە پێکردنێکی زۆرە. مستەر دوولی چاند بەرپرسی ژمێریاری بوو تا ١٩- ی ئاداری ١٩١٩ و سەلماندی کە پیاوێکی جێگەی متمانەیە و تەنیا شتێك کە دەربارەی ئەو هەمە ستایش کردنییەتی. لە کۆتاییدا سوپاس و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی کاپتەن بڕادشۆ دەکەم سەبارەت ئەو یارمەتییەی پێشکەشی منی کرد لەم چەند مانگەی دوایی ئەمساڵدا. هەروەها بەرپرسی مەسەلەکانی شارەوانیش بوو، بە گشتی یاریدەر بوو لە هەڵسووڕاندنی ناوچەکە، گیانی ماندوونەناس و وزە لەبن نەهاتووەکەی ئەو بۆ من هاندەر و وزەبەخش بوون بۆ ئەنجامدانی کاری گەورە.

مێجەر دەبلیو. ئاڕ. هەی / حاکمی سیاسیی هەولێر

**پاشکۆی یەکەم (أ): ڕەچەڵەکی سەرۆکەکانی دزەیی**




* قەرەنی ئاغا کوڕی مامەد ئاغایە و دوای کۆچی دوایی باوکی ئەو دەبێتە سەرۆکی هۆزەکەی و دوو براشی هەبووە بەناوی عیسا ئاغا و پیرداود ئاغا. مامند زێدین کوڕی گەورەی قەرەنی ئاغایە ( هەشت کوڕی هەبووە) و مەحموود ئاغاش کوڕە بچووکییەتی، و دوای کۆچی دوایی قەرەنی ئاغا مام زێندین دەبێتە سەرۆکی هۆز. مەحموود ئاغای کوڕە بچووکی قەرەنی ئاغا حەوت کوڕی هەبووە، گەورەکەیان فارس ئاغا بووە و سێ کوڕیشی بەناوی عەلی و مستەفا و ئاودەل وجاغ کوێر بوون و دوای کۆچی دوایی باوکیان فارس ئاغا دەبێتە سەرۆکی هۆز (وەرگێڕ).

** کاکە خانی گەورە چوار کوڕی هەبووە؛ سمایل ئاغا، مام خولە، مەحموود ئاغا و ڕەحمان. مەحموود ئاغا دوو کوڕی بە ناوی وەسمان و حەمەدی هەبووە، سمایل ئاغا کوڕێکی هەبووە بە ناوی کاکە خانی گچکە کە حەوت کوڕی هەبووە (عیسا، ڕەحمان، عەبدوڵلا، ، وسوو، مەحموود، حەسەن و حوسێن. مام خولە کاکەخان چوار کوڕی هەبووە بە ناوی محەمەد سادق، ئەحمەد، قادر و حاجی مستەفا (ئەمانە هەموویان بەرەبابی کاکە خان پێکدێنن) (وەرگێڕ).




*** حاجی نادری حوسێن ئاغای ١٢ کوڕی هەبووە. ئەحمەد پاشاش هەشت کوڕی هەبووە

پاشکۆی دووەم

ئەو خشتەیە بڕی ئەو دانەوێڵەیە نیشان دەدات کە لە ساڵی ١٩١٨– ١٩١٩ بە قەرز (Advance) دراوەتە وەرزێرەکان هەروەها ئەو گوژمەی کە لە کانوونی یەکەمی ١٩١٩ گەڕێندراوەتەوە (وەرگیراوەتەوە)

| شوێنەکان | جۆری دانەوێڵە: گەنم (کیلۆ) | جۆری دانەوێڵە: جۆ (کیلۆ) | هەموو تێچووەکان | | ئەو بڕە دانەوێڵەیەی تا کۆتایی کانوونی یەکەمی ١٩١٩ گەڕێندراوەتەوە | | ئەو بڕەی دواخراوە | | ئەو بڕەی ناردراوە بۆ وەرگرتنەوە | | هەموو | | مەبلەغ (بالآنس) | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ڕووپیە | عانە | ڕوپیە | عانە | ڕوپیە | عانە | ڕوپیە | عانە | ڕوپیە | عانە | ڕوپیە | عانە |
| هەولێر مەرکەز ناحیە | ٦١٣٥٠ | ... | ١٨٤٠٤ | ... | ١٤٨٤١ * | ... | ١٦٥٠ | ... | ... | ... | ١٦٤٩١ | ... | ١٩١٤ | ... |
| = گوێڕ = | ١٠٩٠٠٠ | ١٤١٧٥ | ٣٤٥٣٥ | ... | ٢٩٣٤٦ | ٩ | ... | ... | ٥٨٥٠ ** | ... | ٣٥١٩٦ | ٩ | ٣٣٨ | ٧ |
| = کەندێناوە = | ٢٩٧١١ | ... | ٨٩١٤ | ... | ٣٧٩٦ | ١٢ | ... | ... | ... | ... | ٣٧٩٦ | ١٢ | ٥١١٧ | ٤ |
| = مەخموور = | ١١٠٤٣ | ... | ٣٣١٣ | ٤ | ... | ... | ٣٣١٣ | ٤ | ... | ... | ٣٣١٣ | ٤ | ... | ... |
| هەموو | ٢١١١٠٤ | ١٤١٧٥ | ٦٦١٦٧ | ٤ | ٤٧٩٨٤ | ٥ | ٤٩٦٣ | ٤ | ٥٨٥٠ | ... | ٥٨٧٩٦ | ٩ | ٧٣٩٦ | ١١ |

* بڕی /٨/ ٦٧٨٨ ڕوپیەشی تێدایە کە لەلایەن ئەحمەد ئەفەندیی بەڕێوەبەر گێڕدراوەتەوە و هەروا بە هەڵواسراوی ماوەتەوە.

** ئەو گوندانەی دەکەونە ئەو بەری زێ و یاریدەدەری حاکمی سیاسیی موسڵ داوای کرد لێیان وەرگیرێتەوە.

**ئەو قەرزانەی لە ساڵی ١٩١٩ و ١٩٢٠ بە جووتیاران دراون**

| | گەنم (کلگم) | جۆ (کلگم) | هەموو تێچووەکە | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | ڕ*** | عانە | |
| هەولێر ناحیەی مەخموور | ١٢٥٥٥ | ... | ٣٧٦٦ | ٨ | تۆماری دانەوێڵە وەرگیراوەکانی ساڵی پار |
| = ناحیەی قووشتەپە | ٤٧٥٠ | ... | ١٤٢٥ | ... | تۆماری دانەوێڵەی ساڵی پار |
| = ناحیەی هەولێر | ... | ٥٥٠٠ | ١١٠٠ | ... | تۆماری کۆکراوەی ئەمساڵ |
| هەموو | ١٧٣٠٥ | ٥٥٠٠ | ٦٢٩١ | ٨ | |

*** (ر) واتە ڕوپیەی (Rupee) هیندی ، (عانە) هێمایە بۆ عانەی (Anna) هیندی کە دراوێکی ئەوسای هیندی بوو، لە سەدەی نۆزدەهەم و لە سەردەمی حوکمڕانیی بەریتانیاشدا یەك ڕوپیەی هیندی ١٦ عانە بوو، هەروەها دراوێکی تریش هەبوو بە ناوی پایسا (Paisa) ، قیمەتی لە عانە کەمتر بوو، یەك ڕوپیە ٦٤ پایسا بوو. وا دەردەکەوێت کە بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٩ لە کوردستاندا ئەو دراوە هیندیەی بەکارهێناوە و بۆیەش لە خشتەکەدا داهات هەر بەو دراوە تۆمار کراوە. بۆ وەبیرهێنانەوە لە ساڵی ١٩٥٧ — ەوە ئەم دابەشبوونەی دراوی هیندی گۆڕا و یەك ڕوپیە بووە ١٠٠ پایسا و عانەش نەما (وەرگێڕ).

## پاشکۆی سێیەم

## خشتەی دەرامەتی زەوی و بڕی کۆدە* و ئاکامەکان (Realizations) لە ساڵی ١٩١٩ دا

| | بڕەکان Demands | | پارەی کۆکراوە Collection | | بەڵانسەکان Balances | | تێبینییەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ڕوپیە | عانە | ڕوپیە | عانە | ڕوپیە | عانە | |
| بەروبوومی زستانە | ٤٥٠٢٣٣ | ١ | ٤٣٦٣٤٦ | ٩ | ١٣٨٨٦ | ٨ | |
| بەروبوومی هاوینە | ٥٧٥٠٠ | ٥ | ٤٩٣٠٣ | ٢ | ٨١٩٧ | ٣ | |
| میوە و سەوزەوات | ١٢٠٦٨ | ٥ | ٨٢٠٠ | ١٢ | ٣٨٦٧ | ٩ | |
| کۆدە (سەرانە) Kodah | ٨٤٩٧٥ | ١٥ | ٨٤٧٦٢ | ١٤ | ٢١٣ | ١ | |
| هەموو | ٦٠٤٧٧٧ | ١٠ | ٥٧٨٦١٣ | ٥ | ٢٦١٦٤ | ٥ | |

* کۆدە: بەمانای سەرانە، هەروەها پووشانە و زەوی سەختی جووت لێنەکراو هەروەها پووش و پەڵاشی پاوان دێت، بەڵام لێرە نووسەر وشە کوردییەکەی بۆ مەبەستی پووشانە بەکارهێناوە (وەرگێڕ).

## پاشکۆی چوارەم

### پارەی وەرگیراو لە گومرگ، تووتن، جۆراوجۆرکان و دەرامەتەکانی تر لە ساڵی ١٩١٩ دا

| بابەتەکانItems | ئەنجامدراوەکان Realizations | | هەموو | |
|---|---|---|---|---|
| | روپیە | عانە | ڕوپیە | عانە |
| ***گومرگەکان*** | | | | |
| هاوردەکان | ٣٣٦٠٦ | ٨ | | |
| نێردراوەکان | ٣٢٦٩ | ١٠ | | |
| کرێی زەوی | ٢٩ | ١٢ | | |
| غەرامەکان | ٢٣٤ | ٠ | | |
| مۆڵەتەکان | ٥٧٢ | ٠ | | |
| ***تووتن*** | --- | --- | ٣٧٧١١ | ١٤ |
| باجی تووتن | ٢٦٠٤٥ | ٢ | | |
| کرێی زەوی | ٨٤١ | ١٢ | | |
| فرۆشتنی تووتنی دەست بەسەرداگیراو | ٢٢٦ | ١٤ | | |
| تووتن (دەیەك) | ٢٥٦٦ | ٨ | | |
| مۆڵەت | ٧٦٤ | ٨ | | |
| غەرامە | ٩٢٦ | ٠ | | |
| ***جۆراوجۆرەکان*** | --- | --- | ٣١٣٧٠ | ١٢ |
| باجی شەراب و ئارەق | ٧٨٩٨ | ٦ | | |
| مۆڵەتەکان | ٧٠ | ٨ | | |
| باجی خوێ | ١٤١١ | ٨ | | |
| مۆڵەتەکان | ٢٤٧ | ٨ | | |
| باجی ماسی | ٣١٥ | ٠ | | |
| ڕاو و شکار | ١٤٠ | ٠ | | |
| مۆڵەتەکان | ٤ | ٠ | | |
| باجی هەنگوین | ٣٥٠ | ٠ | | |
| باجی دار | ٨٣٠٥ | ٠ | | |
| مازوو (دەیەك) | ٨٢٩٦ | ١٣ | | |
| کەتیرە (دەیەك) | ٢٣٣ | ١٠ | | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| شەربە و کەلوپەلی فوخاری (دەیەك) | ٤٨٠ | ٦ | | |
| بنێشت (دەیەك) | ٤٢ | ٠ | | |
| جیرە Alkali | ٣٠ | ٠ | | |
| مۆڵەتی دووکانی سەوزە Tambak | ٣٠ | ٠ | | |
| غەرامە و باجی دوو بەرابەر و فرۆشتنی کالاّ قاچاغەکان | ٩٧١ | ١٤ | | |
| ئاسایش | ٤٢٨٥ | ٠ | ٣٣١١١ | ٩ |
| هەموو | | | ١٠٢١٩٤ | ٣ |

## پاشکۆی پێنجەم

### معامەلەکانی تاپۆ

| بابەتەکان | خانوو | دوکان | حەمام |
|---|---|---|---|
| فرۆشتن | ٧٧ | ٢١ | ١ |
| گواستنەوە بۆ میراتگرەکان | ١٦ | ٢ | – |
| ڕەهن | ١٨ | – | – |
| هەڵوەشاندنەوەی ڕەهن | ٣٣ | – | – |
| دیاری | ٥ | – | – |
| هەموو پیتاکە (باربووە) کۆکراوەکان = ٣٤٥٢.١٤.٠٠ ڕووپیە | | | |

## پاشکۆی شەشەم

## خشتەی باجەکانی شارەوانی

| ناوی باج | باجەکان | | | | ڕێژەی ساڵانە | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | تورکی | ئینگلیزی | | | تورکی | ئینگلیزی | | |
| | پارە* | ڕوپیە | عانە | پایسا | پارە | ڕوپیە | عانە | پایسا |
| *باجی قەسابخانەکان* | | | | | | | | |
| مەڕ و بزن | ١٠ | ٠ | ٠ | ٣ | ... | ... | | |
| بەرخ و گیسك | ٥ | | ٠٠٠ | | ... | ... | | |
| گا و گوێرەکە و مانگا | ٢٠ | ٠ | ٠ | ٣ | ... | ... | | |
| حوشتر و گامێش | ٤٠ | ٠ | ٠ | ٣ | ... | ١٦٣٠ | ٠ | ٠ |
| | قرووش | | | | ئەم دوو باجە لە یەك | | | |
| | | | | | باجدا کۆکراوەتەوە | | | |
| *باجی قەسابەکان* | | | | | | | | |
| مەڕ و بزن | ٣ | ٠ | ٧ | ٠ | | | | |
| بەرخ و گیسك | ١.٥ | ٠ | ٣ | ٨ | | | | |
| گا و مانگا | ٩ | ١ | ٤ | ٠ | | | | |
| حوشتر و گامێش | ١٥ | ٢ | ٢ | ٠ | | | | |
| گوێرەکە | ٦ | ٠ | ١٥ | ٠ | | | | |
| باجی فرۆشتنی مەڕ | ٢٠ پارە بۆ هەر مەتر دووجایەك زەوی تەرخانکراو | ١٪ بەهای فرۆشتن | | | ٥٣٥٠٠ | ٦٩٤٠ | ٠ | ٠ |
| باجی مەیدانی فرۆشتنی ئاژەڵ | ٢.٥٪ – ی بەهای فرۆشتنی هەموو جۆرە ئاژەڵێکی (جگە لە مەڕ) فرۆشراو | ١٪ بەهای فرۆشتن | | | ١٢١٩٠ | ٢٠٠٠ | ٠ | ٠ |
| دەلاڵی (کاڵاکان) | ٢.٥٪ دەلاڵی ئەو کەلوپەلانەی لە شوێنە کراوەکانی بازاڕ دەفرۆشرێن | ١٪ بەهای فرۆشتن | | | ٣٤٠٠ | ٢١٣٧٠ | ٠ | ٠ |
| | نرخی بۆ داندراوە | ١٪ بەهای هەر | | | ٥٠٥٠ | ٣٢٢٠ | ٠ | ٠ |
| دەلاڵی (ئاژەڵەکان) | ٢ قرووش | معامەلەیەك | | | | | | |
| نەوت ( یەك بار = ٤ | بارەکانی | ٤ | | | | | | |
| تەنەکە) | خواردەمەنی، دار، | هەر هەموویان پێکەوەن | | | ... | ٨٠٠٠ | ٠ | ٠ |
| گومرك | مازوو، تووتن هەر | و نرخەکانیان | | | ٥٠٠٠ | ٣٠٠ | ٠ | ٠ |
| | هەموویان وەك یەك بە | بەم شێوەیەیە: باری | | | ١٩٠٥٠ | ٨٢٥٠ | ٠ | ٠ |
| | ٢ پارە نرخێندران | گوێدرێژێك ٢ عانەیە، | | | | | | |
| | | باری هێسترێك ٣ عانەیە | | | | | | |
| | | و باری حوشترێکیش ٤ | | | | | | |
| | | عانەیە | | | | | | |

• پارە: بچووکترین دراوی عوسمانی بووە، سوڵتان موراد لە سکەی داوە، ٦٠٪ – ی زیو بوو و ٤٠٪– یشی مس بووە، هەر ٤٠ پترە کردوویەتیە یەك قرووش و ساڵی ١٨٤٤ لیرە بەکار هاتووە و یەك لیرە ١٠٠ قرووش بووە. لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید بەهای پارە نزم بوو، بۆیە ئەو کات پارە تەنها لە مس دروست دەکرا بە بێ زیو. وەرگێڕ).

## پاشماوەی خشتەی باجەکانی شارەوانی

| ناوی باج | باجەکان | | ڕێژەی ساڵانە | |
|---|---|---|---|---|
| | تورکی | ئینگلیزی | تورکی | ئینگلیزی |
| | پارە | روپیە عانە پایسا | پارە | روپیە عانە پایسا |
| کانتاریا<br>کایالێسا و باجی گەنم | باجی دار، خەڵووز، کەتیرە، کا، گژوگیا، چڵو ٥ پارەیە بۆ هەر ٥٠ کیلۆگرام. بۆ کاڵاکانی تریش ٥ پارە بۆ هەر ١٠ کیلۆگرام. | ئەگەر بازرگانێك ویستی کاڵاکانی بکێشێت، دەبێت بۆ هەر ١٥ کیلۆگرام کێش یەك عانە بدات ٢ روپیە پیتاك بۆ کێشانی هەر تەنێك | ٧٠٠٠٠ | ١٨٠٠٠ ٠<br>٠ |
| مۆڵەتەکان | ٤ قرووش بۆ هەر دانەوێڵەیەك (زەوییەکەی بە کرێی فەرمی نەبوو بێت). نۆژەنکردنەوەی بینایەکان یەك قرووش بۆ هەر مەتر دووجایەك | ٤ عانە بۆ یەك تەن بۆ ڕۆژێك کرێی زەوی | نویَ ١٠٠٠ | ٦٠٠ ٠ ٠ |
| | | نۆژەنکردنەوەی خانوو یان بینایە یەك عانە بۆ هەر مەتر دووجایەك | = | = |
| | | چایخانە و قاوەخانە ٤–٦ روپیە بۆ هەر مەتر دووجایەك | = | = |
| | | چەرم خۆشکەر ٣ روپیە بۆ هەر مەتر دووجایەك | = | = |
| | | جەڵەبچی ٥ روپیە بۆ هەر مەتر دووجایەك | | |
| | | قەساب ٤ روپیە بۆ هەر مەتر دووجایەك | | ٢٥٠ ٠ ٠<br>١٠٠٠٠ ٠ ٠ |
| | | حەمامچی ٨ روپیە بۆ هەر مەتر دووجایەك | | |
| | | نرخی تازە ٧–١٠ روپیە | | |
| باجی یاریگا<br>saw-tax)<br>(See | ٤٠ قرووش بۆ هەر یاریگایەك شارەوانی بەشێك لە | | ٢٥٠<br>٥٠٩٠ | ٠ ٠ ٠<br>٠ ٠ ٠ |

| باجی خانوو | کۆی دەرامەتی ئەم باجانەی وەرگرت | | | |
|---|---|---|---|---|
| باجی دەرامەت | | | ٢٣٩١ | ... |
| بەشی گشتی | | | ... | ... |

## پاشماوەی خشتەی باجەکانی شارەوانی

| داهاتەکانی تری شارەوانی | ڕێژەی ساڵانە | |
|---|---|---|
| | تورکی | ئینگلیزی |
| | پارە | ڕوپیە عانە پایسا |
| کرێی بینایەکانی شارەوانی | ٣٠٠ | ١٥٠٠ ٠ ٠ |
| غەڕامەکان | ٦٠٠٠ | ١٠٠٠ ٠ ٠ |
| کۆگاکانی دەرمان — دەرمانی کۆگاکان لە لایەن شارەوانییەوە کڕدران و دواتر فرۆشرانە خەڵکی، خەڵکی هەژار دەرمانی بە خۆڕایی وەردەگرت | ٢٥٠٠ | ئێستا نەخۆشخانە لێی بەرپرسیارە |

## مووچەی دەستەی دەزگای شارەوانی

سەرۆکی شارەوانی ٢٠٠ ڕوپیە

نووسەر (کاتب) ١٠٠ ڕوپیە

سەرۆکی یاساوڵ (سەردەستە) ٥٠ ڕوپیە

یاساوڵ (چاوەش) ٤٠ ڕوپیە

دەرگەوان ٢٥ ڕوپیە

یاساوڵی تەندروستی (دوو) ٨٠ ڕوپیە (هەر یەکێکیان ٤٠ ڕوپیە)

## پاشکۆی حەوتەم
## خشتەی پوختەی دەرامەت و خەرجییەکانی شارەوانی ساڵی ١٩١٩ – ١٩٢٠

| دەرامەتەکان | ڕوپیە | خەرجییەکان | ڕوپیە |
|---|---|---|---|
| باجی بینایە | ٤٠٠ | ***گشتییەکان*** | |
| باجی قەسابخانە | ٩١٨٣ | مووچەی فەرمانبەرەکان (نووسینگە و | ٦٥٤٦ |
| بەکرێدانی ئەملاکی شارەوانی، | ٣٠٠٠ | جۆراوجۆرەکان) | |
| دوکانەکان و مۆڵەتەکان | ١٢٣٧٧ | پاداشتی موختارەکان | ١٢٩٠ |
| باجی خانووبەرە | ٥٠٠٠ | کەلوپەل و پێداویستییەکان | ٥٠٠ |
| باجی کەڵەکەکانی گوێڕ | | جلوبەرگ | ٥٠٠ |
| *دەلاڵی* – | | چاپ و پێداویستییەکانی نووسین و | ٤٠٠ |
| فرۆشتنی مەڕو ماڵات و ئەسپ ... | | چاپەمەنی | |
| ٢٣٤٥٠ ڕوپیە | ٥٣٦٧٠ | پێداویستییە کتوپڕەکانی نووسینگە | ١٥٠ |
| دەلاڵی مەزاد ... ٧٢٢٠ ڕوپیە | | جۆراوجۆرەکان | ٥٠٠ |
| فرۆشتنی دانەوێڵە ... ٢٣٠٠٠ ڕوپیە | | ***پڕۆژەی ئاوی خواردنەوە*** – | |
| *جۆراوجۆرەکان* – | | دامەزراندن | ٣٥٥ |
| بەکارهێنانی کارێزەکانی شارەوانی | | کارکردن و چاکردنەوە و | ١١٠٠٠ |
| ... ٢٠٠٠ ڕوپیە | | نۆژەنکردنەوەی کارێزەکان | |
| فێستیڤاڵەکان... ٣٠٠ ڕوپیە | | ***خزمەتگوزاریی گشتی*** | |
| تەرازووەکان ... ٨٢٥٠ ڕوپیە | ١٤٣٧٠ | کارە جۆراوجۆرەکانی شارەوانی | ١٥٨٠٠ |
| باجی نەوت ... ٣٢٠ ڕوپیە | ٢٠٠٠ | چاکردنەوەی ڕێگاکان | ٧٠٠٠ |
| باجی ئاودەستەکان... ٥٠٠ ڕوپیە | | ئاوڕشێنکردنی ڕێگاکان | ٢٠٠ |
| جۆراوجۆرەکان... ٣٠٠٠ ڕوپیە | | ***ڕۆشنکردنەوە*** | |
| غەرامەکان | | دامەزراندن | ٥٠٠ |
| | | خەرجیی نەوت و پیداویستییەکانی | ٣٠٠٠ |
| | | تری ڕۆشنکردنەوەی شار | |
| | | تەندروستی و ئاوەڕۆکان | |
| | | مووچەی فەرمانبەران | ١٤٨٧٠ |
| | | خاوێنکردنەوەی ئاوەڕۆ و | ١٥٠٠ |
| | | ئاودەستەکان | ٣٠٠٠ |
| | | کرێکاری کاتی (نا فەرمی) بۆ | |
| | | خاوێنکردنەوەی شوێنە کۆن و | |
| | | پیسەکان، تاد | ٢٥٠٠ |
| | | تەویلەکانی شارەوانی | ٢٠٠٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | چاکردنەوەی عارەبانەکان، تاد | ١٩٠٠ |
| | | پێداویستییە کتوپڕەکانی فەرمانگەی تەندروستی | |
| | | ***جۆراوجۆرەکان*** | ٢٠٠٠ |
| | | فریاکەوتنی هەژاران | ١٠٠ |
| | | خەرجییەکانی ناشتن | ١٣٨٩ |
| | | چاککردنەوەی کەڵەکەکان، تاد | ٣٠٠٠ |
| | | جۆراوجۆرەکان | ٨٠٠٠٠ |
| | | **هەموو خەرجییەکان** | ٢٠٠٠٠ |
| | | بڕی قەرزەکان | |
| **هەموو** | ١٠٠٠٠٠ | | ١٠٠٠٠٠ |

## پاشکۆی هەشتەم
## ئامارەکانی نەخۆشخانەی مەدەنی لە ساڵی ١٩١٩ دا

( بڕوانەلاپەڕەی پێشوو٤٣ )

| مانگ | نەخۆشی هاتوو (داخیلکراو) | | | نەخۆشی دەرچوو (ئیزندراو) | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | هاتووەکان | چارەکراوەکان | مردووەکان | نێرینە | مێینە | هەموو | مەلاریا | نەخۆشی زاوزێ |
| ١٩١٩ | | | | | | | | |
| کانوونی دووەم | ٢٤ | ٢٠ | ... | ١٦٠ | ١٠٠ | ٢٦٠ | ٦٠ | ١١ |
| شوبات | ٢٢ | ٢٠ | ... | ١٩٠ | ٩٠ | ٢٨٠ | ٦٠ | ١٠ |
| ئادار | ٣٠ | ٣٠ | ... | ١٩٠ | ٨٢ | ٢٧٢ | ٧٥ | ١٧ |
| نیسان | ٢٠ | ١٩ | ... | ١٣٠ | ٨٥ | ٢١٥ | ٨٠ | ١٥ |
| ئایار | ٤٨ | ٥٠ | ١ | ٤٩٩ | ٣٠٩ | ٨٠٨ | ٢٤٧ | ١٩ |
| حوزەیران | ٤١ | ٤١ | ... | ٤٣٧ | ٣١٧ | ٧٥٤ | ٣٣٩ | ٣٠ |
| تەمووز | ١٨ | ٢١ | ... | ٤٩١ | ١٨٣ | ٦٧٤ | ٢٥٤ | ٢٣ |
| ئاب | ٤١ | ٤٣ | ١ | ٢٨٦ | ٢١٤ | ٥٠٠ | ٢٤٦ | ١٣ |
| ئەیلوول | ٣٨ | ٢٧ | ٢ | ٢٣٤ | ١٤١ | ٣٧٥ | ١٧٩ | ١٣ |
| تشرینی یەکەم | ٣٥ | ٣٠ | ... | ٢٤٥ | ١٢٥ | ٤٢٠ | ٢١٧ | ٧ |
| تشرینی دووەم | ٧١ | ٦٠ | ٣ | ٥٦٢ | ٣٧٨ | ٩٤٠ | ٥١١ | ٢٧ |
| کانوونی یەکەم | ٥٦ | ٥١ | ... | ٤٩١ | ٣٨٠ | ٨٧١ | ٥١١ | ١٨ |
| | ٤٤٤ | ٤١٢ | ٧ | ٣٩١٥ | ٢٤٥٤ | ٦٣٦٩ | ٢٧٨٨ | ٢٠٣ |

## ئەو سەرچاوانەی سوودیان لیٚ وەرگیراوە بۆ ڕوونکردنەوەکان و نووسینەوەی پەراوێزەکان:


**سەرچاوە کوردییەکان:**

١. ئەستێرە مورتەزایی، ڕاپۆرتی کارگێڕی ساڵی ١٩١٩ – ی دەڤەری ڕواندز (وەرگێڕدراو لە ئینگلیزییەوە)، گۆڤاری ژین، سلێمانی، ژمارە (٥ )، دیسامبەری ٢٠١٣.

٢. حەمید گەردی، هۆزی گەردی لە کوردستان و جیهاندا، چاپخانەی ڕۆشنبیری/ هەولێر، ٢٠٠٦

٣. مەولوود بێخاڵی، هەولێرم وا دیوە، چ ١، بەرگی یەکەم. وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی عیراق/ دەزگای ڕۆشنبیری و بلاْوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٩١.

٤. د. عەبدوڵلاْ غەفوور، گوندەکانی کوردستان – باشوور، ئاراس ( چاپی دووەم)، ٢٠٠٥.

٥. د. عەبدوڵلاْ غەفوور، کوردستان – دابەشکردنی کارگێڕی تریتۆری (١٩٢٧–١٩٩٧) پێڕستی گوندەکانی باشوور، لە بلاْوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری (چاپی دووەم/ سلێمانی)، ٢٠٠٣.

٦. کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا. چاپخانەی گرین گالۆری / لوبنان، ٢٠٠٨.

٧. مەهدی محەمەد قادر، هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩١٤–١٩٣٠ ، دەزگای بەدرخان، چاپخانەی ڕۆژهەلاْت، ٢٠٠٨.

٨. نەهرۆ محەمەد عەبدولقادر – هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩١٨ –١٩٢٦ دا (ماستەر نامە– هەولێر، ٢٠٠٨).

٩. دەستنووسێکی چاپنەکراوی بنەماڵەی دزەیی باسی ڕەچەڵەکی بنەماڵەکانی هۆزی دزەیی و بەشێك لە مێژووی هۆزەکە لە ساڵی ( ١٦١٣ ز تا ١٩٤٥ ز) دەکات. بە دەستخەتی مەلا خالد عەزیز مورتکەیی و بە هاوکاری عەلی مەحموود کاکە خان نووسراوەتەوە.

**سەرچاوە عەرەبییەکان:**

١. د. اسماعيل شكر رسول، اربيل، (دراسة تأريخية في دورها الفكري والسياسي ١٩٣٩–١٩٥٨)، ط ٢، مطبعة بينايي، السليمانية، ٢٠٠٥.

٢. د. رياض مصطفى أحمد شاهين وابراهيم محمد عبداللطيف نعمة الله، بحث عنوانه "ملكية الأراضي والضرائب في مدينة الرملة من خلال سجلات المحاكم الشرعية ملكية الأراضي والضرائب في مدينة الرملة (١٢٨١-١٣٣٣هـ) (١٨٦٤-١٩١٤م) من خلال سجلات المحاكم الشرعية الجامعة الإسلامية بغزة/ كلية الآداب، ٢٠٠٥.
٣. زبير بلال اسماعيل، اربيل في ادوارها التأريخية – مطبعة النعمان / النجف، ١٩٧١.
٤. شاكر خصباك – الاكراد، ١٩٧٢.
٥. عباس العزاوي، اربل في مختلف العصور (اللواء والمدينة). بغداد، مطبعة شركة الخنساء، ٢٠٠١.
٦. هادي جاوشلي – تراث اربيل التاريخي، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥.
٧. د. هاشم خضر الجنابي، مدينة اربيل– دراسة في جغرافية الحضر، ط ١، موصل، ١٩٨٧.

**پەراوێزەکان:**

أ- ئەم بابەتە لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بە کۆدی (FO 371/ 5069) و بە ناوی (Administration Report on the Arbil Division for 1919) تۆمار کراوە و د.نەجات عەبدوڵلا کۆپییە ئینگلیزییەکەی لە سەرچاوەی خۆیەوە (ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لە لەندەن) بەدەست هێناوە و بە سوپاسەوە خستییە بەردەمم تاکو لە زمانی ئینگلیزییەوە وەریگێڕمە سەر زمانی کوردی. بابەتەکە بریتییە لە ڕاپۆرتێکی هەمە لایەنەی مێجەر هەی ( هەروەها بە کاپتەن هەی ناوی بردراوە) حاکمی سیاسیی هەولێر دەربارەی باری سیاسیی لیوای هەولێر بەگشتی لە ساڵی ١٩١٩ نەك ١٩٢٠ وەك لە تایتڵی دەقە ئینگلیزییەکەدا بەهەڵە نووسراوە، چونکە ناوەڕۆك و داتاکان هەموویان گەواهی ئەوە دەدەن کە مەبەست ساڵی ١٩١٩ - یە، نەك ١٩٢٠ و بۆیەش ١٩٢٠- مان کردە ١٩١٩. مێجەر هەی زۆر بە دیقەت و شارەزایانە و پاڵپشت بە زانیاریی ورد و ژمارە، باس لە ژیانی سیاسی، باری ئابووری، پەیوەندیی هۆز و بنەماڵەکان، دادگا، زەویوزار، بازاڕ، نرخ، باج، تەندروستی، کشتوکاڵ، سەربازی و..تاد دەکات. شێوازی ئامادەکردن و نووسینی ڕاپۆرتەکە زیرەکی و توانای کاربەدەستە بەریتانییەکان دەردەخات، کە سەردەمانێکی دووروردرێژ حوکمڕانیی ناوچەیەکی فراوانی ئاسیایان کرد و شوێنەوارێکی گەورەیان لە پاش خۆیان بەجێهێشت، کە هەندێك وڵات توانییان بە باشی سوودی لێوەرگرن. (وەرگێڕ).

١. لە تێکستە ئینگلیزییەکەدا نووسەر لە شوێنی هەولێر وشەی ئەربیل (Arbil) ی بەکارهێناوە (وەرگێڕ).

٢. لە دێر زەمانەوە هەولێر کەوتۆتە بەر شالاوی پەلاماردان و داگیرکردن و زۆر جاریش بۆتە شەڕگەیەکی گرنگ و پێگەیەکی ستراتیجی زلهێزەکانی زەمانە. لە سەردەمانێکی زوودا کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی سەرجۆنی ئەکەدی (٢٣٤٠ پ. ز.)، دواتر دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئاشوورییەکان و دەبێتە ناوەندێکی سیاسی و کارگێڕی و ئاینیی گرنگی ئیمپراتۆری ئاشووری بەتایبەتیش لە سەردەمی حوکمڕانیی سەنحاریبدا (٧٠٤-٦٨١ پ.ز.). لە دوای ئاشوورییەکان دەوڵەتی فارسی داگیری دەکات، ئینجا ماوەیەکیش ئەسکەندەری گەورە داگیری دەکات دوای ئەوەی بەسەر داریوشی سێیەم دوامین پاشای ئەخمینی زاڵ دەبێت (٣٣٠ پ.ز.). دوایی یۆنانییەکان، ماوەیەك دەوڵەتی فەرسی کە پایتەختەکەی حەدیاب بووە حوکمڕانیی هەولێری دەکەوێتە چەنگ، ئینجا دەکەوێتە دەست ساسانییەکان (٢٢٦- ٦٣٧ ز)

دوای ئەوەی ڕۆمەکان تێکدەشکێنن. لە ساڵی ٥٦ هـ لەشکری دەوڵەتی ئیسلامی ساسانییەکان تێکدەشکێنێت و هەولێر دەگرێت. هەولێر ماوەیەك پایتەختی میرنشینیی ئەتابەکی بووە و دوایی دەکەوێتە بەر شاڵاوی دووەمی مەغۆلەکان. قەرەقۆینلو و ئاقۆینلو لە ١٤١٠ تا ١٥٠٨ هەولێر داگیر دەکەن، دواتر شەش ساڵ سەفەوییەکان داگیری دەکەن، لە ساڵی ١٥١٤ دوای زاڵبوونی عوسمانییەکان بەسەر سەفەوییەکاندا، هەولێر دەبێتە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تا ١٩١٨، هەرچەندە دەوڵەتی عوسمانی باج و سەرانەیەکی باشی لە خەڵکی شارەکە وەردەگرت، بەڵام بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدەدا. ساڵی ١٨٣١ میری ڕواندز هەولێر دەگرێت و بۆ ماوەیەکی کورتیش هەولێر دەبێتە دووەمین ناوەندی میرنشینیی سۆران و قادر بەگی برای خێزانی پاشای ڕواندز دەکرێتە فەرمانڕەوای هەولێر (وەرگێڕ).

٣. کوردستان لە سەردەمی حوکمڕانیی عوسمانییەکاندا بە سەر چەند ئیدارەیەکی گەورە دابەش کرابوو بە ناوی ویلایەت یان ئەیالەت، هەر ویلایەتێکیش بە سەر ژمارەیەك ئیدارەی بچووکتر دابەش کرابوو پێیدەگوترا سنجاق کە سنجاقدارێك بەڕێوەی دەبرد، هەر سنجاقەش بەسەر ژمارەیەك ناحیە دابەش کرابوو (وەرگێڕ).

٤. دێرێ (Dera) گوندێکی هۆزی گەردییە و دەکەوێتە نێوان ڕووباری بەستۆرە و هاوینەهەواری پیرمام و ئەو کاتەی بەریتانیا هاتۆتە کوردستان، دێرێ ناحیە بووە و مەجید ئاغای کوڕی کاکل ئاغای گەردی لێ نیشتەجێ بووە و نازناوی دێرێی هەڵگرتووە، لە ساڵانی ١٩١٨– ١٩١٩ دێرێ و هەریر دوو ناحیەی سەر بە قەزای ڕواندز بووینە. ( وەرگێڕ).

٥. زەوییەکانی سەنییە (Sanniyah) بەو زەوییانە دەگوترا کە موڵکی دەوڵەتی عوسمانی بوون (پێشتر موڵکی دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی بوون) و سوڵتان لە ڕێگەی فەرمانڕەواکانی دەوڵەتی عوسمانی یان نوێنەرەکانی سەرافەتی دەکردن و داهاتەکەشی بۆ خەزێنەی دەوڵەتی عوسمانی بوو (وەرگێڕ).

٦. لەبەر ئەوەی قەڵای هەولێر لە لایەن خەڵکی هەولێر بە قەڵات ناو دەبرێت، بۆیە لە وەرگێڕانەکەش هەر وشەی قەڵاتم بەکارهێناوە و لە هەر شوێنێکیش وشەکە هاتبێت مەبەست لێی قەڵای دێرینی هەولێرە کە مێژووناسەکان تەمەنی تۆمارکراوی بۆ ٥٠٠٠ ساڵ پ. ز. دەگێڕنەوە و بەرزییەکەی ٢٥– ٣٠ مەترە و ڕووبەری ئەم تەپۆلکە بازنەییە بێ داروبارە نزیکەی ١٠٢٠٠٠ مەتر دووجایە. بەرزترین شوێنی قەڵاتی هەولێر لە ئێستادا ٤١ مەترە کە دەکەوێتە بەرامبەر بینایەی پارێزگای هەولێر،

خانووەکانی سەر بەدەن ٨٢ خانوون و زۆربەیان پەنجەرەیان لە لای دەرەوە هەیە. قەلات لە سێ گەڕەکی سەرەکی پێکهاتبوو لە ڕۆژهەلاتەوە بۆ ڕۆژئاوا: ١- سەرای: سەرای حکوومەت واتە دامودەزگاکانی میری لەم گەڕەکە بووە، دانیشتوانەکەی کەسایەتی دەوڵەمەند و ئاغا و بازرگانەکان بوون، خانووەکانی زۆر باش و جوان بوون و بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٢٢ نزیکەی ١٧٦ ماڵی لێبووە. ٢- تەکیە: ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی تەکیەی شێخ ئیبراهیم بابا. بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٢٢ تەکیە ٢١٢ ماڵی لێبووە. ٣- تۆپخانە: ئەو ناوە لەبەر ئەوە بووە چونکە تۆپخانەی عوسمانی لەم گەڕەکە بووە بەرامبەر بە ڕێگای مووسڵ. دانیشتوانەکەی پیشەگەر و جووتیار بوون و بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٢٢ گەڕەکەکە ١٣٢ ماڵ بووە (وەرگێڕ).

٧. لە ئایاری ١٩١٦ سوپای ڕووس ڕواندز داگیر دەکات و ئەوەندە خانووەی لە دوای کاولکاری تورکەکان ماوە کاولی دەکات، جگە لە دووسێ خانوو نەبێت کە بۆ حەوانەوەی خۆیان هێشتبوویانەوە و دانیشتوانەکەشی هەراسان و دەربەدەر دەکەن، لەشکری ڕووس لە دوای چەند مانگێك دەکشێتەوە و دیسان تورکەکان داگیری دەکەنەوە و خەڵکەکەشی چۆڵی دەکەن. لە کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ بەریتانیا ڕواندز داگیر دەکات و مێجەر نۆیل دەبێتە یاریدەدەری حاکمی سیاسی (A.P.O.) ڕواندز، لە ئابی هەمان ساڵدا بەریتانیا لێی دەکشێتەوە (وەرگێڕ).

٨. گوندی نەهری (نێری) دەکەوێتە ناوچەی شەمدینانی سەر بە پارێزگای هەکاری لە کوردستانی باکوور، شێخ عوبەیدوڵلای نەهری ڕابەری شۆڕشی ١٨٨٠ دانیشتووی گوندی نەهری بووە، شۆڕشەکە لە ماوەیەکی کورتدا گۆڕەپانێکی فراوانی هەردوو پارچەی باکوور و ڕۆژهەلاتی کوردستان دەگرێتەوە و دەبێتە مەترسییەکی گەورە لەسەر پلانە فراوانخوازییەکانی هەردوو حکوومەتی داگیرکەری تورك و فارس و خەڵکێکی زۆر پشتیوانی لێدەکات. دوای تێپەڕبوونی پتر لە ساڵێك بەسەر بەرپابوونی شۆڕش. بە پیلانێکی هاوبەش لەلایەن هێزەکانی ئێران، ڕووس و تورکیا شۆڕشەکە گەمارۆ دەدرێت و سەرەنجام شێخ عوبەیدوڵلای نەهری کوڕی شێخ تەهای شەمزینی بە دیل دەگیرێ و دەنێردرێتە ئەستەمبۆڵ و دواتر لە ساڵی ١٨٨٣ لەگەڵ ١٠٠ خێزانی کورد بۆ مەدینە دوور دەخرێتەوە و دوای پێنج ساڵ لەوێ کۆچی دوایی دەکات (وەرگێڕ).

٩. نادر شا لە ساڵی ١٧٤٣ – ی زاینی دوای ئەوەی ٦٠ ڕۆژ هەولێری گەمارۆدا، توانی شارەکە داگیر بکات (وەرگێڕ).

١٠. ناوی تەواوی مەلا ئەبوبەکری کوڕی حاجی عومەری کوڕی مەلا ئەبوبەکری سێیەمە (١٨٦٣– ١٩٤٢)، خاوەن پێگەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و ئاینی گەورە بووە، پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ کاربەدەستانی بەریتانیا و حکومەتی پاشایەتی هەبووە و چەند جارێك مەلیك فەیسەڵی یەکەم لەبەر پایە و پێگەی سەردانی کردووە (وەرگێڕ).

١١.مەبەستی نووسەری ڕاپۆرتەکە حکوومەتی بەریتانیایە، چونکە ئەو کات باشووری کوردستان و عێراق بە بڕیاری کۆمەڵەی گەلان (عصبة الامم) لە ژێر ئینتدابی بەریتانیادا بوون و جاریٚ حکوومەتی خۆجێیی لە عێراق دانەمەزرابوو، یەکەم حکوومەتی عێراقی لە ٢٥ – ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠ بە سەرۆکایەتی عەبدولڕەحمان ئەلنەقیب دامەزرا و دەوڵەتی پاشایەتی عێراقیش لە ٢٣– ئابی ١٩٢١ ڕاگەیاندرا و مەلیك فەیسەڵی یەکەم بووە پاشای عێراق (وەرگێڕ).

١٢.ئەحمەد عوسمان لە ساڵی ١٨٧٩ لە دایك بووە، ساڵی ١٩٠٦ ئەندامی دادگای بەرایی هەولێر و ساڵی ١٩١١ ئەندامی دادگای کەرکووك بووە و دوا سەرۆکی شارەوانی هەولێر بووە لە سەردەمی حوکمڕانیی عوسمانییەکان و لە سەردەمی داگیرکاری بەریتانیاش هەر سەرۆکی شارەوانی هەولێر بووە و لە سەردەمی حوکمڕانی پاشایەتی دوو جار بە ئەندامی ئەنجوومەنی عێراق هەڵبژێردراوە، هەروەها یەکەم موتەسەریفی لیوای هەولێر (١٩٢٣) بووە. دوای ئەو لە ساڵی ١٩٢٦ تا ١٩٣٠ عەبدولمەجید یەعقووبی دەبێتە موتەسەریفی هەولێر. ئەحمەد عوسمان لایەنگیرێکی سەرسەختی بەریتانیا بووە و خزمەتێکی زۆری دەسەڵاتی بەریتانیای کردووە و ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە سەقامگیربوونی دەسەڵاتی بەریتانیا و دواتریش سیستەمی پاشایەتی عێراق بە سەر هەولێردا. لە ١٠– ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ کۆچی دوایی کردووە. (وەرگێڕ).

١٣. منارەی چۆلی لە سەردەمی سوڵتان مزەفەرەدین کوکبری (١١٩٠– ١٢٣٢ زاینی) دروست کراوە، کە سوڵتانی میرنشینی ئەتابەکی و هاوسەری ڕابیعە خاتوونی خوشکی سەلاحەدینی ئەیوبی بووە و ئەو کات فەرمانڕەوایەتی هەولێری کردووە. منارەی چۆلی بەرزییەکەی ٣٦ مەترە، دوو دەرگای هەیە و هەر یەکێکیان پەیژەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە تا نەگەنە سەرەوەی منارەکە پەیژەکان تێك ناکەنەوە. منارەکە لە کەرپووچی سوور و گەچ دروست کراوە. ئەو وەستایەی دروستی کردووە ناوی وەستا مەسعوود موراد بووە (وەرگێڕ).

١٤. قەڵات زۆر لە منارەی چۆلی کۆنترە (٥٠٠٠ ساڵ پ. ز.)، لە کاتی حوکمڕانیی میرنشینی ئەتابەکی شارەکە زۆر گەشەی کردووە و فراوان بووە و دەوروبەری منارەی چۆلیش ئاوەدان بووە، ڕەنگە ئەو کات ناوەندی شار بە مانای بوونی دامودەزگا میرییەکان و جموجۆڵی سیاسی و بازرگانی لە قەڵاتەوە گواسترابێتەوە دەوروبەری منارەی چۆلی، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە قەڵات لە بنەڕەتدا ناوەندی شار نەبووە یان دواتر ناوەندی شار لە منارەوە گوازراوەتەوە بۆ سەر قەڵات، هەروەها گەڕەك و شوێنەوارەکانی تری ناو قەڵاتیش دەیسەلمێنن کە قەڵات بەردەوام خەڵکی لێ ژیاوە. گرنگی قەلا و قشڵە و شوێنە بەرزە سەختەکان بەتایبەتیش لە چاخە کۆنەکاندا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە قەلا و شوێنە (عاسێکان) خەڵکیان لە هێرش و پەلاماری داگیرکەران و دەوروبەر پاراستووە و لە هەر شوێنێك زیاتر وەك بەربەستێکی سروشتی یان سەربازی و ستراتیجی پشت و پەنای خەڵك و دەسەڵاتدارە خۆجێییەکان بووینە بۆ پەرپەچدانەوەی پەلامار و خۆپاراستن و داکۆکیکردن لە سەر و ماڵ و سەروەرییەکانیان، لە بەر ئەم هۆیانەش بووە قەڵاتی هەولێر بە بەردەوامی ئاوەدان و ناوەندی ژیان و بەرگری بووە لە هەولێر و ناوچەکە. (وەرگێڕ).

١٥. هۆزی گەردی هۆزێکی پەرش و بڵاوە و بە هەر چوار پارچەی کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە، شوێنە سەرەکییەکانی نیشتەجێبوونیان ئەمانەن: ناوچەی بەڕانەتی و باڵەکایەتی و ناحیەکانی پیرمام، دێگەڵە، کەندێناوە و دیبەگە لە پارێزگای هەولێر و پشدەر لە پارێزگای سلێمانی و ناوچەی شەمزینان لە باکووری کوردستان و لە قامشلی و هەندێك گوندی دەوروبەری حەلەب لە ڕۆژئاوای کوردستان و لە خانێ و ڕاژان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و هەندێك شوێنی تری بەربڵاویش بوونیان هەیە (وەرگێڕ).

١٦. تەی هۆزێکی عەرەبییە و بە سەر چەند تیرەیەك دابەش بووە، بەشێکی لە دەشتی شەمامك، کەندێناوە و قەرەچووغ نیشتەجێ بوون و خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوون، پەیوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵ دزەییەکان لە ڕێگەی ژنخوازییەوە هەبوو و دیارترین شێخی ئەم هۆزە ئەو کات شێخ حەنەش بووە (وەرگێڕ).

١٧. کاکل ئاغای کوڕی جەمیل ئاغای گەردی لە کۆتایی حوکمڕانیی عوسمانی سەرۆکی هۆزی گەردی بووە و زۆرجاریش لە عوسمانییەکان یاخی بووە، جارێکیان لە دوای شەڕێکی سێ ڕۆژەدا عوسمانییەکان دەستگیری دەکەن و لە قەڵای هەولێر زیندانی دەکەن بەڵام لایەنگرەکانی بە یارمەتی دۆستە قەڵاتییەکانی وەك عەبۆ ئاغا و سەعید

ئاغای عوزێری زیندان دەشکێنن و ئازادی دەکەن. کاکل ئاغا دوو کوڕی هەبووە بە ناوی مەجید و جەمیل، مەجید ئاغا لەدایکبووی گوندی بەحرکەیە و کاکل ئاغای باوکی داوای لێدەکات بچێتە ناوچەی دێرێ کە دەکەوێتە ئەو بەری چەمی بەستۆڕە و ئەوێ ئاوەدانی بکاتەوە، ئەویش لە گوندی دێرێ دادەنیشێت دیوەخانێکی گەورە دروست دەکات و دوای مردنی باوکی دەبێتە سەرۆکی ئەو بەرەبابەی گەردییان کە لە دێرێ و گوندەکانی دەوروبەری نیشتەجێن، مەجید ئاغا ٩ ژنی هێناوە و ٢٢ کوڕ و ١٤ کچی هەبووە. جەمیل ئاغای برای لە بەحرکە نیشتەجێ دەبێت و سەرۆکایەتی ئەو بەشەی گەردییەکان دەکات کە لە بەحرکە و گوندەکانی دەوروبەری نیشتەجێن. ئەو بەشەی گەردیانیش کە لە ئەشکەوسەقا و گوندەکانی تری نزیکی دەژین مامەند ئاغای گەردی سەرۆکیان بووە (وەرگێڕ).

١٨. مەبەستی گوندی نەهری (نێری) ناوچەی شەمزینانە و زێدی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییە دەکەوێتە نزیك شەمزینان لە ویلایەتی هەکاریی کوردستانی باکوور، لە شوێنێکی تریش مێجەر هەی ئاماژە بەم گوندە دەکات بە هۆی ئەو کۆمەکەی بۆ خەڵکی دەربەدەر و لێقەوماوی ڕواندز ناردوویانەتە شاری هەولێر (وەرگێڕ).

١٩. برایم بایز ئاغای دزەیی، یەکێکە لە پیاوە ناودارەکانی عەشیرەتی دزەیی لە ساڵی ١٨٤٠ –١٨٤١ لە قووشتەپە لە دایك بووە و لە نێو هۆزی دزەییەکاندا لە بەرەبابی بایزە. دوای ئەوەی قووشتەپە جێدەهێڵێت لە مەخموور نیشتەجێ دەبێت و زەوییە بەیارەکان دادەچێنێت و دەیانکاتە سەوزایی، برایم ئاغا پیاوێکی زیرەك، وردبین، دبلۆمات و بێ فیز بووە و دیوەخانەکەی هەموو جۆرە کەسێکی تیدا بووە، دەوڵەمەند و هەژار و ئاغا و جووتیار. برایم ئاغا چەند جارێك لەگەڵ عەرەبەکان و عوسمانییەکاندا تێکگیراوە و بەشەڕ هاتووە، بۆ ماوەیەکیش عوسمانییەکان دەستگیریان کردووە و لە ٤ – ی ئابی ١٩٢٠ کۆچی دوایی کردووە.

٢٠. لە هۆزی دیکەش خوبزە هەبووە وەك هۆزی بڵباس و مامەش (وەرگێڕ).

٢١. هۆزی دزەیی چوار تیرە یان بەرەبابن ؛ بەرەبابی بایز، پاشا، فارس و کاکە خان (وەرگێڕ).

٢٢. برایم ئاغا کوڕی بایز ئاغای دزەییە، سەرۆکی هۆزەکە بووە و و چوار برای لە خۆی بچووکتری هەبووە، سەرەتا لەگەڵ تورکەکان لە سەر کێشەیەکی کۆمەڵایەتی لەگەڵ خەیلانییەکان دەبێتە ناخۆشییان و کە دەزانێت بەرگری عوسمانییەکانی پێناکرێت دەچێتە ناوچەی شوان و شێخ بزێنی و تا ساڵی ١٩١٤ بەردەوام لەگەڵیاندا لە شەڕدا بووە، لە ساڵی ١٩١٤ دەبێتە سەر لەشکری هێزێکی نافەرمی (غەیرە نیزامی) کە لە

لایەن حکوومەتی عوسمانی لە دزەییەکان بۆ بەشداری لە یەکەمین شەڕی جیهانیدا پێك دەهێندرێت و دەگاتە خوی و سەلماس. برایم ئاغا لە ساڵی ١٩٢٢ کۆچی دوایی دەکات و دوو کوڕی لە دوا بەجێدەمێنێت؛ مشیر ئاغا لە ساڵی ١٩٤٥ کۆچی دوایی کرد و هاوار ئاغاش لە مانگی تەممووزی ٢٠١٤ کۆچی دوایی کرد (وەرگێڕ).

٢٣. ئەحمەد پاشا کوڕی حوسێن ئاغای عەلی ئاغای دزەییە، پیاوێکی زۆر ژیر و زۆریش بە هەڕەشە بووە، زۆریش دەوڵەمەند بووە. ڕووداوی دزینی دوو هێسترەکەم لە هیچ سەرچاوەیەکی تر نەبینیوە و بۆیە ناکرێ بۆ سەلماندنی ئەم ڕووداوە تەنیا پشت بە قسەکەی مێجەر هەی ببەسترێت. ساڵێك گەنجینەی حکوومەتی عوسمانی بەتاڵ دەبێت، ئەویش چەند هەزار قرووشێکیان پێدەدات، ئەوانیش لە پاداشتی ئەو چاکەیە پلەی پاشای پێ دەبەخشن، هەشت کوڕی هەیە و نۆبەرەکەی خدر ئاغایە (دەستنووسێکی چاپنەکراوی بنەماڵەی دزەیی باسی هۆزی دزەیی دەکات لە ١٦١٣ ز تا ١٩٤٥ ز).

٢٤. ڕەنگە مێجەر هەی لەبەر ئەوەی ئەحمەد پاشا دۆستێکی نزیکی عوسمانییەکان بووە و پلەی پاشای لەلایەن ئەوانەوە پێدراوە، بۆیە بەم شێوە خراپە باسی دەکات، حکوومەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٢ ئەحمەد پاشا و حاجی پیرداود ئاغا بە تۆمەتی هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ ئۆزدەمیر لە ڕواندز و پیلانی دابڕینی هەولێر لە دەسەڵاتدارێتی بەریتانیا دەستگیر دەکات و دەیاننێرێتە موسڵ و دواتر بۆ فەلەستین دوور دەخرێنەوە (وەرگێڕ).

٢٥. دوو گوند هەیە بە ناوی حلوەی سەرەوە و حلوەی خوارەوە ، جاران سەر بە ناحیەی زاب بوون (وەرگێڕ).

٢٦. زەویی مودەوەرە ئەو زەوییانەن کە کاتی خۆی موڵکی سوڵتانی عوسمانی بووە و دوای بەرپابوونی شۆڕشی تورکیا لە ساڵی ١٩٠٨، بوونەتە موڵکی دەوڵەتی تورکیا و هەروەها پێشی گوتراوە (جفتلك) واتە مودەوەرە یان گواستراوە واتە لە موڵکی سوڵتانەوە گواستراوەتەوە بۆ موڵکی دەوڵەتی تورکیا. (وەرگێڕ).

٢٧. دوبە (قایغ) لە ژمارەیەك مەشکە یان چوویی فوودراو و تەختە دروست دەکرێت، تەختەکان لەسەر مەشکە فوودراوەکان دادەندرێن و بەباشی دەبەسترێنەوە دواتر و لە هەردوو لای زێ یان ڕووبار بە گوریسێکی (کێبڵ) قایم و ئەستوور دەبەسترێتەوە بۆ پەڕاندنەوەی مرۆڤ، شتومەك، ئاژەڵ و هەندێ جار ئۆتۆمبیلیش بە پانتایی ئاوەکە بەکاردێت، کەڵەکیش هەمان شتە بەڵام بە درێژایی ڕووبار یان زێ دەڕواتە

خوار و شتومەك لە شوێنێك بۆ شوێنێكی تری بەرەو ڕێڕەوی ئاو دەگوازێتەوە (وەرگێڕ).

٢٨. لە ساڵی ١٩١٩ ڕاپەڕینێكی بەربلاو لە سلێمانی و شارۆچكەكانی زاخۆ، ئامێدی و ئاكرێ دژی دەسەڵاتی داگیركەری بەریتانی بەرپا بوو، لە ئەنجامدا هەردوو یاریدەدەری حاكمی سیاسی زاخۆ و ئاكرێ و حاكمی سیاسی موسڵ و ژمارەیەكی تریش ئەفسەر و پلەداری ئینگلیز لە پێكدادانەكاندا كوژران و لە سلێمانیش شێخ مەحموودی حەفید دەسەڵاتی گرتە دەست (وەرگێڕ).

٢٩. لە ١٠ – ی مانگی ئابی ١٩١٩ حاكمی سیاسی بە بەتالیۆنێكەوە لە شارۆچكەی ڕواندز بەرەو باتاس كشایەوە و نووسینگەی حاكمی سیاسی لە باتاسەوە دامەزراند و ڕاستەوخۆ كاروباری هەردوو ناحیەی دێرێ و هەریری بەڕێوەدەبرد (وەرگێڕ).

٣٠. مەحموود ئاغای كوڕی قەرەنی ئاغا ماوەیەك لەگەڵ داود پاشای والی بەغدا لێیان دەبێتە شەڕوشۆڕ و بە ناچاری ناوچەكە بەرەو شوان و شێخ بزێنی بەجێدێڵێت و لە حكوومەتی عوسمانی یاخی دەبێت تا لە دواییدا لە بەغدا دەخالەتی بۆ وەردەگیرێت و ئینجا دەگەڕێتەوە، هەروەها مەحموودی كاكە خانیش بەردەوام لەگەڵ حكوومەتی عوسمانی لە شەڕدا بووە. لە درێژەی بەرەنگاربوونەوەی حكوومەتی عوسمانیدا، برایم ئاغای بایزاغا بە یاوەریی ژمارەیەك ئاغای تری دزەیی لە گوندی عارەب كەند بەرەنگاری هێزێكی عوسمانی دەبێتەوە و شەڕێكی خوێناوی لە نێوان هەردوولا دەقەومێت، سەرەنجام عوسمانییەكان بە پیلانێك برایم ئاغا و ژمارەیەك ئاغای تر دەستگیر دەكەن و سێ ساڵ لە كەركووك زیندانییان دەكەن. دزەییەكان لەگەڵ میرنشینیی سۆرانیش چەند جار تووشی شەڕ و پێكدادانی خوێناوی هاتوون، بە تایبەتی لە سەردەمی فارس ئاغا كە هەر دوو كوڕەكەی (حوسێن و مەعرووف) لە یەكێك لەم شەڕانەدا دەكوژرێن و سەرەنجام ناوچەكەیان دەبێتە بەشێك لە قەڵەمڕەویی میرنشینی سۆران. هەروەها دزەییەكان لەگەڵ لەشكری بابان بە سەرۆكایەتی مەحموود پاشا بە پشتگیری داود پاشا بە شەڕ چووینە (وەرگێڕ).

٣١. ئەحمەد پاشای دزەیی، حاجی پیرداود ئاغای دزەیی، عەلی پاشا دۆغرەمەچی، ڕەشید ئاغا، سەید عەبدوڵلا پاشای نەقیب لە سەردەمی حوكمڕانی عوسمانی دۆستی نزیكی دەوڵەتی عوسمانی بوون و هەندێكیان پلەی پاشایان لە لایەن سوڵتانەوە پێدەبەخشرێت، پێش داگیركردنی هەولێر و دوای داگیركردنیشی لە لایەن بەریتانیاوە ئەوان لە كەسایەتییە دیارەكانی بەرهەڵستكاری دەسەڵاتی بەریتانیا

بوون، بە پێچەوانەی ئەوانیش مەلا فەندی، ئەحمەد عوسمان، برایم ئاغای دزەیی، قورشید ئاغا و حەسەنی مەلا لایەنگیری بەریتانیا بوون (وەرگێڕ).

۳۲. مێجەر هەی لەم سەردانەدا میوانی مەحموودی ئۆمەری قادری مام زێنـدینی قـەرەنی ئاغا بووە (وەرگێڕ).

۳۳. دەگوترێ دەخاڵەت واتـە: تەسلیمبوون یان پـەناهێنان، لـە سـەردەمی حوکمڕانیی عوسمانی و بەریتانیادا و لـە ناوچـەی هـەولێر وشـەی دەخاڵـە بـەکار هـاتووە و بـەو مانایەی کە یەکێك یـان تاقمێك لـە دەوڵـەت یـاخی بـبن و دوایـی داوای چارەسـەرێك بکەن تاکو دەوڵەت لێیـان خۆشـبێت و داڵـدەیان بـدات بەرامبـەر جـۆرە باجێـك یـان جزیەیـەك. نووسـەر هـەمان وشـە کوردییەکـەی (Dakhalah) بـەکارهێناوە ، لێـرەدا مەبەستی لێخۆشبوون و داڵدەدانی ئاغاکانی دزەییـە لەلایـەن بـەریتانیاوە بەرامبـەر ژمارەیەك تفەنگ و هەندێك پارە (وەرگێڕ).

۳٤. چوار گوند بەو ناوە هەیە؛ زمارەی گەورە، زمارەی جاسم، زمارەی سابیر و زمارەی عەبدوڵلا، هەر چواریان سەر بە ناحیەی گوێڕن (وەرگێڕ).

۳٥. لە نامەی ماستەری نەهرۆ محەمەد (هەولێر لە نێوان سـاڵانی ۱۹۱۸– ۱۹۲٦ دا) بـەم شێوەیە باس لەم ڕووداوە کراوە " دەستەیەك لە دانیشتوانی شار بـە سـەرکردایەتی حەسەنە شـەل (نـاوی حەسـەنی کـوڕی سـەکرەی کـوڕی ئەحمـەدە و لـە ۱۸۸۳ لـە گوندی سەکران لە دایك بـووە و لـە تیرەیـەکی هـۆزی بڵباسـە) ویسـتیان زەبرێك لـە بەریتانییەکان بوەشێنن، ئەندامانی دەستەکە لە سەرەوە خۆیان وا نیشـان دەدا کـە دۆستی بەریتانیان بەڵام لە ژێرەوە دوژمنی بوون، دیارە عـەلی پاشـای دۆغرەمەچـی دۆستی دێرینی عوسمانییەکان ڕێبەر و پلاندانەری ئەم ڕووداوە بووە، ئەم دەسـتەیە لــە نێــوان گونــدی ڕەشــکێن و چــالوك پــەلاماری پۆســتەیەکی ئینگلیــز دەدات، سەرەنجام دەست بەسـەر قاسـەکەدا دەگیرێـت و ژمارەیـەك سـەربازیش دەکـوژرێن. هەندێك ئەم ڕووداوە بـە کردارێکـی بـەرەنگاری دژی دەسـەڵاتی بـەریتانی لـە قەڵـەم دەدەن، بەڵام ئەگەری ئەوەش هەیە کردارێکـی ڕێگـری بووبێـت. سـەرەڕای ئـەوەش دەبــی بڵــێین لەبــەر ئــەوەی ئــەم کــردارە دژی بەریتانییــەکان ئەنجامــدراوە و ئەنجامدەرانیشی لە لایەن دەسەڵاتی بەریتانییەوە لـە سـێدارە دران، بۆیـە خراوەتـە بازنەی دژایـەتی دەسـەڵاتی بـەریتانیا و لەسـێدارەدانەکەش ( لـە ڕاپۆرتەکـەی هـەی باسی نەکراوە — وەرگێڕ ) سۆزی خـەڵکی هـەولێری وروژانـدووە و زیـاتر ڕقیـان لـە دەسەڵاتی بەریتانی هەڵگرتووە " (وەرگێڕ).

۳٦. ئـەم ڕووداوە لـە لایـەن سـەید مـەولوود بێخـاڵی لـە کتێبـی "هـەولێرم وا دیـوە" بەشـێوەیەکی تـر باسـی لێـوەکراوە و بـۆ ئەمانـەت ئەویشـیان دەخەینـە ڕوو: "سێرجێنت مێسیوون دەچێتە ئەو ئاهەنگخانەیەی (یانەی شەوانە) کە لەسـەر بـانی یەکێك لە چایخانەکان دروست کرابوو و لەسەر کورسییەك لە پێشـەوە دادەنیشـێت و قاچ لـە سـەر قـاچ دادەنێـت و دووکـەڵی سبیلەکەشـی بـە دەموچـاوی ئامـادەبووانی ئاهەنگەکە دادەکات، ئەم ڕەفتارەشی دەبێتە هۆی ورووژاندنی ڕك و کینـەی هەنـدێ لە ئامادەبووان و یونس ئاغـاش لـەوێ دەبێـت و سەرزەنشـتی سـێرجێنت مێسـیوون لەسـەر ئـەم ڕەفتـارەی دەکـات، لـە ئاکامـدا سـێرجێنت مێسـیوون فـەرمان بـە زەفتییەکانی (پاسەوانەکانی) دەدات کە یونس ئاغا و هاوەڵەکانی وەدەرنێن. یـونس ئاغـاش لەگـەڵ بیسـتنی ئـەم فەرمانـە بـە دەمانچـە تەقـەی لێـدەکا و سـێرجێنت مێسـیوون دەکوژێـت". هەرچـەندە بـەپێی نووسـینەکەی مێجـەر هـەی ڕووداوی کوشـتنەکە دوای هـاتنی سـەعید ئاغـای عـوزێری بـاوکی یـونس ئاغـا قـەوماوە و بکوژەکەش بەسەر عەبدوڵلا ئەفەندی ساغ دەبێتەوە، بەو پێیەی کە ئەو دەمانچـەی مێسـیوونی پـێ کـوژرا لـە مـاڵی ئـەو دەدۆزرێتـەوە و ئـەویش تـەنیا کەسـە کـە لـەم ڕووداوەدا حـوکمی لـە سـێدارەدانی بـۆ بڕاوەتـەوە و یـونس ئاغـا و باوکیشـی بەزیندانکردن حوکم دران. دوای دامەزرانـدنی دەوڵـەتی عێـڕاق لـە سـاڵی ۱۹۲۱ ، بـە فەرمانێکی شاهانە هەردووکیان ئازاد دەکرێن (وەرگێڕ).

۳۷. ڕەبـاس بـە مانـای تێـر ئـاو بـوونی زەوی دێـت چ بـە بـاران بێـت یـان بـە ئـاودێری، هەرچەندە نووسەر بە واتایەکی تر ئاماژەی پێکردووە (وەرگێڕ).

۳۸. تەڕەکار یان تەڕەکاڵ واتە کێڵانی زەوی لە دوای بارانێکی درەنگ وەخـت. تـۆکردنی ئەم جۆرە زەوییەش کە ڕاستەوخۆ دوای کێڵانەکە دەبێت، پێی دەگوترێت تەڕەوەز، دیارە نووسەر لە جیاتی تەڕەوەز تەڕەکاری بەکارهێناوە و دیـارە ئەمـەی دوایـی بـە جۆری چاندنەکە تێگەیشتووە (وەرگێڕ).

۳۹. لاخ (Lakh) وشەیەکی هیندییە بە مانای سەد هەزار دێت (وەرگێڕ).

٤۰. زەوی مەحلول ئەو زەوییانەن کە موڵکی سوڵتان یان دەوڵەتی عوسمانین (وەرگێڕ).

٤۱. مەبەست مەئمووری وەقفە (ئەوقاف)، دەگوترێت ئەو کـات وەقفـی هـەولێر سـەر بـە کۆیە بووە و لەلایەن فەرمانگەی وەقفی کۆیەوە سەرپەرشتی دەکرا (وەرگێڕ).

٤۲. ئەنجوومەنەکە لە مەلا فەنـدی، عەبـدوڵلا پاشـا، محەمـەد ئەفەنـدی مـوفتی هـەولێر، ئەحمەد عوسمانی سەرۆکی شارەوانی، عەلی پاشا دۆغرەمەچی، حاجی ڕەشید ئاغـا پێکهاتبوو (وەرگێڕ).

٤٣. جوولەکەکانی هەولێر لە دوا ساڵەکانی حوکمڕانی عوسمانی لە قەڵاتەوە دەگوێزرێنەوە خوارەوە و لە گەڕەکی تەعجیل نیشتەجێ دەکرێن (وەرگێڕ).

٤٤. دیارە ئەوکات لەبەر نەبوونی بینایە بۆ نەخۆشخانە، لە هەولێرو کۆیە بینایەی قوتابخانەکان درابوونە نەخۆشخانەکان (وەرگێڕ).

٤٥. دکتۆر عەبدولئەحەد عەبدولنور خەڵکی شاری موسڵ بووە و یەکەم پزیشک بووە کە خەڵکی هەولێری بە دەرمانی نوێ ئاشنا کردووە(وەرگێڕ).

٤٦. جەژنی نەورۆز یەکێکە لەو بۆنانەی هەر لە مێژەوە لە کوردستان یادی کراوەتەوە، بەڵام لە ڕاپۆرتەکەی هەی باسی لێوە نەکراوە، هەروەها ڕاپۆرتەکە ئاماژەی بە یادکردنەوەی جەژنی مەولودی پێغەمبەری موسوڵمانان و هەندێك بۆنەی وەك جەژنی قیامەی مەسیحییان و کەپرە شینکەی جوولەکەکان نەکردووە (وەرگێڕ).

٤٧. سەید تەها کوڕی شێخ محەمەد سدیقی کوڕی شێخ عوبەیدوڵلای نەهرییە. پیاوێکی زۆر کەتە و قەڵەو بووە و خوێندەوارێکی چاك بووە، کوردی، تورکی، فارسی و کەمێك ڕووسیشی زانیوە. لە شەڕی یەکەمی جیهاندا لە ڕووسەکان نزیك بووە و بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی کاری کردووە. سەید تەها لایەنگری سمکۆی شکاك و حکومەتی خاوە نشکۆی بەریتانیاش بووە. لە ئایاری ١٩١٩دا سەردانی ڕواندز و بەغدای کردووە و ئامادەیی خۆی بۆ یاریدەدانی بەریتانیا دەربڕیوە (وەرگێڕ).

٤٨. "الموصل"بڵاوکراوەیەك بووە ئەو کات لە شاری موسڵ دەرچووە و ناوبراویش کاری تێداکردووە (وەرگێڕ).

## ملخص التقرير

اعد هذا التقرير (التقرير الاداري للواء اربيل عام ١٩١٩) من قبل الميجر هَّى الحاكم السياسي لمنطقة اربيل عام ١٩١٩، ويتناول الوضع الاداري لمنطقة اربيل (اصبح لواء اربيل في الاول من تشرين الثاني من ١٩١٩) أبان الاحتلال البريطاني لكوردستان الجنوبية ويتناول مختلف جوانب الحياة السياسية، الاقتصادية، المالية، الاجتماعية، الصحية، الزراعية، العسكرية، الاعمار، الوقف، التعليم، الضرائب، القضاء والوضع العشائري...الخ. خلال عام ١٩١٩. يبدأ التقرير بتسليط الضوء على جغرافية المنطقة ووضعها الاثنوغرافي للمنطقة التي كانت تتألف بالاضافة الى بلدة اربيل وضواحيها من نواحي كوير، قوشتبة، كنديناوة ومخمور. ثم يتحدث التقرير عن كل ناحية على حدة؛ ويبدأ ببلدة اربيل وقرية عنكاوة وتركيب السكان العرقي والديني فيهما ومعالم اربيل التأريخية والعمرانية ويتناول الشخصيات البارزة والعوائل المتنفذة في البلدة والمنطقة في وقت حرج من تأريخها والمليء بالاحداث السياسية والتغيرات الكبيرة التي حدثت في مجمل اوضاع والخارطة الجيوسياسية للعالم والمنطقة اثر انتهاء الحرب العالمية الاولى وانتصار بريطانيا وحلفائها وانهيار الامبراطورية العثمانية.

قسم من التقرير مكرس للحديث عن القلعة، المئذنة المظفرية، التركيب العرقي والديني لمنطقة أربيل وكذلك يتطرق الى الشخصيات الشهيرة من امثال؛ الملا أفندي وأحمد أفندي وعلي باشا وغيرهم، وعشائر المنطقة مثل الكردي والدزةئي وزعمائهم؛ جميل آغا ، ماجد آغا، إبراهيم آغا، محمود كاكا خان وأحمد باشا... الخ.

ثم يتناول التقرير اوضاع النواحي الخمسة باسهاب، وبعد تناول اوضاع بلدة اربيل وقرية عينكاوة، يبدأ بناحية قوشتبة الغنية بالسهول الخصبة المترامية وعشيرة الدزةئي الساكنة فيها ويتطرق الى الاقسام الاربعة لهذه العشيرة ورؤسائها الاربعة ويتحدث عن العلاقة والصراعات الموجودة بينهم من جهة وصراعاتهم مع الحكومة البريطانية من جهة اخرى. يسرد التقرير كذلك صفات ومميزات الشخصيات المحلية المتنفذة ورؤساء العشائر الكوردية وعلاقاتهم العامة ايضاً. بعد ذلك يتناول الوضع العام في كنديناوة وكوير. ويتطرق باسهاب الى الوضع السياسي والعشائري في منطقة اربيل بما فيها تمرد عشيرة درةئي على السلطة البريطانية والموقف من ثورة

شيخ محمود الحفيد والعلاقة بين العشائر الكوردية والعربيـة علـى ضـفاف نهـر دجلـة والزابين الاعلي والاسفل.

يتضمن التقرير كذلك وضع القضاء والمحـاكم والقضـايا الـتي تم البـت فيهـا في تلك السنة وعدد جرائم القتل، النهب والسرقات التي رصـدت. بعـد ان يتفقـد التقريـر اوضاع الدرك والشرطة، يعرج الى الوضع الزراعي وانتـاج المحاصـيل الشـتوية (القمـح والشـعير علـى وجـه الخصـوص) والمحاصـيل الصـيفية منهـا الـرز، الـدخن، الـذرة البيضاء، السمسم، الماش، الحمص، القطن، الخضروات والفواكه. ويتضـمن التقريـر ايضاً نشاطات المجلس البلدي ودور المختارين في تنظيم الامور الحياتية والخدميـة في المحلات والقرى.

يتضمن التقرير معلومات دقيقة مشـفوعة بالارقـام والاحصـائيات (منشـورة في ثمانية ملاحق) عن الواردات، النفقات، الضرائب، الجبايات، السلف الزراعية، الطـابو، الادويـة، عـدد المـوظفين والمسـتخدمين عـدد المرضـى المعـالجين في تلـك الفـترة. ويتحدث التقرير ايضاً عن حالة الطقس، التربية والتعليم، الصـحة، العقـارات، الطـابو والوقف، بالاضافة الى الخدمات العامة مثل تعبيد الطرق، اسالة الماء، انشاء الجسور والقناطر، بناء المستشفى والدوائر الحكومية او ترميمها والاحتفالات التي اقيمت مـن قبل سلطة الاحتلال البريطاني طوال عام ١٩١٩. يذكر ان منطقـة اربيـل دخـل تحـت الحكم البريطاني يوم ١١ تشرين الثاني عام ١٩١٨ وبعد يومين اصبح الميجـر مـوراى اول حاكم سياسي لاربيل ثم خلفه الميجر هَّى في ١٤ تموز ١٩١٩.

## Abstract

This report "Administration Report on the Arbil Division for 1919" has been prepared by Major Hay the Political Officer of Erbil in 1919 during the occupation of Britain of southern Kurdistan. It takes upon various political, economic, financial, social, health, agricultural, military, advances, waqf, education, taxes, juridical, tribal situation, etc. of the Erbil district in 1919 (the Erbil Division was formed in November 1st, 1919). The report starts with shedding light on geography and ethnographic situation of the region, which was composed in addition to the Erbil Nahiyah, Qushtappah, Kandinawah, Mukhmur, and Quwair. W. R. Hay has also talked about the ethnic composition, religious, tribes, families and personalities all over the Erbil District in this critical historic period.

Part of this report is being devoted to talking about the Citadel, Minaret, ethnic and religious in Erbil as well famous personalities of town; Mulla Effendi, Ahmad Effendi and Ali pasha, and about the Girdi and Dizai tribes and their chiefs; Jamil Agha, Majid Agha, Ibrahim Agha, Mahmud Kaka Khan, Ahmad Pasha, etc.

After talking about Erbil Nahiyah, the report take over other Nahiyahs in detail, starting with Qushtappah's topographic and four sections of Dizai tribe. The report also talking about the relationship conflicts existing between Dizai chiefs on the one hand and their conflicts with the British government on the other hand. The report also lists the characteristics of powerful local figures and tribal leaders of the Kurdish and public relations as well. After that deals with the general situation in Kandinawah, Mukhmur, and Quwair. And deals extensively to political and tribal situations in district, including the rebellion Dizai tribe the power and position of the British during Sheikh Mahmoud revolt and the relationship between the Arab and Kurdish tribes on the both banks of the Tigris, greater Zab and lesser Zab.

The report also includes the status of the judiciary, the courts and the issues that have been decided in that year and the number of crimes of murder, looting, thefts spotted then shows the setting of the police and gendarmes. The report included the agricultural production, winter crops (wheat and barley in particular) and summer crops such as rice, millet, sorghum, sesame, livestock, chickpeas, cotton, vegetables and fruits. The report addressed to the municipal council and the role of mayors in organizing things in life and service shops and villages.

The report includes also accurate information supported by statistics (in eight appendixes) about pedigree of dizai chiefs, seed advances, receipts from revenues, customs and kodah, taxes, number of patients in civil hospital. The report also mentioned on the state of the weather, education, health, number of mortgage or registered houses and shops, in addition to public services such as roads, water supplied, bridges, construction of the hospital and the government departments or restoration and establishment of ceremonies carried out by the authority of the British occupation throughout 1919. Erbil was taken over for the British Government on November 11, 1918, two days later Major Murray became the first A. P. O. of Erbil. Major Hay was appointed as P. O. on July 14, 1919.

# کورد و کوردستان
# لە گەشتنامەی جۆزافا بەڕبارۆدا
## ( ٨١٦-٩٠٠ك/١٤١٣-١٤٩٤ز )

**م. رابیعە فەتاح شێخ محەمەد**
بەشی مێژوو_کۆلیژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین

**پوختە:**
بەرهەمی ئەو گەشتانەی گەڕیدە ئەوروپییەکان بۆ کوردستان کردوویانە، بەشێکی گرنگ و پڕ بایەخی مێژووی کورد و کوردستانیان پێکهێناوە، گەڕیدە ئەوروپاییەکان پاش سەردەمی بووژانەوە–رینیسانس–[1] بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەوە، زۆربەی زۆریان سەفەرەکانیان کردۆتە کتێب و تیایدا بابەتی زۆر گرنگیان باس کردووە، جۆزافا بەڕبارۆ(JOSAFA BARBARO)ی ئیتالی دوو گەشتی بۆ رۆژهەڵات کردووە، لە هی یەکەمیان لە کوردستان دووربووە، بەڵام هی دووەمیان چوون و هاتنی بە کوردستاندا بووە و بۆخۆشی بەشێك بووە لە پلانی کۆماری ڤینیسیا تا هاوکاریی دەوڵەتی ئاق قۆیونلو(٨٧٢– ٩١٠ك/١٤٦٧–١٥٠٥ز) بکا لە دژی دەوڵەتی عوسمانی. بەڕبارۆ لەبارەی کورد و کوردستانەوە سەرنجی بە بایەخی نووسیوە و باسی جموجۆڵی سیاسیی کوردی لە باکووری کوردستان کردووە و لە یەکەم رۆژئاواییەکانە لەوە دوابێت زمانی کوردی زمانێکی جیاوازە لەوانەی دەوروبەری.

**پێشەکی:**
هێرشە یەك لە دوای یەکەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەرەو رۆژئاوا (ئەوروپا) لە کۆتاییەکانی سەدەی (٩ك/١٥ز) و سەرەتاکانی سەدەی (١٠ك/١٦ز) وای لە کۆماری ڤینیسیا کرد، هەوڵی جدی بدا تا لە سنووری رۆژهەڵاتی دەوڵەتی

عوسمانی هاوکارێك بدۆزێتەوە و مەترسی لە خۆی دوور بخاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە باڵیۆزەکانی نارده خاکی ئێران تا لەگەڵ دەوڵەتی ئاق قۆیونلو رێك بکەون و لەو سنوورەوە هێرش بۆ دەوڵەتی عوسمانی ببەن، ئەو سنوورەش بێگومان خاکی کوردستان بوو.

لە ماوەی دەسەلاتداریێتی ئوزون حەسەن (٨٥٧-٨٨٢ك/١٤٥٣-١٤٧٧ز)ی سەرداری ئاق قۆیونلودا باڵیۆزانی کۆماری ڤینیسیا روویان لە کوردستان و ئێران کرد، دەتوانین بڵێین هەموویان ئوزون حەسەنیان دیوە و ماوەیەك لە دەرباریدا ماونەتەوە، لە رێرەوی هاتن و چوونیاندا بە کوردستاندا تێپەریون، هەندێکیان ماوەیەکی باش ماونەتەوە، لەو سۆنگەیەوە سەرنجی خۆیان لە بابەت کورد و کوردستان و نەتەوەکانی دەوروبەری نووسیوە.

جۆزافا بەرپارۆ یەکێکە لە سەرقافڵەی ئەو باڵیۆزانەی کۆماری ڤینیسیا، کە چووەتە دەرباری ئوزون حەسەن لە تەورێز، مەبەستی سەرەکیی کۆماری ڤینیسیا لەو پەیوەندییە لەگەڵ دەوڵەتی ئاق قۆیونلو بریتی بووە لە ناردنی چەك و تفاق بە گوێرەی پلانێك بۆ بەهێزکردنی دەوڵەتی ئاق قۆیونلو تا شەری دەوڵەتی عوسمانیی پێ بکا، بەرپارۆ بەشێکی گرنگ بووە لەو پلانە، هاوکات لەگەڵ کەشتییە پڕ چەك و تفاقەکان لەگەڵ باڵیۆزی ئوزون حەسەن لە ئیتالیا هاتۆتە دەریای ناوەراست و پاشان هاتۆتەوە ئێران[٢].

بەرپارۆ لەبەر ئەوەی بە پلەی یەکەم ئەرکەکەی سیاسی بووە، هێندە لە کوردستان نەماوەتەوە، مانەوەکەشی لە پێناو گەیشتن بە دەرباری ئاق قۆیونلو بووە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا سەرنجی ورد و بە پێزی لە بارەی کورد و کوردستانەوە تۆمارکردووە، گومان لەوەدا نییە ئەو سەرنجانەش کە هی کەسێکی رۆژئاواییە بۆ مێژووی کورد و کوردستان جێگەی گرنگی و بایەخ پێدانن.

باسەکە لە چوار تەوەر پێکهاتووە تەوەر ی یەکەم تایبەتە بە ژیان و ئەرکی بەرپارۆ لە ئێران و کوردستاندا، هەرچی تەوەر ی دووەمە تیایدا لا لە خودی کتێبەکەی بەرپارۆ، بە واتا گەشتەکەی کراوەتەوە و سەرباری ئەو سەرچاوانەی بۆ گەشتەکە پشتی پێ بەستوون. لە تەوەری سێیەمدا ئەو سەرنجانەی بەرپارۆ خراونەتە روو لە بابەت مێژووی سیاسیی باکووری کوردستان لە ماوەی

دەسەڵاتدارێتی ئوزون حەسەندا، ئەو ماوەیەی سەردارانی ئاق قۆیونلو زۆربەی زۆری میرنشینە کوردییەکانیان رووخاند، لە دوا تەوەردا باس لە بارودۆخی ئابووریی هەندێ شار و قەڵای کوردی کراوە و هەندێ سەرنجی بەرپارۆ لە بارەی کۆمەڵگای کوردی و چەند خاڵێکی کەسایەتیی کورد خراوەتەڕوو. بەر لە هەر سەرچاوەیەك گەشتەکەی بەرپارۆ گرنگترین سەرچاوەیە بۆ باسەکە و دواتر پشت بە سەرچاوەی پڕ بایەخی ماوەی دەسەڵاتدارێتی ئاق قۆیونلو بەستراوە و بۆ پشتڕاستکردنەوەی بیر و بۆچوونەکانیش سوود لە گەلێ سەرچاوە و ژێدەری دیکە وەرگیراوە.

## تەوەری یەکەم: ژیان و ئەرکی جۆزافا بەرپارۆ:

### أ_ژیانی:

جۆزافا بەرپارۆ لە ساڵی (٨١٦ك/١٤١٣ز) لە ئیتاڵیا لە دایك بووە، هەر لە زووەوە دەستی بە سەفەر بۆ دەرەوەی وڵاتەکەی کردووە، لە سەفەرنامەکەی ئاماژەی بەوە داوە، لەلایەن کۆماری ڤینیسیاوە نێردراوە، لەبەر ئەوە پێدەچێ هەر لە زووەوە لەگەڵ بنەماڵەی دەسەڵاتداری ڤینیسیا پەیوەندیی خۆش بووبێ و یەکێك بووبێ لە پیاوانی دەوڵەتی کۆماری ڤینیسیا، جێگەی سەرنجە لە سەفەرنامەکەیدا باسی لە خاوخێزانی خۆی نەکردووە. لە ساڵی (٨٤٠ك/١٤٣٦ز) لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا لە رێگەی پروس و پۆڵەندا و رووسیاوە بۆ تاتارستان و کەنارەکانی دەریای رەش سەفەری کردووە و شازدە ساڵ لەوێ ماوەتەوە، هەم خەریکی بازرگانی بووە و هەم سەروکاری لەگەڵ هەندێ باڵیۆزان هەبووە و لەوێشدا سەرنجی گرنگی سیاسی و ئابووری و هی دیکەی تۆمارکردووە. جێگەی گوتنە کەنارەکانی دەریای رەش لە سەدەکانی (٩ك/١٥ز) و (١٠ك/١٦ز) مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانیی کۆماری ڤینیسیا بووە و لەوێوە کاڵا و کەلوپەلی بۆ ئەوروپا بردووە، بۆیە ئەو سنوورانەی بەیەکەوە بەستۆتەوە. دواجار بەرپارۆ تا ساڵی (٨٥٦ك/١٤٥٢ز) لەوێ ماوەتەوە و بە هەمان رێگا گەڕاوەتەوە ڤینیسیا. هەروەها ئاماژەی بەوەداوە لە ساڵی (٨٦٠ك/١٤٥٥ز) لە ڤینیسیا بووە، کەچی ئاماژەی بەوە نەکردووە بە چ کارێکەوە خەریك بووە، تا لە ساڵی

(٨٧٦ك/١٤٧١ز) لەلایەن دۆکی ڤینیسیاوە لەگەڵ باڵیۆزی دەوڵەتی ئاق قۆیونلو بۆ ئێران نێردراوە، بەرباڕۆ لە کاتێکی هەستیاردا بۆ ئێران نێردراوە، لەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی کۆماری ڤینیسیای هەراسان کردبوو، ئەویش بە ڕێگەی قوبرس و کەنارەکانی دەریای سپیدا چووەتە میرنشینی قارەمان [٣] و لە ساڵی (٨٧٩ ك/١٤٧٤ز)دا بەکوردستاندا تێپەڕیوە و ڕووداوەکان و سەرنجەکانی تۆمارکردوون، دواجار چووەتە تەوریزی پایتەخت و تا دواڕۆژەکانی دەسەڵاتی ئوزون حەسەن لە دەربارەکەی بووە و شایەدحاڵی ڕووداوەکانی یاخیبوونی ئوغورلو محەمەدی کوڕی بووە کە لە ساڵی (٨٨١ك/١٤٧٧ز) لە شیراز لە باوکی هەڵگەڕایەوە. دوای ئەوەی ئوزون حەسەن لە هێرشەکانی بۆ سەر گورجستان گەڕایەوە، لە ساڵی (٨٨٢ك/١٤٧٨ز) نەخۆش کەوتووە و بەو هۆیەوە لە تەمەنی پەنجاوچوار ساڵیدا گیانی لە دەست داوە، بەرباڕۆ لەبەر ناکۆکیی کوڕەکانی ئوزون حەسەن لەسەر دەسەڵات ئێرانی جێهێشتووە و بە ڕێگەی کوردستان و شام گەڕاوەتەوە قوبرس و دواجار ڤینیسیا، بەرباڕۆ خۆی گوتوویەتی سی و پێنج ساڵی دوور لە وڵاتەکەی بەسەربردووە، شازدە ساڵ لە تاتارستان بووە و شەش ساڵیش لە ئێران، بەڵام ساڵانی دیکەی باس نەکردووە، تا لە ساڵی (٩٠٠ك/١٤٩٤ز) کۆچی دوایی کردووە [٤].

**ب- ئەرکی:**

لە ڕاستیدا سەدەکانی (٩ك/١٥ز) و (١٠ك/١٦ز) کۆمارە بچووکەکەی ڤینیسیا یەکێ لە گەورەترین مەڵبەندی بازرگانیی ئەوروپا بووە، ڤینیسیاییەکان کاڵا و کەلوپەل و پێویستییەکانیان لە ڕۆژهەڵات بۆ باکووری ئەوروپا بردووە و بە پێچەوانەشەوە کەلوپەل و کاڵای باکووری ئەوروپایان بۆ ڕۆژهەڵات و باکووری ئەفریقیا گواستۆتەوە، یەکێ لە ئەنجامە گرنگەکانی پەیوەندی لەو سەدانە لەسەر دەستی کۆماری ڤینیسیا پەرەی پێدرا، بگرە کۆماری ڤینیسیا ، لە پەیوەندییەکانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە سەرەتاکانی ڕینیسانسدا لە پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی ئاق قۆیونلو لە ئێران لە پێشەنگدا بووە. بەرباڕۆ لە ژیانیدا کۆمەڵێ ئەرکی لە ئەستۆ گرتووە، بەو پێیەی سی و پێنج ساڵی لە دەرەوەی وڵاتەکەی بەڕێ کردووە و پەیوەندیی لەگەڵ بنەماڵەی دەسەڵاتداری

ڤینیسیا خۆش بووە، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین ئەرکەکانی بریتین لە کاری سیاسی، لەوکاتەی وەکو باڵیۆز بۆ ئێران نێردراوە، هەروەها ئەرکی سەربازیشی لە ئەستۆ گرتووە، بەتایبەتی لەگەڵ سەرهەنگ و پلەدارانی سەربازیی ڤینیسیا لە هەماهەنگی بووە تا بەهۆی کەشتییەکانی دەریای سپی، چەك و تفاق بۆ ئوزون حەسەن بنێرێ، جگە لەوەی پێشتریش بازرگانێك بووە و سەرنجی سیاسی لەسەر زۆر شوێن خستۆتەڕوو. هەروەها بۆ خۆی کەسێك بووە ئەزموونێکی باشی لە رۆژهەڵات هەبووە، هەستی بە مەترسیی هێرشەکانی دەوڵەتی عوسمانی کردووە لە بەرانبەر کۆمارە بچووکەکەی، لەبەر ئەوە لەو ئەرکەی بۆ ئێران وەکو باڵیۆز پێی سپێردراوە، پیاوێکی بە پشوودرێژ بووە و گرنگی بە ئامانجی دیاریکراوی خۆی داوە، لەگەڵ ئەوەی رووبەڕووی مەترسی و کێشەی زۆر بۆتەوە، پیاوێك بووە لە پشت هەر سەرنجێکییەوە، بیری لە ئامانجی دوورمەودای خۆی کردۆتەوە، لەبارەی سوپای ئاق قۆیونلو لە ماوەی دەسەڵاتدارێتیی ئوزون حەسەن سەرنجی وردی تۆمارکردووە، ئەو ویستوویەتی بزانێ ئەو سوپایەی رووبەڕووی دەوڵەتی عوسمانی بۆوە، لە هەموو روویەکەوە ئایا قەبارەی چەند بووە؟! بەرباڕۆ لە ماوەی ئەرکەکەیدا لە دەرباری ئاق قۆیونلودا، بووەتە جێگەی بایەخی ئوزون حەسەن و توانیویەتی سەرنجی ئەو میرنشینانەی دیکەی ئاسیای بچووکیش لەوانە قارەمان و زولقەدەر[٥] بەلای خۆیدا راکێشێ، هەروەها توانیویەتی پەیوەندیی بەردەوام لەگەڵ ئاق قۆیونلو بپارێزی و لە ئێران زۆر بە تەنگ ئامانجی دوورمەودای بووە [٦].

### تەوەری دووەم: گەشتنامەی جۆزافا بەرباڕۆ و سەرچاوەکانی

#### أ- گەشتنامەکە:

بەرباڕۆ کتێبەکەی خۆی کردۆتە دوو گەشتنامە، هەر لە سەرەتاوە ئاماژەی بەوەداوە خۆی سەر بە کۆماری ڤینیسیایە و دەستی بە نووسینەوەی دوو گەشت کردووە، ژمارەی یەك گەشت بۆ تانا[٧] و ئەوی دیکەیان ژمارە دوو گەشت بۆ ئێرانە، میرێلا گەلێتی توێژەری ئیتالی لە ریزی کتێبە چاپکراوەکاندا باسی کردووە و ئاماژەی بەوە داوە کە سێ جار چاپکراوە[٨].

بەرپارۆ لـە گەشـتنامەی یەکەمـدا، هـەروەك نووسـەران و گەڕیـدەکانی پـێش خۆی ئەوانەی ئـەوروپا لەسـەر رۆژهـەلات نووسـیویانە، ئـەویش گوتوویـەتی، ئـەو شـتانە دەنووسـم کـە جێگـەی بـاوەڕکردن نـین، گەشـتنامەی یەکـەم بـە جـودا و هـــەمووی بەســـەریەکەوە نووسـیوە، واتـا بـەش بـەش جـودای نەکردۆتــەوە و دوووەمیش هەمووی بەسەریەکەوە نووسیوە. لە گەشـتنامەی یەکەمـدا بـە ڕێگـەی پروس و پۆڵەندا و رووسـیا رووی لـە باشـووری دەریـای رەش و ولاتـی تاتارسـتان کردووە، ئەو ناوچەیەش بەتایبـەتی کـەنارەکانی دەریـای رەش جێگـەی بازرگـانی کۆماری ڤینیسیا بووە، لە پاڵ بـەرپارۆ چـەندان بازرگـانی دیکـەی ڤینیسـی لـەوێ بوون و زۆر چالاکیش بوون و لەو بەشەیدا باسی زۆر چـالاکیی خـۆی و هاوڕێکـانی کـردووە، لـەبارەی بـارودۆخی سیاسـیی تاتارسـتان کۆمـەڵێ سـەرنجی سیاسـی و ئابووریی باس کردووە، بەتایبەتی ئەو شـارانەی لەسـەر کـەناری دەریـای رەشـن، تیایدا زیاتر سەرنجی ئابووریی باس کردووە، لەو گەشـتنامەیەدا لەبـەر ئـەوەی لـە کوردســتان دوور بــووە باســی نــەکردووە، شــازدە ســاڵی پێچــووە، لــە ســاڵی (٨٥٦ك/١٤٥٢ز) بە هەمان رێگا گەڕاوەتەوە ڤینیسیا. لە سەرەتای گەشتی دووەم یان بەشی دووەم ئاماژەی بەوە داوە، لێرەوە بەشی دووەمی گەشتی من، جۆزافـا بەرپارۆ بە ناونیشانی باڵیۆز بۆ ئێران دەست پێدەکا، لەبەر ئەوە گەشتی بۆ ئێران بە پلـەی یەکـەم گەشـتێکی سیاسییە و لـە سـاڵی (٨٧٦ك/١٤٧١ز) سـەفەرەکەی دەست پێکـردووە، لـە درێـژەی شـەڕەکانی نێـوان کۆمـاری ڤینیسـیا و دەوڵـەوتی عوسمـانین بـەرپارۆ بـەگوێرەی ئـەو ئەزموونـەی لـەدەرەوەی ڤینیسـیا هـەیبووە، لەلایەن دۆکی ئەو ولاتە وەکو باڵیۆز دەستنیشان کراوە تا لەگـەڵ بـاڵیۆزی ئـوزون حەســەن بچــنەوە ئێــران و هەوڵبــدەن ئــەو بەرنامــەی هــەردوو دەوڵــەت بــۆ رووبەڕووبوونەوەی دەوڵەتی عوسمـانی لەسـەری رێککـەوتبوون، جێبـەجێ بکـەن. بـەرپارۆ هـەر لەوکاتـەی ڤینیسـیای جێهێشـتووە سـەفەرەکەی نووسـیوە، لەگـەڵ کۆمەڵێ سەرهەنگ و سەرباز و باڵیۆزی ئوزون حەسـەن بـە ڕێگـەی دەریـای سـپی چوونەتە قوبرس و بڕێکی زۆر چەك و تفاق و دیاری و پارە و پوولیان بۆ دەوڵـەتی ئێران پـێ بـووە و بـە دوو کەشـتیی گـەورە بەڕێکـەوتوون. گەیشـتنی بـەرپارۆ بـە دەرباری ئوزون حەسەن زۆر ئاسانتر بووە لە گەیشتنی چەك و تفاقـەکان، دواجـار

ئوزون حەسەن بەبێ چەك و تفاقی ڤینیسی شەڕی کرد و هەوڵەکان بۆ گەیشتنی چەك و تفاق لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی پووچەڵ کرانەوە. بەرپارۆ لە چوونی بۆ ئێران لە شاری بیرەجووك[9] وە لە کوردستان دەستی پێکردووە، دواتر هاتۆتە ئورفە و ئینجا ماردین و سێرت و حسن کێفا و وستان و خوی، لەوێشەوە چووەتە تەوریزی پایتەخت، نازانرێ لەو شارانە چەند ماوەتەوە، چونکە ئاماژەی پێنەداوە، لەگەڵ ئەوەش ئامانجی سەرەکیی چوونە دەرباری ئوزون حەسەن بووە، ئەگەر ئەو ئەرکەش لەو سەردەمەدا بۆ هەر کوردێك ئاشکرا بێ جێگەی مەترسییە، چونکە سەرانی ئاق قۆیونلو لە چارەکی کۆتایی سەدەی (٩ك/١٥ز) زۆربەی زۆری میرنشینە کوردییەکانیان لەناوبرد و خێڵە کوردییەکانیان لە زێدی خۆیان هەڵکەنی[10]، بەرپارۆ هەرچەندێك مابێتەوە سەرنجی خۆی نووسیوە و بە گوێرەی سەرنجەکانیشی پێناچێت هێندە مابێتەوە، لە راستیدا ئەو سەرنجانە بایەخی زۆریان بۆ ئەمڕۆ هەیە، سەرنجەکانیش دەریانخستووە کە بەرپارۆ کەسێکی وردبین بووە، لە دەرباری ئوزون حەسەن ئەوەندەی ماوەتەوە هەموو شتێکی تۆمارکردووە و بە وردیش لە بارودۆخی بەتایبەتی ئابووریی هەندێ شاری ئێران دواوە، بە قووڵیش چووەتە مەسەلەی یاخیبوونی ئوغورلو محەمەدی کوڕی ئوزون حەسەن و خۆشی یەکێکە لەوانەی رووداوەکانی بەچاوی خۆی دیوە، تا دواجار لە سەرەمەرگی ئوزون حەسەن لە ساڵی (٨٨٢ك/١٤٧٧ز) لە رێگەی تەوریز و خوی و بایبۆرت و ئەرزنجان و خەلاّت و مەلاتیە و شام لەسەر زەمینی دەوڵەتی مەمالیك لە رێگەی دەریاوە چووەتە قوبرس و لەوێش بۆ وڵاتی خۆی گەڕاوەتەوە. بەرپارۆ دوای گەڕانەوەی هەردوو سەفەری خۆی نووسیوە، پێدەچێ لە ساڵی (٨٩٣ك/١٤٨٧ز) گەشتەکانی لە دووتوێی کتێبێکدا نووسیبێتەوە، هەرچەندە لە کۆتایی کتێبەکەدا نامەیەکی ئەوی تێدایە رێکەوتی ساڵی (٨٩٦-٨٩٧ك/١٤٩١ز)ی لەژێر نووسراوە و وەکو پاشکۆ ئاماژەی پێدراوە[11].

### ب- سەرچاوەکانی:

زۆربەی رووداو و زانیاریی نێو سەفەرنامەکەی بەرپارۆ بۆ سەردەمی ئەمڕۆ نوێن، لە سەفەری ئێراندا خۆی بەشێکی گرنگ بووە لە رووداوەکان، لەبەر ئەوە

به شایەدحاڵێکی جەربەزەی سەردەمی کۆتاییـەکانی دەسـەڵاتی ئـوزون حەسـەن دەژمێردرێـت و لـەنێو زانیارییەکانـدا کەسـایەتیی بـەهێزی بـەرپارۆ دەرکـەوتووە، چـونکە بـە گیـانێکی بابەتییانــە ســەرنجەکانی تۆمــارکردوون، سەرچــاوەکانی سەفەرنامەکەی بریتین لە:

**١-بینین:**

یـەکێ لـە گـرنگترین سەرچـاوەکانی سـەفەرنامەی بـەرپارۆ ئەوەیـە هەرچـی دیویەتی تۆماری کردووە، نووسەر بۆخۆی ئەڵقەیەك بووە لە ئەڵقەکانی پەیوەندیی سیاسی نێوان میرنشینیی قارەمان و زولقەدەر و دەوڵـەتی ئـاق قۆیونلـو، بـە واتـا ئەوانەی دژی دەوڵەتی عوسمانین. بە پێچەوانەی هەندێ گەڕیدەی دیکـە، بـەرپارۆ زیاتر باسی ئـەو ماوەیـەی کـردووە، کـە خـۆی تیایـدا ژیـاوە و زانیـاریی لـەبارەی سیاسەتی ناوچەکەش باس کردووە، ئەمەش وایکـردووە بیـنین نزیکـەی لـە سـەدا هەشـــتای ســـەفەرنامەکەی داگیرکـــردووە، هـــەر لـــە ســـەرەتای نووســـینەوەی سەفەرەکەی گوتوویـەتی: "لێـرەوە باسـی ئـەوە دەسـتپێدەکا، هەرچـی دیومـە و بیستوومە، من جۆزافا بەرپارۆی سەر بە دەوڵەتی ڤینیسیا لە دوو گەشتدا یـەکیان بۆ تانا و ئەوی دیکەیان بۆ ئێران دەگێڕمەوە"[١٢].

پڕ بایەخترین مەسەلە کە بەرپارۆ بە چاوی خۆی دیویەتی و تۆماری کردووە، بریتییە لە هەژمارکردنی سوپای ئـوزون حەسـەن لـە سـاڵی (٨٨١ك/١٤٧٠ز)، ئـەم کـارەش لێکۆڵـەر و توێـژەرانی ئـەو سـەردەمەی سەرسـام کـردووە، بـۆ خـۆی لـە دەرباری ئوزون حەسەن بووە، کە هەواڵ هاتووە ئوغورلو محەمەدی کوڕی ئـوزون حەسەن لە شـیراز یـاخی بـووە و دەیـەوێ دەسـەڵات لـە بـاوکی وەرگـرێ، هـەموو سوپای ئاق قۆیونلو رووی لە شیراز کردووە، سوپای ئوزون حەسەن بە بەرچـاویدا تێپەڕیوە، ئەویش بۆ هەر پەنجا کـەس یـا کەرەسـتە، یـەك دانـە لۆبیـای حیسـاب کردووە، بەم جۆرەی بە وردی حیسابی سوپای ئاق قۆیونلوی کردووە، هەرچەندە ئەم کارەش بەرپارۆی ماندوو کردووە، بەڵام لێهاتوویی و باڵادەسـتی نیشـان داوە، تا بزانێ سوپای ئاق قۆیونلو چ توانایەکی هەیە و چەندن، دانە دانە سوار و پیـادە و چـادر و ئەسـپ و وشـتر و هەرچـی هەیـە ژماردوویـەتی، کـە تاڕادەیـەکی زۆر ژماردنەکـەی لـە راسـتییەوە نزیکـە، هـەتا بـە رۆیشـتنی زۆر خێـرای سـوپای ئـاق

قۆیونلو بۆ شیراز سەرسام بووە، دواجار لە ئەنجامی ئەمە بە چاوی خۆی دیویەتی خۆشـقەدەم ناوێك کـە لـە دەربـار بـووە، هـەموو نامـەکانی ئۆغورلـو محەمـەدی لەبارەی گرتنی شیراز لە ئوزون حەسەن شاردۆتەوە، لە سزای ئەو کارەیدا وەکو ئاژەڵ بە قنارەیان وەکردووە[١٣].

**٢- سەرچاوەی زارەکی و بیستن:**

**هەنـدێ** رووداو هــەن بـەرپارۆ لـە زاری خەڵکییــەوە بیسـتوویەتی و تۆمـاری کردوون، لەگەڵ ئەوەی لەبارەی رووداوەکانی یاخیبوونی ئوغورلو محەمەد، ئەوەی لە دەربار رووبیداوە بە چاوی خۆی دیویەتی، کەچـی ئـەوەی لـە شـیراز رووی داوە بیستوویەتی، هەندێ رووداو هەن بەر لـە سـەردەمی ئـوزون حەسـەن روویانـداوە، بەتایبـــەتی ئەوانـــەی ســـەردەمی جیهانشــــا (٨٤١-٨٧٢ك/١٤٣٧-١٤٦٧)ی قــەرەقۆیونلو، ئــەویش لــە زاری خەڵکیـــەوە بیســتوویەتی و تۆمــاری کــردوون، بەتایبەتی لەو کاتەی جیهانشا لە بەرانبەر یاخیبوونی خەڵکی ئەسفەهان، بڕیـاری دا شارەکە تـاڵان بکـا، هـەروەها دوای مـەرگی ئـوزون حەسـەن رووداوی کوشـتنی مەقسودی کـوڕی ئـوزون حەسـەن ئـەو کـوڕەی لـە ژنـە مەسـیحییەکەیە، لەلایـەن زڕبراکانی لە رێگەی بیستنەوە تۆمارکردووە[١٤].

**تـەوەری سـێیەم: مێـژووی سیاسـیی بـاکووری کوردسـتان لـە مـاوەی دەسەڵاتدارێتی ئوزون حەسەندا :**

بەرپارۆ لە ساڵی (٨٧٦ك/١٤٧١ز) دەستی بە گەشتەکەی کردووە و دواتر بـە کوردستاندا تێپەڕیوە، بە واتـا لـە سـەرەتای گەشـتی بـۆ ئێـران هـەر ئـەو سـاڵەی بەدەستپێکی گەشتەکەی داناوە، ئەگـەر سـەرنج لـە سەرچـاوەکانی نووسـینەوەی مێژووی دەوڵەتی ئاق قۆیونلو بدەین، بە تایبەتی ئەو سەرچاوەیەی هاوسـەردەمی ئوزون حەسەن بووە و بە وردی باسی لە رووداوەکان کردووە، بریتییـە لـە کتێبـی دیاربەکرییـــەی ئەبوبـــەکر تـــارانی (مـــردووە پـــاش ٨٨٦ك/ ١٤٨٢ز)ی مێـــژووی دەربارەی ئاق قۆیونلو، تارانی باسـی لـە عوسمـان قـەرەیۆلوکی بـاپیری و ئـوزون حەسەن کردووە لەو کاتەی لە دیاربەکر قەوارەیەکی سیاسی بوون تـاکو توانییـان تەورێزی پایتەخت وەربگـرن و دەوڵـەتی قـەرەقۆیونلو لـە سـاڵی (٨٧٢ك/١٤٦٧ز)

برووخێنن و تا ساڵی (٨٧٦ك/١٤٧١ز)ی باس کردووه و لەوێدا کتێبەکە کۆتایی دێ[١٥]. هەرچی سەرچاوەی دووەمە بریتییە لە کتێبی (تاریخی عالەم ئارای ئەمینی) فەزلوڵلا روزبەهان خونجی (مردووه ٩٢٧ك/١٥٢٠ز)، ئەویش پاش مردنی ئوزون حەسەن و دەسەڵات وەرگرتن لەلایەن خەلیلی کوڕی دەستی پێکردووه، بەواتا لە ساڵی (٨٨٢ك/١٤٧٧ز) تا بە مردنی سوڵتان یەعقوب کوڕی ئوزون حەسەن لە ساڵی(٨٩٦ك/١٤٩٠ز) کتێبەکە کۆتایی دێ[١٦] تا ئێستا لەو دوو سەرچاوه گرنگتر نادۆزیتەوه، کە لە دەرباری سوڵتانەکانی ئاق قۆیونلو نووسرابن و بە وردی باسیان لە مێژووی ئاق قۆیونلو کردبێ، ، لێرەوه لە رووی ماوەوه لە ساڵی (٨٧٦ك/١٤٧١ز) تاکو (٨٨٢ك/ ١٤٧٧ز) نزیکەی شەش ساڵ بە وردی نەنووسراوەتەوه، بۆیە لەو لایەنەی لە جەنگی کۆماری ڤینیسیا و دەوڵەتی عوسمانی تا مردنی ئوزون حەسەن، بەرباڕۆ بە وردی تارادەیەك وەکو مێژوونووسێك، رووداوه سیاسییەکانی دەوڵەتی ئاق قۆیونلوی لە نێوان ئەو شەش ساڵەدا تۆمارکردووه و بۆ خۆشی لەو ماوەیەدا لە دەرباری ئاق قۆیونلو بووه، دەتوانین بڵێین رووداوه گرنگەکانی نێوان ئەو ماوەیەی بە گیانێکی بابەتییانە تۆمارکردووه، بە شێوەیەکی گشتی رووداوه گرنگەکانیش ئەوانەی پەیوەندیی بە کوردستان و ئێرانەوه هەیە بریتین لەمانە:

**١- جموجۆڵی سیاسیی قەوارەی کوردی لە باکووری کوردستان:**

لەو ماوەیەی بەرباڕۆ بە کوردستاندا تێپەڕیوه ئەو سەرنجەمان پێدەدا، دوای ئەوەی ئوزون حەسەن هەڵمەتێکی گەورەی بۆ لەناوبردنی میرنشینە کوردییەکان دەست پێکرد و لە زۆربەی زۆریاندا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، کەچی سەدان قەڵا و دژی کوردی ماون و لە ناوچەکەدا چالاکن، بەڵام میر و سەرکردە گەورەکانیان لەوێ نین، میرو سەرکردەکانیش یا ئەوەتا کوژراون یا ئەوەتا دوورخراونەتەوه، بەرباڕۆ بەشێوەیەکی گشتی لەو قەوارانە دواوه و ناوی میر و سەرکردەی کوردی نەهێناوه[١٧].

سەرنجە سیاسییەکانی بەرباڕۆ لەبارەی کوردستانی باکوور وایکردووه سەرنجی دیکە تۆماربکا، لەبەر ئەوه ئەوانە باس دەکەین، کە لای لێ نەکراوەتەوه بۆ خۆی وەك کەسێکی رۆژئاوایی لە کاتێکدا بە کوردستاندا تێپەڕیوه، لە زەینیدا

سـنووری ناوچـەکەی بـۆ ئەرمەنسـتانی گـەورە و ئەرمەنسـتانی بچـووك دابـەش کردووە، لە راستیدا ئەمەش جێگەی سەرسامی نییە، چونکە بەشێکە لە کولتووری جیهانی مەسیحی، کە لـە سـەردەمێکدا ئەرمەنسـتان تـا ئـەو سـنوورانە هـاتووە و بەرپارۆ بەو سنوور– بازنە–یەدا شار و قەڵاکانی کوردستانی تێدا دانـاوە، سـەرەتا کە لە سنووری میرنشینی قارەمان دێتە کوردستان یەکەم جار باسی شاری سلوچا (سـلوتیا)ی کـردووە، کـە دەکەوێتـە ئەرمەنسـتانی بچـووك و لەسـەر رووی تەپۆڵکەیەکی گەورە هەڵکەوتووە و بەژێریدا رووبارێ تێدەپەڕێ و شـارەکە دیـارە کە تاقی بەرز و بڵندی تێدا بووە و چەند دەروازەیەك بەدیار کەوتووە کە لە ئاسـن دروست کراون و لێرە دار بەکار نەهاتووە و پاسەوانی زۆری لێ بووە و بە شـێوەی بازنەیی هەڵکەوتووە و قەڵاکەش لەوێدایە و بـە دیـواری پـڕ لـە بـورج دەورە دراوە ئەم شارە تا کێوەکانی تۆرۆس درێژە دەکێشـێ و بەکوردسـتان دەناسـرێ، دواتـر باسـی شـاری تەرسـوس[18]ی کـردووە کـە –ئـەوکات– مـیری زولقـەدەر بـەڕێوەی بـردووە و لـەژێر دەسـەڵاتی سـوڵتانی میسـر–مـەمالیك– دایـە و کەوتۆتـە ئەرمەنسـتانی گـەورە و شـاری ئەدەنـە[19]ش بـە هـەمان شـێوە لـەژێر دەسـەڵاتی سوڵتانی میسر دایـە و کەوتۆتـە سـنووری ئەرمەنسـتانی بچـووك، هـەروەها باسـی شاری ئورفەی کـردووە، کـە دەوروبـەری چـەندان گونـدی ئەرمەنیشـینی لێیـە و قەڵایەکی هەیە کەوتۆتە سەر تەپۆڵکەیەکەوە و زۆر پتەو نییە و شارەکانی ماردین و کێفا و سێرت دەکەونـە ئـەو سـنوورە تـا ئـەوەی گوتوویـەتی ئـەو شـوێنەیە کـە تیایدا ئەرمەنستانی بچووك تا ئێرە درێژە دەکێشێ، هەروا لە باسی رێگای تـەورێز بۆ ترابزون باسی لەوە کردووە دوای بایبۆرت و ئەرزنجان و خەرپوت و پالو دەچیە خاکی تورکمانیە، کە تا ئێرە پێی دەڵێن، ئەرمەنستان[20].

بەرپارۆ لە باسی حاکم و سەرداری شار و قەڵا کوردییەکان سەرنجی گشـتی و وردیشی بۆ راڤە کردووین، لێرەوە ئەو سەرنجە دەخوێنینەوە، کـە هەنـدێ شـار و قەڵای کـوردی راسـتەوخۆ لەلایـەن سـەرانی ئـاق قۆیونلـو بـەڕێوەبراون و نووسـەر باسی کردوون، هەندێکیشیان لەبەر ئەوەی رۆڵـی سیاسـییان کـەم بۆتـەوە، نـاوی حـاکم و سـەردارەکەی نـەهێناوە، بـەڵام ئامـاژەی بـەوە داوە لـەژێر سـنوور و دەسەڵاتی ئوزون حەسەندان، ئەمەش جەخت لەوە دەکاتـەوە تـا ئەوکاتـە ئـوزون

حەسەن له داپلۆسینی میرنشینه کوردییەکان بەردەوام بووه و چاودێریی وردی جموجۆڵی سیاسییان کراوه، له باسی شاری ئورفەدا لەوه دواوه وەلی بەگ برای ئوزون حەسەن لەوێ حاکمە و کاتی خۆی شارەکه زۆر گەورە بووه، هەروەها شاری بیرەجووکیش لەبەر ململانێی ئوزون حەسەن و دەوڵەتی میسر–مەمالیك–بەشێکی زۆر وێران بووه و شاری ماردینیش لەژێر دەسەلاتی ئاق قۆیونلودایە و ماوەیەك بەر له ئێستا جیهانگیری برای ئوزون حەسەن لەوێ حاکم بووه و شار و قەلاّی کێفاش که یەکێك بوو له ناوەندی سیاسیی گرنگی کوردستان لە سەدەی (٩ك/١٥ز) تەنیا ئاماژەی بەوە داوه لەژێر دەسەلاتی ئوزون حەسەندایە، گومان لەوەدا نییە ئەیوبەکر تارانی زۆر بە وردی لە بنەماڵەی ئەیووبی لە سەدەی (٩ك/١٥ز) دواوه تا بەدەستی سەرانی ئاق قۆیونلو بۆ ماوەیەکی کاتی میرنشینەکەیان رووخاوه[٢١].

له باسی شار و قەلاّی سێرتیش باسی له هیچ ئاماژەیەکی سیاسی نەکردووه، تەنیا ئاماژەی بە رێگای بەدلیس داوه، ئاماژەی بە شاری وستانیش داوه کە بەشێکی زۆری وێران بووه، ئەوه دەردەکەوێ بەرپارۆ باکگراوەندی سیاسی لەبارەی میرنشینه کوردییەکان نەبووه و ئەو کاتیش لە رووی سیاسییەوە کپ کرابوون و له چالاکیی راستەوخۆ کەوتبوون، بۆیە بەهیچ جۆرێ باسی ململانێی سیاسی نێوان میرنشینه کوردییەکان و ئاق قۆیونلوی نەکردووه، لە باسی بایبۆرتیش گوتوویەتی لەژێر دەسەلاتی ئاق قۆیونلودایە و قەلاّیەکی سەختی هەیە، هەرچی ئەرزنجانە بەشێکی زۆری وێران بووه و شاری خەرپوتیش کچی ئیمپراتۆری ترابوزان، هاوسەرە مەسیحییەکەی ئوزون حەسەن لەوێ دادەنیشێ[٢٢].

له راستیدا بەرپارۆ له رێرەوی چوونی بۆ تەورێز بە کوردستاندا بە گرنگترین و دەسەلاتدارترین دەڤەر و ناوچەی میرنشینی کوردیدا تێپەریوه، لەوانە میرنشینی حسن کێفا و هەکاری و بەدلیس و میرنشینەکانی دەوروبەری دەریاچەی وان و له چوونیدا ئورفە و ماردین و وستان و شاری دیکەی دیوه، ئاماژەی بە سەدان قەلاّی کوردی داوه و بەو جۆرە باسی کردووه، ئینجا چووەتە دەرباری ئوزون حەسەن له گەرانەوەشیدا بە هەمان شێوه چەندین قەلا و دژی کوردی دیوه

و بە ژمارەی زۆر باسی کردوون، هەروەها چووەتە ئەرزنجان و بایبۆرت و پالو و خەرپوت و موش و **خەلات** و ئەرگیش. جێگەی گوتنە لە کۆتاییەکانی سەدەی (٩ك/١٥ز) ئەم شار و قەلایانە مەڵبەندی جموجۆڵی سیاسیی کورد بوون، نووسەر بە روونی ئاماژەی بەوە کردووە بەم ناوچانەیان گوتووە کوردستان و زمانەکەشیان کوردییە و جۆرە زمانێکی تایبەت بەخۆیان هەیە کە جیاوازە لەگەڵ زمانی دەوروپشتیان، میرێللا گەلێتی لەو بارەوە نووسیویەتی: "بەرپارۆ یەکەم کەس بووە، کە هەستی بە جیاوازیی زمانی کوردی لەگەڵ زمانی میللەتەکانی دراوسێ کردووە"[٢٣]، هەروەها لە بارەی زۆریی قەلا سەختەکانی کوردستان دواوە گوتوویەتی: کە گەیشتنە سەر ئەو شاخانە–زاگرۆس– کە زۆر بەرز و سەختن، دانیشتووانەکەی جۆرە میللەتێکن بەناوی کورد، کوردەکان گەلێ شاریان لە نزیك رووبار و جێگەی بەرز دروستکردووە تا بتوانن هەموو دەروازەکان ببینن. ئەوەی جێگەی سەرنجە بەرپارۆ لە پێشەنگی ئەو کەسانەیە کوردی وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ باس کردووە، پاش ئەوەی لەگەڵ بالیۆزی ئوزون حەسەن دەڤەری (بەدلیس)یان جێهێشتووە و نیوە رۆژێك رۆیشتوون لە رێگادا لە نێو شاخ و تەپۆلکە بەرزەکاندا کورد رێگەیان لێ گرتوون و بەسەریاندا داون، لە ئەنجامدا بالیۆزی ئوزون حەسەن و دوو هاوکاری بەرپارۆیان کوشتوون و بۆخۆشی بە زەحمەت دەرباز بووە و هەلاتووە تا سێ رۆژ گەیشتۆتە شاری وستان، جا لەو شوێنەی بەرپارۆ رێگەی لێگیراوە، بەر لە پێنج سال سەرداران و سەربازانی ئاق قۆیونلو کوردیان قەتل و عام کرد و میرنشینە گەورەکانی کوردیان لەناوبردووە[٢٤].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ مەبەستی زمانی سەربەخۆ و پاك لە دەوروبەرەکەی مەبەست لە سەربەخۆیی سیاسیی میرنشینە کوردییەکانە لە قەڵەمڕەوی خۆیاندا، بوونی قەلاو دژی زۆر لە ناوچەکەدا و دەسەلاتیان بەسەر دەروازەکاندا، مانای دەسەلاتی کوردان دەگەیەنێ، کە تاڕادەیەکیش ئاق قۆیونلو تیایدا بێ دەسەلاتە، ئەمانەش جموجۆڵی سیاسیی کورد لە سەردەمی کەسێکی داپلۆسێنەری وەکو ئوزون حەسەن نیشان دەدەن.

هەرچی لەبارەی هاوکارییەکانی کۆماری ڤینیسیا بۆ ئوزون حەسەن لە جەنگ دژی دەوڵەتی عوسمانی و کاریگەریی بەسەر باکووری کوردستاندایە، گومان لەوە نییە ئەوە مەبەستی سەرەکیی بەرپارۆ بووە، ئوزون حەسەن پاش ئەوەی بەشێکی زۆری میرنشینە کوردییەکانی لە باکووری کوردستانی رووخاند، سنووری رۆژئاوای وڵاتەکەی بووە گۆرەپانێکی ئاسان تا رووبەرووی دەوڵەتی عوسمانی بێتەوە، بەڵام نەیتوانی بگاتە کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست تا هاوکارییەکانی پێ بگات، بەڵام کوردستان بووە شوێنی ململانێی دەوڵەتی ئاق قۆیونلو و دەوڵەتی عوسمانی، ڤینیسییەکانیش هەموو هەوڵیان بۆ هاوکاریی ئوزون حەسەن بەکارهێنا تا مەترسییەکانی سوڵتانی عوسمانی لە خۆیان دوور بخەنەوە، ئەگەر لەو ململانێیە میرنشینە کوردییەکان بە تایبەتی بەدلیس و هەکاری و حسن کێفا لە جموجۆڵی سیاسیدا بوایەن، کاریگەریی ئەو جەنگ و ململانێیەی ئەو دوو زلهێزە بەو جۆرە نەدەبوو، چونکە ئوزون حەسەن شوێنەواری سیاسی و دۆڕاندنی لە جەنگەکە بێ هێزی نەکرد، تەنیا مەترسی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی نەما و هیچ زەوییەکی لە کوردستان نەدۆڕاند[٢٥].

**ب- یاخیبوونی ئوغورلو محەمەدی کوڕی ئوزون حەسەن:**

بەرپارۆ لەو کاتەی لە دەربار بووە هەواڵی یاخیبوونی ئوغورلو محەمەدی بیستووە تۆماری کردووە، کە گوایە ئوزون حەسەنی باوکی مردووە، ئەویش لە ساڵی (٨٨٢ك/١٤٧٧ز) یەکسەر شاری شیرازی گرتووە ، لە رێگەی گرتنی شیرازەوە دەتوانێ تەواوی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئاق قۆیونلو بەدەست بێنێ، جێگەی سەرنجە بەرپارۆ تەنیا رووداوەکانی نووسیوەتەوە و بەوردی لە بارودۆخی شیراز و ناو دەربار دواوە. لەو رووداوە ئەوەی بەلایەوە گرنگ بووە زانیاریی تەواو لە بارەی سوپای ئوزون حەسەنەوە بووە، ئەمەش بۆی دەرخستووین کە ئەو زانیارییانەی بۆ ئەوە بووە ئەو سوپایە تا چەند دەتوانێ رووبەرووی دەوڵەتی عوسمانی ببێتەوە. هەروەها لە ئەنجامی ئەو یاخیبوونەش دواوە کە دواجار ئوغورلو محەمەد وڵاتی جێهێشتووە و هەوڵی داوە باوکی لێی خۆش بێ. لە راستیدا ئەو یاخیبوونە کاریگەری بەسەر روانینی بەرپارۆ و باڵیۆزانی هاوڕێی

هەبووە، چونکە هەڵۆیستی ئوزون حەسەنی لاواز کردووە، کەچی سەرنجی هاوڕێی دیکەی جودایە و ئاماژەیان بەوە داوە لەبەر ئەوەی دایکی کورد بووە و ئوزون حەسەنیش دژی کوردان بووە، بۆیە کورد ئوغورلو محەمەدی هان داوە تا دژی باوکی بجەنگی و دەسەلات وەرگرێ، بەلام دەسەلات وەرگرتن لە ناو خێڵێکی تورکماندا زیاتر بۆ کەسێ بووە، کە باوك و دایکی تورکمان بێ. هەر بۆیە پاش مردنی ئوزون حەسەن خەلیلی کوڕی دەسەلاتی وەرگرت[٢٦].

## تەوەری چوارەم: ئابووری و کۆمەڵگای هەندێ شار و کەسایەتیی کورد:

### أ- ئابووری:

بەرپارۆ کۆمەڵێ سەرنجی ئابووریی لەبارەی ئەو شارانەی پێیاندا تێپەڕیوە باس کردووە، سەرنجەکانیشی بابەتی بازرگانی و کشتوکاڵ و دانیشتووانی لەخۆ گرتووە، کەچی لە دەرەوەی کوردستان بەتایبەتی شارەکانی دیکەی ئێران بەهەمان شێوە سەرنجی خۆی دەربڕیوە.

لە باسی شاری ئورفە و بیرەجووکدا، لەوە دواوە لەبەر ئەوەی بووەتە جێگەی ململانێی ئاق قۆیونلو و مەمالیك لەبەر ئەوە خەڵکەکەی لە ترس و هەراسانیدان، بۆیە چالاکیی بازرگانی سستە، بەلام لە شاری ماردینیش بەشێوەیەکی فراوان خەڵکەکەی کووتاڵ، بەتایبەتی ئاوریشم بەرهەم دێنن و خەریکی دروستکردنی ریس و چنینن. لە شاری حسن کێفاش بازرگانێکی زۆری لێ کۆبووەتەوە و خەریکی کڕین و فرۆشتنی کووتاڵن. لەبەر ئەوە لەوێ هەم قوماش بەرهەم هێنراوە و هەم کووتاڵ بازرگانیشی پێوەکراوە. لەگەڵ ئەوەی جموجۆڵی سیاسی کورد بەشێوەیەکی نهێنی بووە، کەچی بازرگانی لەبرەودا بووە، لە دەرەوەی شار و قەلاکەش خەڵکەکەی بە کشتوکاڵەوە خەریك بوون، بەتایبەتی لە گوندەکانی دەوروبەریدا. لە دەوروبەری شاری سێرتیش چەندەها گوند بەرچاو دەکەون، خەڵکەکەی خەریکی کشتوکاڵ و دانەوێڵە و میوە و بەخێوکردنی مەڕ و مالات و رەشەولاخن، سەرباری ئەوەی قوماش بەرهەم دێنن و لە مووی بزن جلوبەرگی پتەویان دروستکردووە، لە باسی شاری خویدا ئاماژەی بەوە کردووە خەڵکەکەی بەکاری دەستی و کشتوکاڵەوە خەریکن[٢٧].

لــە شــارەکانی دەوروبــەری گــۆلی وانــیش بــە هــەمان شــێوە خــەریکی بەرهــەمهێنانی ئاوریشــمن و ڕێگــای تــەورێز–ترابــزۆن بــۆ بازرگــانی بــەکاردێنن، هەروەها لە دەوروبەری قەڵای پالو میوە بە شێوەیەکی فراوان و چاك بەرهەم هێنراوە[٢٨].

بــەرپارۆ هــەروەها باســی دانیشتووانیشــی کــردووە، لــەنێو قــەڵا و شــارە کوردییــەکان چــوویێتە هــەر شــوێنێ تــەنیا ئامــاژەی بــە دانیشــتووانی مەســیحی کــردووە، هەرچــەندە بــەر لــەوەش ئامــاژەی داوە کــە کــوردی لــێ هــەن، لــەبارەی دانیشتووانی شاری ئورفە گوتوویەتی دەوروبەری شارەکە ئەرمەنین، لە ماردینیش گوتوویەتی خەڵکێکی زۆر لێی نیشتەجێن و شارێکی قەرەباڵغە، لەبارەی حسن کێفاشەوە لەو دیاردە سەیرە دواوە کە کۆمەڵێ ماڵ لە پاڵ یەکەوە لە شاخ هەڵکەنراون و بۆ خۆیان شێوەیان وەکو ئەشکەوت بەدوای یەکەوە وایە، هەموویان لە شێوەی خانوون، ئەشکەوتەکان زۆرن هەر دەڵێی گەرەکێکە تا لە کۆتاییەکەی هەندێ ئەشکەوتی بچووك بەرچاو دەکەوێ، لەوێش قەلەرەش ژیاون، شارەکەش خانووی زۆر جوانی تێدا دروست کراوە، لە سێرتیش بە هەمان شێوە گوتوویەتی: "خانووەکانی زۆر جوانن و دانیشتووانی زۆرن و پڕە لە کانیاو"، لە شاری وستانیش گوتوویەتی:" شارەکە وێرانەیە و لە سێ سەد ماڵ زیاتری تێدا نییە، شاری خویش چوار سەد ماڵی تێدایە"، لە باسی شاری بایبۆرتیش لەوە دواوە قەڵایەکی یەکجار سەختی هەیە و ئەرزنجانیش بەشێکی زۆری وێران بووە و دانیشتووانەکەی زۆربەی یۆنانین (ئەرسەدۆکس)ن و قەڵای پالوش سێ سەد ماڵە و شاری موش پڕە لە خەڵك و لە چگریش کە لە تەنیشت موشە ئەرمەنی زۆرن[٢٩].

بەرپارۆ باسی لە ماوەی نێوان شارەکان کردووە و تا توانیویەتی وەسفیشی کردوون، لەبارەی شاری بیرەجووك گوتوویەتی لەسەر تەپۆلکەیەك دروست کراوە، بەڵام هێندە سەخت نییە، هەرچی شاری ماردینە لەسەر کێوێك هەڵکەوتووە، پلە بە پلە دەبێ بۆی سەرکەوی و یەك میل درێژە، لەناو شارەکە کێوێك هەیە، قەڵایەکی لەسەر دروست کراوە، شێوەکەی بازنەیی و پەنجا پێ درێژە، شاری حسن کێفاش لەسەر دوو کێو دروست کراوە زۆر بڵندن، حەوشەی شارەکە یەك میل و نیوە، پردێکی لێ دروست کراوە[٣٠] شاری سێرتیش بەشێوەیەکی

سێگۆشەیی دروستکراوە، قەڵایەکی تێدایە و پڕە لە بورجی بەرز، زۆر سەخت و عاسێیە[٣١].

قەڵای بایبۆرتیش بە کۆمەڵێ تەپۆڵکە دەور دراوە، جێگەی سەخت و قایمە شارەکە لەژێر قەڵاکەدا دروست کراوە، پێنج هەزار ماڵی تێدایە، لەوێوە بە پێنج رۆژە رێ دەگەیە ئەرزنجان شارێکی گەورەیە و بەشێکی زۆری وێران بووە، دواتر خەرپوت جێدەهێڵی زۆر شار و قەڵای دیکە بەرچاو کەوتوون، پالوش لەسەر بەردێکی گەورەی کێوێك هەڵکەوتووە و لەژێرەوەی شارەکە بەرچاو کەوتووە، قەڵای موشیش لەسەر تەپۆڵکەیەکە و شارەکەش لەنێو کێواندایە کە درێژییەکەی سێ میلە و پڕە لە خەڵك پاش سێ قۆناغ دەگەیە قەڵای سەخت و عاسێی **خەلات** کە لە کەناری دەریاچەی وان دایە و شاری سیواسیش شوێنێکی خۆشە و سەختگیرە[٣٢].

**ب- کۆمەڵگای هەندێ شار و کەسایەتیی کوردی:**

گرنگترین دیاردە سەرنجی بەرپارۆی راکێشابێ و لەسەری دوابێ مەسەلەی تەسەوف لە کوردستاندا و گرنگی پێدانی لەلایەن دەسەلاتدارانی ئاق قۆیونلووەوە، لەو بارەوە هەندێ سەرنجی نووسیوە، پێی وابووە تەسەوف بابەتێکی ناوازەیە و لە کۆمەڵگای مەسیحی لە رۆژئاوا بەو جۆرە بوونی نییە، لە ئەدەنە هاورێ لەگەڵ کۆمەڵێ سۆفی رۆیشتووە، ئەوان خەریکی زیکر-سەما- بوون و هێواش هێواش دەستیان پێکردووە تا گەرم بوون، ئەمەش وایکردووە خەڵکێکی زۆر لە دەوروبەریان کۆببنەوە و بە سەرسامییەوە لێیان بڕوانن، دواجار هەندێ خەڵك لەوانەی لەوێ بوون بۆماڵەوەیان بردوون، سۆفییەکان ناو بە ناو بگەنە هەر کوێ حاڵ دەگرن، لە ماردینیش سۆفی-قەلەندەر-ێکی دیوە، بە جلوبەرگی سۆفییانەوە، کە پێکهاتووە لە پارچە قوماشێکی سووف، لە مووی بزن، بەرپارۆ پێی گوتووە: " من بێگانەم ئەویش گوتوویەتی: ئێمە لەم جیهانە هەموومان غەریبین من دەستم لە جیهان بەرداوە تا ئاخری عومرم بەم شێوەیە دەمبینی کە هەم"[٣٣].

هەروەك ئەبوبەکر تـارانی لـە بابـەتی تەسـەوف باسـی بابـا عەبـدولڕەحمانی مەجزووبی کردووه، بەرباڕۆش ئاماژەی پێداوه، ئەمـەش دەیسـەلمێنێ مەسـەلەی بابا عەبدولڕەحمان هەر تەنیا لە زەیـن و بـیر و نووسـینەوەی مێژوونووسـانی ئـاق قۆیونلو نییه، بەڵکو لەنێو دەربار و سەرانی ئاق قۆیونلـو بـە تـەواوی بڵاوبۆتـەوه، بـەر لـەوەی ئـوزون بەسـەر جیهانشـای سـوڵتان قـەرەقۆیونلو سـەرکەوێ، بابـا عەبـدولڕەحمان لـە سـێ جـاردا ئامـاژەی بـە سـەرکەوتنی ئـوزون حەسـەن داوه و پێشبینی کردووه، دوژمنەکانی دەشکێنێ و ئێران و توران دەبێتە هی ئەو[٣٤] .

بەرباڕۆ باسی لەوە کردووه یەکێ لەو دەروێشانەی دیوه، کە لەگـەڵ سـوڵتان لە دەربار بووه، ئەو کاتەی ئوزون حەسەن تەنیا دیاربەکری لە دەست بـووه، ئـەو دەروێشە گوتوویەتی شا–سوڵتان– سەردەکەوێ و دوژمنەکانی لەناو دەبا، ئوزون حەسـەن سـەرەتا بڕیـاری داوە دەستبەسـەر بکـرێ، کـە بـە سـەرکەوتوویی گەڕاوەتەوە و قسەی دەروێش بەڕاست دەرچووه، دەروێش–بابا عەبدولڕەحمان–ی هێناوەتە نزیك خۆی و تا ئـەو کاتـەی بـەرباڕۆ چۆتە لای ئـەو دەروێشـە ڕێـزی خۆی ماوه و سوڵتان خانەقای بۆ دروست کردووه و خەڵکی نەدار و هەژار لە کاتی دیاریکراو بۆ خواردن چوونەتە خانەقا و لەوێدا زیـاتر لـە دووسـەد کـەس جـاری وا نزیکە تا پێنج سەد کەس خەریکی حەلقە بوون و لەو کاتەی سـوڵتان دەردەچـوو، دەروێشیش جبەی لەبەر دەکرد و بە سـواری ئێسـترێکەوە بـە کۆمـەڵێ دەروێشـی دیکە خەریکی زیکر بووه لە تەك کەژاوەکەیـەوە [٣٥]. لەگـەڵ ئەمانەشـدا باسـی لـە چلەنشینی کردووه، کە سۆفی لەنێو کەلبەیەك دانیشـتووه و هیچـی نـەخواردووه، لەوە دواوە لە سەردەمی ئوزون حەسەندا سۆفییەکی پیر، چلەنشـینی کـردووه تـا خەڵك بڕوای پێ بکەن و بەو هۆیەوە پارە و پـوولێکی زۆری کۆکردۆتـەوه، دواجـار ئاشکرا بووه موریدێکی لەژێرەوە خواردنی بۆ بردووه و داویەتێ، ئـوزون حەسـەن لەبـەر ئـەو ریاکارییانـەی لەگـەڵ موریدەکـەی کوشـتوویەتی، هـەروەها باسـی لـە خانەقاش کردووه، کە لەوێدا خواردنیان بە مورید و سۆفی و خەڵکان داوه، لەوەش دواوە خەڵکانی ئەو وڵاتە دەچنە سەر گۆڕی مردووان و ڕۆژێکیان بۆ خێری مـردوو هەیـە، لەسـەر گـۆڕ کۆدەبنـەوه و پـیر و پاکـانیش لـەنێو گۆڕسـتان دەمێننـەوه و

ئامادەگییان هەیە. باسی لەوە کردووە کاتێ خەڵکی ئەو وڵاتە بیانەوێ یادی مردووانیان بکەنەوە خەڵکێکی زۆر پیاو و ژن و پیر و منداڵ روو لە گۆڕستان دەکەن و گۆڕستانەکانیشیان گەورەن و ئەو بۆنەیە بۆنەیەکی کۆمەڵایەتیی گەورەیە و لەگەڵ مەلا و پیاوچاکان دادەنیشن و مۆم دەسووتێنن و مەلاکان دوعا دەخوێنن و ئەوێ هێندە قەرەباڵغ دەبێ وەکو کۆڵانی گەڕەکێکی لێ دێ و خەڵکی هەژار و نەدار رێگای دوور دەبڕن تا لەوێ خێر و سەدەقەیان بەرکەوێ و هەندێ کە خێریان پێ دەکەن داوا دەکەن دوعای خێریان بۆ بکەن و بۆ گۆڕەکانیش بە بەردی مەتین کێل دروست دەکەن و ناوی کەسی مردووی لێ دەنووسن و هەندێ لەو گۆڕانە نوێژخانە-مزگەوت-ێکی بچووک وایە، ئەمەش خەیاڵپەرستیی ئەوانە[36].

بەرپارۆ ئاماژەی بەوەش داوە لە ماردین نەخۆشخانە-بیمارستان-ێك هەیە، لەوێدا خواردنیش بە نەخۆشەکان دراوە و خزمەتکردن زۆر باشە، جاروبار دەروێش رووی لە نەخۆشخانە کردووە، لەوەش دواوە شارەکانی کوردستان زۆربەیان مزگەوتی جوانیان تێدایە، هەروەها کڵێسای جوانیش لەنێو مەسیحییەکان دروست کراوە، بەتایبەتی هی ئەرمەنییەکان[37] ئەمەش نیشانی داوە هەموو پەیڕەوانی ئایینی لە کوردستان بە یەکەوە ژیاون و لەنێوانیاندا ئاشتەوایی لە ئارادا بووە و کێشەو گرفت نەبووە، چونکە کوردستان جێگەی هەموو پەیڕەوانی ئایینی و کەمە ئایینەکانە.

**ج- لە بارەی کەسایەتیی کوردەوە:**

بەرپارۆ هەندێ سەرنجی پڕ بایەخی دەربڕیوە، دووجار لەوە دواوە زمانی کوردی تایبەتە بە میللەت-نەتەوە-یێك، کە زمانێکی سەربەخۆ و جیاوازە لە زمانی دەوروپشت و دراوسێکانیان، زمانیان پاك و بێگەردە، گومان لەوەدا نییە ئەم خەسڵەتانەی بەرپارۆ باسی کردووە، گوزارشت لە سەربەخۆیی کوردی کردووە، کە جودان لەگەڵ هەموو ئەو نەتەوانەی لە ئێران دەژین، بوونی زمانی پاك و بێگەرد خاسڵەتێکی گرنگی بوونی نەتەوەیە، بەرپارۆ زمانی نەتەوەکانی

دیکەی ناوچەکەشی ناسیوەتەوە، بەتایبەتی زمانی فارسی و تورکی، بۆیە ئەو سەرنجەی لە گەشتنامەکەیدا نووسیوە، هەروەها لەوەش دواوە کورد لە رووی ژمارەوە قەلا و دژیان زۆرە و لە جێگەی سەخت و لەسەر کێو دروستیان کردوون و دەروازەکانیان گرتوون، ئەمەش دەیسەلمێنێ کورد بەردەوام سەربەخۆیی خۆی پاراستووە و بەرگریی لە بوونی خۆی کردووە، لەبەر ئەوە ئەو شوێنە سەخت و بەرزانەی هەڵبژاردووە، هەروەها لەوەش دواوە کورد بێ بەزەیین، لە راستیدا بەرباڕۆ دووجار لەلایەن کوردەوە رووبەڕووی دزی و جەردەیی بۆتەوە و تاڕادەیەك هێندەی نەمابوو بکوژرێ و لە رووداوێکدا لە نزیك بەدلیس دوو هاوڕێی و باڵیۆزی ئوزون حەسەن کوژراون بۆ خۆشی هەڵاتووە، جارێکی دیکەشیان کوردان رێگەیان لێگرتووە، ئەو گوتوویەتی دەچمە لای ئوزون حەسەن، ئەوانیش لێیان داوە و چوار مانگ بەدەم ئەو ئازارەوە ناڵاندوویەتی، بەگشتی دەبێ ئەوە بزانین کورد لەو سەردەمدا دژی هەموو کارێکی ئاق قۆیونلو بووە، ئەو رووداوانەش گیانی رق و کینەی کوردی لە دژی ئاق قۆیونلو زیندوو کردۆتەوە، بەتایبەتی هەڵمەتی بەربڵاوی ئوزون حەسەن بۆ لەناوبردنی میرنشینە کوردییەکان بارێکی نائاسایی لای کورد دروست کردووە و ئەو کارەساتە لە زەینی کورد نەسڕاوەتەوە، لەبەر ئەوە کوشتنی باڵیۆزی ئوزون حەسەن و ئازاردانی کەسێکی وەك باڕباڕۆ کە بۆ پەیوەندی هاتووە، گیانی تۆڵەی لای کورد بزواندووە. سەیر لەوەدایە بەرباڕۆ دوای ئەو هەموو زەحمەتییەی کە گەیشتۆتە تەورێزی پایتەخت و باسی بارودۆخی خۆی بۆ ئوزون حەسەن کردووە، سوڵتانی ئاق قۆیونلو هەرچەندە بەڵێنی داوە بەهانای بێت، کەچی لە بەرانبەردا چ کاردانەوەی نەبووە، تەنیا زەرەر و زیانەکانی بۆ قەرەبوو کردۆتەوە .

بەلای بەرباڕۆ کەسایەتیی کورد زۆر پەیوەندیی بە سروشتی کوردستان خۆیەوە هەبووە و کورد رێگریی کردووە، ئەم رایەشی لە دوو لایەنەوە سەرچاوەی گرتووە، لە کاتێکدا بۆ خۆی ئاگاداریی جەور و ستەمی ئوزون حەسەن نەبووە بەرامبەر کورد و نەیزانیوە ئاق قۆیونلو هەڵمەتی لەناوبردنی میرنشینە کوردییەکانیان دەست پێکردووە. لەلایەکی دیکەوە لەبەر ئەوەی پەیامی ئەوە

بووە لە دژی دەوڵەتی عوسمانی پەیوەندیی بەهێز لەگەڵ ئاق قۆیونلو ببەستێ، بۆیە لەگەڵ ئوزون حەسەن هاوسۆز بووە، پێی وابووە سنووری دەوڵەتی ئاق قۆیونلو هەمووی ملکەچی ئوزون حەسەنن، بەڵام دواجار بۆی دەرکەوتووە کورد لە رووی زمان بە تایبەتی نەتەوەوە جودان و بە دوای سەربەخۆیی خۆیانەوەن. لەگەڵ ئەو سەرنجانەی بەرپارۆ لەبارەی کورد و رێگری، کەچی دوای نزیکەی سێ ساڵ بازرگانی نەناسراوی ڤینیسی رووی لە کوردستان کردووە و زۆر بە ئیجابی باسی کوردی کردووە[٣٨].

## ئەنجام:

دەتوانین ئەنجامەكانی باسەكە لەم چەند خاڵەدا بخەینەڕوو:

١–جۆزافا بەرباڕۆ یەكێ لە سەرقافڵەی باڵیۆزانی كۆماری ڤینیسیا بووە، بۆ ئەوەی فشاری دەوڵەتی عوسمانی لەسەر كۆمارەكەیان كەم بكاتەوە، سەری لە دەرباری ئوزون حەسەن داوە، تا هاوكاریی دەوڵەتی ئاق قویونلو بەدەست بێنێ، بۆ خۆی بەشێكی گرنگ بووە لە جێبەجێكردنی ئەو پلانە و لە ماوەیەكی هەستیاردا بە كوردستاندا تێپەڕیوە، وەك كەسایەتێكی سیاسی سەرنجی بەرچاوی لە بارەی كورد و كوردستانەوە نووسیوە، كە بۆ رۆژگاری ئەمڕۆ بایەخی هەیە.

٢– هەردوو كتێبی (كتێبی دیاربەكرییە)ی ئەبوبەكر تارانی و (تاریخی عالەم ئارای ئەمینی)ی فەزلوڵلا روزبەهان خونجی بریتین لە نووسینەوەی زۆربەی زۆری مێژووی سیاسیی دەوڵەتی ئاق قویونلو، كتێبی یەكەمیان پەیوەندیی بە سەرەتای سەرهەڵدانی ئاق قویونلو لە كوردستان و دروستبوونی دەوڵەتەكە لەلایەن ئوزون حەسەنەوە، تا ساڵی (٨٧٦ك/١٤٧١ز). كتێبی دووەمیان لە ساڵی (٨٨٢ك/١٤٧٧ز) هوە دەستی پێكردووە تا مردنی یەعقوب لە ساڵی (٨٩٦ك/١٤٩٠ز) لەبەر ئەوە لەم نێوانەدا نزیكەی شەش ساڵ لەلایەن مێژوونووسانی خۆیانەوە لە هەمان سەردەم نەنووسراوەتەوە، بەرباڕۆ لەبەر ئەوەی لە دەرباری ئوزون حەسەن بووە، لێرەدا وەك شایەدحاڵێك و بگرە مێژوونووسێك ئەو ماوەیەی نووسیوەتەوە، رووداوە گرنگەكانی بەتایبەتی ئەوانەی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە كوردستانەوە هەیە، یاداشت كردووە.

٣– لەگەڵ ئەوەی ئوزون حەسەن ساڵی (٨٧٢ك/١٤٦٨ز) هەڵمەتێكی فراوانی كردە سەر میرنشینە كوردییەكان، دوای ئەو هەڵمەتە بە هیچ جۆرێ سەرچاوەكانی دەرباری ئاق قویونلو باسی میرنشینیی كوردی و چالاكییەكانی نەكردووە. كەچی بەرباڕۆ باسی لەوە كردووە، لە كوردستان سەدان قەڵا و دژی كوردان لە سەر كێوە بەرزەكان ماون و لە جموجولدان ئوزون حەسەنیش دەستی نەگەیشتووەتێ. ئەم سەرنجانەش دەیسەلمێنێ كورد ناوچە دوورەدەستەكانی بە سەربەخۆیی بەڕێوە بردووە، هەرچەندە شارەكان و هەندێ قەڵا راستەوخۆ لەلایەن ئیدارەی ئاق قۆیونلو بەڕێوەبراون.

٤- لەبارەی دانیشتوانەوە زیاتر ئاماژەی بە تایەفەکانی مەسیحیی نێو کوردستان داوە و بە زێدەڕۆیی باسی کردووە، هەروەها باسی لە ڕەگەزی کورد کردووە، لەبابەت شارە کوردییەکانەوە بە تایبەتی هی کوردستانی باکوور لەوە دواوە، هەندێکیان بە هۆی شەڕەوە وێران بوون، ئەوانەشی ئاوەدانن دواتر وەسفی کردوون.

٥- تەسەوف پانتاییەکی زۆری کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی بە گشتی و کوردی بەتایبەتی داگیر کردووە، لەماوەی تێپەڕبوونی بە شارە کوردییەکاندا زکر و تەهلیلەی سۆفییانی دیوە، هەروەها دەسەڵاتدارانی ئاق قویونلو بایەخیان بە تەسەوف داوە و خەڵکیش گرنگییان پێداون و بگرە جێگە و رێگەیان داونەتێ. هەروەها باسی لە نەخۆشخانە کردووە، کە تیایدا خواردنیان بە نەخۆش، هەتا بە دەروێشیش داوە. هەروەها لە کوردستان هەموو پەیڕەوانی ئایینی بە یەکەوە ژیاون و هیچ کێشەیەکیان لەگەڵ یەك نەبووە، کەم شار هەبووە تەنیا یەك پەیڕەوی ئایینی لێ بێت، لەبەر ئەوە کوردستان مەڵبەندی پێکەوە ژیانی ئایینی و کەمە ئایینییەکان بووە، چونکە ئاشتەوایی لە نێوانیان هەبووە.

٦- کورد زمانی تایبەتی خۆی هەیە، زمانەکەشی هی میللەتێکە جیاوازە لەگەڵ ئەوانەی دەوروبەری. زمانی کوردی زمانێکی پاك و بێگەردە و لە هەردوو زمانی فارسی و تورکی جودایە، بەلای بەرپارۆ کەسایەتیی کورد زۆر پەیوەندیی بە سروشتی کوردستان خۆیەوە هەبووە و کورد رێگری کردووە، ئەم رایەشی لە دوو لایەنەوە سەرچاوەی گرتووە، لە کاتێکدا بۆ خۆی ئاگاداری جەور و ستەمی ئوزون حەسەن نەبووە بەرامبەر کورد و نەیزانیوە ئاق قویونلو هەلمەتی لەناوبردنی میرنشینە کوردییەکانیان دەست پێکردووە. لەلایەکی دیکەوە لەبەر ئەوەی پەیامی ئەوە بووە لە دژی دەوڵەتی عوسمانی پەیوەندیی بەهێز لەگەڵ ئاق قۆیونلو ببەستێ، بۆیە لەگەڵ ئوزون حەسەن هاوسۆز بووە، پێی وابووە سنووری دەوڵەتی ئاق قۆیونلو هەمووی ملکەچی ئوزون حەسەنن، بەڵام دواجار بۆی دەرکەوتووە کورد لە رووی زمان نەتەوەی جودان و بە دوای سەربەخۆیی خۆیانەوەن.

## پەراوێزەکان:

١- بڕوانە: جەیمز ئەی کوریك: رێنسانس، وەرگێڕانی: هەژار رەحیمی، بەڕێوەبەرایەتیی بڵاوکردنەوەی هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، بێ ساڵ.

2- JOSAFA BARBARO; TRAVELS TO TANA AND PERSIA
Translated by WILLIAM THOMAS, BURT FRANKLIN PUBLISHER, U.S.A, NEW YORK, N.D.P.51-55.

٣- میرنشینی قارەمان: میرنشینێکی تورکمانییە لە ساڵی (٦٥٤ك/ ١٢٥٦ز)دا لە لایەن میرەکانی پاشماوەی سەلجووقییەکانەوە دامەزراوە، لە ناوچەکانی (ئارمناك و لارندە و قونیە) و دەوروبەری حوکمیان کردووە، بوونەتە جێگەی چاوتێبڕینی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی مەمالیك، تا دواجار لە ساڵی (٨٨٨ك/ ١٤٨٣ز) دا بە دەستی سوڵتان محەمەد فاتح کۆتایی بە دەسەڵاتیان هات. ستانلی لین بول: الدول الاسلامية، ترجمة: محمد صبحی فرزات، (دمشق: ١٩٧٤)، قسم ٢، ص٤٣٥-٤٤٠ .

٤- میرێللا گەلێتی: کورد و کوردستان له نووسراوەکانی ئیتاڵیدا له سەدەی سێزدەم-نۆزدەم (ز)، و: جاسم تۆفیق، پیاچوونەوەی: سەلاح رێبوار، (ستۆکهۆڵم: ١٩٨٧)، ل٣٧ . TRAVELS;P4-6

٥- **میرنشینی زولقەدەر:** خێڵێکی تورکمان بە ناوی زولقەدەر لە سەردەمی شاڵاوەکانی جەنگیزخاندا له ئاسیای بچووك گیرساونەتەوە، له سەدەی (٨ك/١٤ز)دا تا سەرەتای سەدەی (١٠ك/١٦ز) دا لە ئەبلستان و دەوروبەری حوکمی گێڕاوە، بۆ یەکەم جار ساڵی (٧٣٧ك/١٣٣٦ز) زینەدین قەراجا له سەرچاوە مەملووکییەکاندا وەك سەرۆك خێڵی زولقەدەر ناوی هاتووە، لە ساڵی (٧٤٠ك/١٣٣٩ز) سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاندووە و شوێنێکی ستراتیژییان هەبووە، کە بەدرێژایی سەدەی (٩ك/١٥ز) بۆتە مەڵبەندی ململانێی عوسمانی و مەمالیکەکان، زۆربەی کات مەمالیکەکان له بنەماڵەکەدا میریان بۆ هەڵبژاردوون و له ژێر سایەی دەسەڵاتیاندا بوون، بەڵام دواجار له ساڵی (٩٢٨ك/١٥٢١ز) عوسمانییەکان کردیان بەیەکێ لە ویلایەتەکانی خۆیان و مێژووی سیاسییان کۆتایی هات. ستانلی لین بول: الدول، قسم٢، ص٤٥٤ -٤٦١. حنان جاسم محمد الزهيري: العلاقات السياسية المملوكية التركمانية خلال عهد دولة المماليك الجراكسة، رسالة ماجستير،كلية الاداب، جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٩١)، ص٢٣-٣٦.

6- TRAVELS;P43-46.

٧- تانا: بەندەرێکی گرنگی دەریای رەش بووە لە سەدەی (١٥ و ١٦)ی زایینیدا ڤینیسیاییەکان کاڵایان لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا هەناردە کردووە. جوزافا باربارو و دیگر: سفرنامەهای ونیزیان در ایران، ترجمە: منوچهر امیری، انتشارات خوارزمی، (تهران:١٣٨١هـ.ش)، چ٢.(حاشیه٢)ص٢١.

٨- میرێللا گەلێتی: کورد و کوردستان ، ل٣٧ .

٩- بیرەجوك (بیرە): شارێکە لە نزیك سیمسات، کەوتۆتە باکووری رۆژهەلاتی حەلەب و رۆژهەلاتی قەلاَی رۆم، قەلاَیەکی پتەوە. یاقوت الحموي: معجم البلدان، دار صادر، (بیروت:١٩٨٦) ، ج١، ص٥٢٦، ٧٨٧.

١٠- ابوبکر طهراني: کتاب دیاربکریة، تصحیح: نجاتي لوغال و فاروق سومر، کتابخانه طهوری، (تهران:١٣٥٦هـ.ش)، چ٢.ج٢،ص٥٤٣-٥٤٤. البدلیسي: شرفنامة، ترجمة: محمد جمیل الملا احمد الروزبیاني، مؤسسة موکریاني، (اربیل:٢٠٠١)،ص٣١٥،٦٣٣.

١١- TRAVELS;P.3,17-23,35,42-48,84-86,103.

١٢- TRAVELS;P.3. سفرنامة، ص٢١.

١٣- TRAVELS;P.82-86. سفرنامة، ص٨٢-٨٦.

١٤- TRAVELS;P.46,68,71,92. سفرنامة، ص٨٠، ٨٥، ٨٨، ١١١.

١٥- تارانی هەروەك لە کتێبەکەی خۆیدا ئاماژەی پێکردووە، بەشی هەرە زۆری کتێبی دیاربەکرییەی لە سالّی (٨٧٥ك/١٤٧١ز) نووسیوە و لە ژێر ناوی (مێژووی حەسەن بەگی ئاق قۆیونلو و باب و باپیرانی و هەرچی سەبارەتە بەوی لە مێژووی قەرە قۆیونلو و چۆغاتای دا) سەردێری کردووە و بەشێوەیەکی ورد زۆربەی زۆری ئەو رووداوە سیاسییانەی لە سەدەی ٩ك/١٥ز لە کوردستان بە تایبەتی و ناوچەکە بە گشتی روویان داوە، تۆمار کردوون.

١٦- کتێبی عالەم ئارای ئەمینی یان شەرحی حوکمڕانیی سولّتانانی ئاق قویونلو و سەرهەلّدانی سەفەوییان، بە فەرمانی سولّتان یەعقوب نووسراوە، فەزلوللا چوار سالّ هاوڕێی سولّتان بووە و هاتوچۆی دەربارییەکانی کردووە تا بتوانێ مێژووی فەرمانڕەوایەتی ماوەی یەعقوب بنووسێتەوە، بە پێشەکییەکی دوور و درێژ دەستی پێکردووە و باسی رووداوەکانی دوای مەرگی ئوزون حەسەنی کردووە، بۆ رووداوەکانی سەرەتای دەسەلاَت وەرگرتنی سولّتان یەعقوب زیاتر سوودی لە هی دیکە وەرگرتووە، بەلاَم رووداوەکانی دواتر و ماوەی فەرمانڕەوایەتی بە چاوی خۆی دیتووە و شایەدحالّی رووداوەکان بووە، بەتایبەتی جموجۆلّی سەفەوی لەو ماوەیەدا، لەبەر ئەوە زۆربەی رووداوەکانی کتێبەکە بریتین لەو رووداوانەی خۆی تیایدا ژیاوە و دیتوویەتی. کتێبەکە بۆ دوو بەش دابەشکراوە، بەشی یەکەم بریتییە لە دیباچە، بەشی دووەم بریتییە لە مێژووی رۆژگاری دەسەلاَتی سولّتان یەعقوب. بڕوانە: فضل الله روزبهان خنجي: تاریخ عالم اراي اميني، مصحح: م حمد اکبر عشیق، میراث مکتوب، (تهران:١٣٨٢) ،چاپ اول.

١٧- TRAVELS;P.50-51. شرفخان بدلیسي: شرفنامه،ص٢٣٩،٣١٥،٥١٥،٦٣٣. والتر هینتس: تشکیل دولت ملی در ایران، ترجمه: کیکاوس جهانداری، شرکت سهامی انتشارات خوارزمی، (تهران:١٣٧٧هـ.ش)، چاپ چهارم.ص١٧٩ .

١٨- تەرسوس: گرنگترین شار و قەلاَی موسلّمان بووە لە سەر سنووری رۆم و شوێنێکی زۆر پتەو و مەتین بووە، کەوتۆتە باشووری کیلیکیە و بەڕووی زنجیرە چیای تۆرۆسی روانیوە و پێشتر سنووری نێوان موسلّمان و مەسیحییەت بووە. گای لسترنج: جغرافیای تاریخی

سرزمین هایی خلافت شرقی، مترجم: محمود عرفان، شـرکت انتشـارات علمـی و فرهنگـی، ( تهران:١٣٨٣هـ.ش)، چاپ ششم. ص١٤١.

١٩- ئەدەنە: شارێکی گەورە بووە لە وڵاتی روم_ئاسیای بچووك_ کەوتۆتە باشـووری رووبـاری سەیحان و قەڵایەکی پتەوی هەبووە. گای لسترنج: جغرافیای تاریخی،ص١٤٠.

٢٠- .TRAVELS;P.45,51, 91-93. سفرنامە، ص٦٠-١١٠،٦٨-١١٢.

٢١- .TRAVELS;P.47-49 . طهرانـي: کتـاب دیاربکرییـة، ج٢، ص٥٠٧ . سـفرنامە، ص٦٣-٦٥.

٢٢- .TRAVELS;P.49-50,84. سفرنامە، ص٦٥-١٠١،٦٦.

٢٣- .TRAVELS;P.50. سفرنامە، ص٦٦. میرێلا گەلێتی: کورد و کوردستان ، ل٣٨.

٢٤- .TRAVELS;P.50 . طهراني: کتاب دیاربکریـة، ج٢، ص٥٠٧ . سـفرنامە، ص٦٦. میرێـلا گەلێتی: کورد و کوردستان ، ل٣٧-٣٨.

٢٥- .TRAVELS;P.35-43 . حسن بیگ روملـو: احسـن التـواریخ، تصـحیح و تحشـیە: دکـتر عبدالحسین نوائي. انتشارات اساطیر، (تهران ١٣٨٤هـ.ش)، چاپ اول.ج٢، ص٧٦٢-٧٧٢.

٢٦- .TRAVELS;P.64,66,70 . سـفرنامە، ص٢٥١-٢٥٤. حسـن روملـو: احسـن التواریخ،ج٢،ص٨٠٧-٨٠٨.

٢٧- .TRAVELS;P.47-51. سفرنامە، ص٦٣-٦٧.

٢٨- .TRAVELS;P.83,84. سفرنامە، ص١٠٠-١٠٢.

٢٩- .TRAVELS;P.47,51,84-85,91 . سفرنامە، ص٦٣-١٠١،٦٧-١١٠،١٠٣.

٣٠- رابیعە فـەتاح: کـورد و کوردسـتان لـە سـەفەرنامەی بازرگـانی ڤینیسـیاییدا ، (هـەولێر : ٢٠١٤)، ل٤٥.

٣١- .TRAVELS;P.47-49. سفرنامە، ص٦٣-٦٦.

٣٢- .TRAVELS;P.84,85. سفرنامە، ص١٠١-١٠٣.

٣٣- .TRAVELS;P.46-47. سفرنامە، ص٦٢-٦٤.

٣٤- طهراني: کتاب دیاربکریة، ج١، ص٢٣٥-٢٨٠، ج٢، ص٥٥٨،٤٨٥،٤٧٦،٤١٣.

٣٥- .TRAVELS;P.97-98. سفرنامە، ص١١٥.

٣٦- .TRAVELS;P.98. سفرنامە، ص١١٤-١١٧.

٣٧- .TRAVELS;P.48,51. سفرنامە، ص٦٤، ٦٨.

٣٨- .TRAVELS;P.45,49,50. سفرنامە،ص٦٠، ٦، 66. رابیعـە فـەتاح: کـورد و کوردسـتان، ل٢٥-٢٩.

## سەرچاوەکان:

یەکەم: سەرچاوە (المصدر)

ابوبکر طهراني : ابوبکر طهراني الاصفهاني (توفي بعد ٨٨٦هـ/ ١٤٨٢م)

_ كتاب دياربكريه، تصحيح: نجاتي لوغال و فاروق سومر، كتابخانه طهوري، (تهران: ١٣٥٦ هـ.ش).
البدليسي : الامير شرفخان بن شمس الدين بن شرفخان (توفي١٠١٠ هـ /١٦٠٣م)
_ شرفنامة، ترجمة: محمد جميل الملا الروزبياني، مؤسسة موكرياني، ( اربيل:٢٠٠٢ ) ، الطبعة الثانية.
جوزافا باربارو و ديگر:
_سفرنامههای ونيزيان در ايران، ترجمه: منوچهر اميری، انتشارات خوارزمی، (تهران:١٣٨١هـ.ش)، چ٢.
حسن بيگ روملو: حسن بيگ امير سلطان روملو (توفي بعد ٩٨٥هـ/١٥٧٧م).
_احسن التواريخ، تصحيح و تحشيه: دكتر عبدالحسين نوائي، انتشارات اساطير، ( تهران :١٣٨٤هـ.ش)، چاپ اول.
فضل الله روزبهان خنجي: فضل الله روزبهان بن فضل الله خنجي اصفهاني (توفي٩٢٧هـ/١٥٢٠م)
_ تاريخ عالم آراي اميني، مصحح: محمد اكبر عشيق، ميراث مكتوب، (تهران: ١٣٨٢ هـ.ش)، چاپ اول.
ياقوت الحموي: شهاب الدين ابو علي عبدالله ياقوت بن عبدالله (توفي٦٢٦هـ/١٢٢٨م).
_معجم البلدان، دار صادر، (بيروت:١٩٨٦).
- JOSAFA BARBARO; TRAVELS TO TANA AND PERSIA, Translated by WILLIAM THOMAS, BURT FRANKLIN PUBLISHER, U.S.A, NEW YORK, N.D.

**دووەم: ژێدەر (المراجع)**

_ جەیمز ئەی کوریك، ڕێنسانس، وەرگێڕانی: هەژار ڕەحیمی، بەڕێوەبەرایەتیی بڵاوکردنەوەی هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، (بێ ساڵ).
_حنان جاسم محمد الزهيري: العلاقات السياسية المملوكية التركمانية خلال عهد دولة المماليك الجراكسة، رسالة ماجستير، كليةالاداب، جامعةالموصل، (الموصل:١٩٩١).
_ رابیعە فەتاح شێخ محەمەد: کورد و کوردستان لە سەفەرنامەی بازرگانی ڤینیسیاییدا ، خانەی موکریانی، (هەولێر: ٢٠١٤).
_ستانلی لين بول: الدول الاسلامية، ترجمة: محمد صبحی فرزات، (دمشق:١٩٧٤)، قسم ٢.
_گای لسترنج: جغرافيای تاريخی سرزمين هايی خلافت شرقی، مترجم: محمود عرفان، شركت انتشارات علمی و فرهنگی، (تهران:١٣٨٣هـ.ش)، چاپ ششم.
_میرێللا گەلێتی: کورد و کوردستان لە نووسراوەکانی ئیتاڵیدا لە سەدەی سێزدەم—نۆزدەم (ز) و: جاسم تۆفیق، پیاچوونەوەی: سەلاح ڕێبوار، بنکەی هەنگاو بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری کوردی، (ستۆکهۆڵم: ١٩٨٧)،.
_ والتر هينتس: تشكيل دولت ملی در ايران، ترجمه: كيكاوس جهانداری، شركت سهامی انتشارات خوارزمی، (تهران:١٣٧٧هـ.ش)، چاپ چهارم.

## ملخص البحث

## الكورد و كوردستان في رحلة جوزافا باربارو

( ٨١٦-٩٠٠ هـ / ١٤١٣-١٤٩٤م )

زار السفراء والرحالة البندقيون في الفترة الربع الاخير من القرن (٩ هـ / ١٥م) ايران و كوردستان وسجلوا ما شاهدوه وماسمعوه. ان جوزافا باربارو هو احد السفراء البندقيون الذي زار بلاط اوزون حسن زعيم الآق قويونلو بين عامي (٨٧٦-٨٨٢ هـ /١٤٧١-١٤٧٧م) في فترة حساسة ومهمة بالنسبة لتاريخ المنطقة. وكانت رحلته ضمن خطة لتقليل ضغوط الدولة العثمانية على الجمهورية البندقية.

لقد زار السفراء ورحالة كثيرون كوردستان في الفترات التاريخية دونوا رحلاتهم التي اصبحت لاحقا مصدرا مهما من مصادر تاريخ الكورد وكوردستان . يعتبر رحلة جوزافا باربارو من احد المصادر المهمة عن الكورد وكوردستان في تلك الفترة. حيث انه هو من اوائل الغربيين الذين تطرقوا الى ان الكورد لهم لغة مستقلة و نقية، ويختلف لغتهم عن لغات باقي جيرانهم.

يتألف البحث من اربعة مباحث، خصصت المبحث الاول لحياة باربارو الشخصية ومهامه في ايران وكوردستان. اما المبحث الثاني فيتناول بيان تاريخ كتابة الرحلة وفصوله ومصادره. وفي المبحث الثالث بحث الوضع السياسي في شمال كوردستان وذكر باربارو بان هناك نشاط سياسي للكورد في بعض المدن والقلاع، وجدير بالذكر ان ما تحدث عنه يأتي بعد حملة التي شنها اوزون حسن ضد الامارات الكوردية.

اما المبحث الاخير فيتناول الجانب الاقتصادي واشار الى بعض الجوانب الاقتصادية لبعض المدن والقلاع الكوردية وخاصة في شمال كوردستان، وتناول بعض الملامح الاجتماعية لبعض المدن الكوردية وتحدث عن الشخصية الكوردية.

## Abstract

"Kurds and Kurdistan in Travels of Josafa Barbaro"
(816-900 H. / 1413 – 1494 A.D.)

Josafa Barbaro is one of the pioneer ambassadors of Venice Republic between (1471 – 1477 A. D.). He went into the court of Uzun Hassan in order to reduce the pressure and the threats of the Ottoman State on the Venice Republic in particular and the west in general. His travels are printed in the form of a book and he traveled through Kurdistan during a very sensitive period. He registered his notes and remarks in details regarding the mentioned area, Kurdistan.

This book is of great significance for the Kurds and Kurdistan in the present time. Barbaro registered what he saw or heard during his travel. His book consists of two parts – one about Iran, the other about Kurdistan. He could record his notes as a historian on the last period of Uzun Hassan's reign. From the year of (872 H. / 1468 A. D.) on, Uzun Hassan launched a big campaign against the Kurdish principalities, and the historical resources very briefly mentioned the Kurdish movements during that period. Barbaro in his book refers to hundreds of forts and citadels where the Kurds protecting themselves, and sometimes these citadels and cities were administered directly by the Ak KÖyÜnlÜ leaders. Yet, some of these citadels remained in the hands of the Kurds and the Kurdish officials were in charge of them for a long time. He also mentioned the people of the northern Kurdistan, exaggerating the number of the Armenians living there. Besides, he did not hide his views about the Kurdish sophist cult prevalent during that time in the area. Regarding the peaceful coexistence between the people of different faith or religion, Barbaro mentioned that there were no conflict between the Christians and the Muslims living side by side. For him, Kurdistan is the center for holders of different faiths and ethnic groups.

The most important aspect in Barbaro's book is the fact that he mentions that the Kurds are a different nation, having their own language. The Kurdish language is pure and clean in comparison to the language of the people living around them. This is a unique description by a European writer about the Kurds in that age since it presents a positive view of the Kurds.

The paper consists of 4 sections. The first presents the biography of Barbaros , his personality and duties in Iran and Kurdistan.The second section was about the history of the travels, its parts and sources.The third section is about the political situation in Southern Kurdistan where he mentioned some of the Kurdish political movements and revolutions. The fourth section is about the economic circumstances of Kurdistan along with some social aspects as well.

# بیرۆکەی ڕەچەڵەکی "بێگانە"ی خانەوادە نەجیبزادە کوردییەکان وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی !

نووسینی کوردناسی ڕووس : یێ. ی. ڤاسیلیەڤا

وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە : ڕەشاد میران

کۆمەڵێك لە خانەوادە نەجیبزادە کوردییەکان، ئەوانەی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کوردستاندا جێگەی دیاریان هەبووە، بانگەشەی ڕەچەڵەکی "بێگانە" و تەنانەت ناکوردییشیان کردووە بۆ خۆیان. نموونەی ئەمەش زۆرن، ئەوەندە بەسە بگەڕێینەوە بۆ دەقەکانی "شەرەفنامە"ی شەرەفخانی بەدلیسی و سەرچاوە مێژووییەکانی دی. بنەماڵەی میرانی بەنی ئەردەڵان، فەرمانڕەوایانی بەدلیس و ساسون ڕەچەڵەکی خۆیان بۆ ساسانییان گەڕاندۆتەوە، فەرمانڕەوایانی هەکاری– بۆ خەلیفەکانی عەباسی. هەروەهاش میرانی بادینان و فەرمانڕەوایانی چەمیشگەزەك خۆیان بردۆتەوە سەر ئەمانە. فەرمانڕەوایانی جزیرە ڕیشاڵەکانی شەجەرەی خۆیان گەیاندۆتە سەرکردەی بەناوبانگی عەرەب، خۆشەویستی موحەمەدی پەیامبەر، خالید ئیبن وەلید. فەرمانڕەوایانی سۆران خۆیان بە وەچەی بنەماڵەیەکی عەرەبی خانەدان دەزانی [1]. دەتوانین بەردەوام بین لە هێنانەوەی نموونەی زیاتر [2]، بەلام ئێمە تەنیا لەسەر هەرە بەناوبانگەکان دەوەستین.

نووسەران بەشێوەی جیاواز لەم جۆرە بانگەشە ڕەچەڵەکییانە (گینیالۆگیا) دەڕوانن بۆ نموونە، مێژوونووسی کورد عەبدوڵڵا مەردوخ ئەوە ڕووندەکاتەوە کە خۆبردنەوەی خانەوادەی بەنی ئەردەڵان بۆ سەر ساسانییان بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ناوبانگیی خانەوادەکەیە [3] و بۆ دروستکردنی باق و بریقێکی

شاهانە بە دەورییەوە؛ بەڕای ئێمە بێگومان ئەوە هەیە. بەڵام، کاتێك هەندێ نووسەر ئەم بانگەشەی بێگانەبوونەی ڕەچەڵەك دەکەن بە بنەمایەك بۆ مەسەلەی دروستبوونی کورد وەکو میللەت (ئێتنۆگنێز) و دەرئەنجام وەدەسدێنن سەبارەت بە نەژاد و ڕەچەڵەکی میللەتەکە[٤]، ئەم جۆرە تیۆریا دارشتنە دەبێتە مایەی بەرپەرچدانەوە. وەکو دەردەکەوێ، ڕەگ و ڕیشاڵی ئەم دیاردەیە لە لایەنی ئێتنیکیدا نین، بەڵکو لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی–چینایەتی و کۆمەڵایەتی–سیاسیی دان.

بە چاوخشاندنەوەیەك بە مێژووی دارشتنی شەجەرەی ئەو خانەوادە نەجیبزادە کوردییانەی گوایە ڕەچەڵەکی ناکوردییان هەیە، دەردەکەوێت کە ئەمە شتێکی تر نییە جگە لە وێناکردنێکی ئایدیۆلۆگییانەی خۆ بەدوورگرتنی توێژی باڵای نەجیبزادەیی کورد و جیابوونەوەی لە بەشەکانی تری کۆمەڵگاوە. بە ڕادەی بەرزبوونەوەی خانەوادەی فەرمانڕەوا، لە قۆناغێکدا، پێویستی بە ڕووبەرێکی دوورکەوتنەوە بوو لە خێڵەکەی خۆی، ئەویش بە دانانی سنوورێکی توندی جیاکەرەوەی لە ئەوانی دییەوە. هەروەها، چەندی ناوی دامەزرێنەری خانەوادەکە بەرز و تەنانەت لەڕووی ئێتنیکییەوە بێگانەش بوویێ، ئەوەندە سنوورە کۆمەڵایەتییەکە زەقتر و پتەوتر دەبوو.

ئەم جۆرە خۆ تایبەتمەندکردنە کۆمەڵایەتییەی خانەوادە فەرمانڕەواکانی کوردستان، بە بانگەشەی ڕەچەڵەکی " بێگانە"یان، زێتر و ڕوونتر لە ناوەندە خێڵەتییەکان بەدیی دەکرێ. ڕاستییەکەشی، ئەوەی هەموو نووسەران دانی پێدا نانێن، ئەوەیە کە لەنێو بنیادی بنەماڵەیی– خێڵەتیدا نایەکسانیی چینایەتی، دەسەڵاتێکی داپلۆسێنەر و پەیوەندییەکانی فیۆدالیی خۆیان حەشاردابوو. بۆ نموونە، ئاماژە بە دوو تۆژەری پسپۆر لە کۆمەڵگای کۆچەریی عەرابیای سعوودی دەکەین، ئا. ی. پێرشیتس و ئا. م. ڤاسیلییەڤ، کە بۆچوونەکانیان بنەڕەتانە دژیەکن. بەلای پێرشیتسەوە، بوونی دەزگای جەنگی– سیاسی لەناو خێڵدا لەسەر بنەمای یاسا نەریتییەکان هیچ گومانێك هەڵناگرێ[٥]. کەچی بەڕای ڤاسیلییەڤ، دەزگای داپلۆسێنەری چینایەتی لە عەرەبیای سعوودی تازە دروست دەبوو و

سیما سەرەکییەکانیشی کە بریتیبوون لە: سوپا، پۆلیس، زیندان، ماشێنی بەڕێوەبردن، دادگای چینایەتی لەناو خێڵدا نەبوون. بۆیە بەهێزترین سەرکردەی خێڵەتی، بە ڕای ئەم تۆژەرە، نەیتوانیوە بچووکترین سزا بەسەر هەژارترین ئەندامی خێڵدا بسەپێنێ [٦].

یەکڕایی سەبارەت بە دەسەڵاتی ناچارکەر لەناو خێڵی کوردیشدا نییە. جاری وا هەیە لە یەك نووسراودا سەرکردەی خێڵ بە "یەکەمین لەنێو یەکسانان" ناوزەد کراوە، دوای چەند دێڕێك کراوە بە "بەڵگەی میکانیزمێکی ڕێکخراوی " ئیرادەی ئەو [٧]. ئەو ڕایەی سەبارەت بە سەرکردەی خێڵی کوردی وەکو "یەکەمین لەنێو یەکسانان " زێتر باوە [٨]. بەڵام گێڕانەوەکەی ك. ج. ڕیچ کە گوایە هەر ئەندامێکی خێڵی بلْباس دەیتوانی کار بکاتە سەر قسەی سەرکردە و تەنانەت بشیگۆڕی [٩]، لەگەڵ هەر قسەکانی خۆیدا سەبارەت بە دەسەڵاتی بێسنووری سەرکردە یەك ناگرێتەوە، هەروەهاش لەگەڵ گێڕانەوەکانی نووسەری کوردی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمدا مەلا مەحموودی بایزیدی کە نووسیویەتی "سەرکردەی خێڵ خەڵکی لە خێڵەکەی خۆیی دەگرتن ﴿لەسەر هەر سەرپێچییەك﴾ بەندی دەکردن، دەستی بەسەر موڵك وماڵیاندا دەگرت، بەخەیاڵیدا هاتبا هەر لە ماڵی خۆی دوو سێیەکی لێ دەکوشتن. فەرمانڕەوایانیش لە کوژراوانیان نەدەپرسی، چونکە ئەمانە سەربە خێڵ بوون [ئاغاکەیان کوشتبوونی]... کەسیش لێی نەدەپرسی " بۆچی واتکرد ؟" [١٠].

سیما دەرەکییەکانی دەسەڵاتی ناچارکەر بە لایەنی کەمیشیەوە ڕەنگی لە ناوەرۆکی ئەو دەسەڵاتە نەداوەتەوە. نموونەی پێشوو نیشاندەدات کە ئەرکەکانی دەزگای پۆلیس، زیندان، دادگایی و تەنانەت جێبەجێکردنی بڕیاریش چەندە بە ڕێکی و بێ تەگەرەیەك بەڕێوەچووین. سادە و ساکاریی دەزگای داپلۆسێن ڕێگەی نێوان تاوانبارکردن و سزادانی تا ئەوپەڕی کورت کردبووەوە. بەتایبەتیش لەنێو خێڵە بچووکەکاندا ئەم دەزگایە ساکارە بوو کە تیایدا هەموو کار و ڕووداوەکان ڕاستەوخۆ لە لایەن سەرۆکی خێڵەوە بەڕێوە دەچوون. بن خیوەتی سەرۆك لە یەك کاتدا دادگا و مەجلیسی پیران و دیوەخانەش بوو [١١].

لە خێڵە گەورەکاندا دەسەڵاتی باڵا بە میرات بوو و لەنێو خانەوادەی بەگزادەی فەرمانڕەوادا دەگواسترایەوە. خێڵەکان لەنێو میرنشینانی ئەردەڵان و باباندا سەربە بنەماڵە ئیلیتەکانی بەگزادە بوون بەهەموو جیاوازییەکانی نێوانیان لەڕووی ژمارە و لق و پۆپەکانیانەوە: هەم جافەکان، گەورەترین و بەهێزترین خێڵەکانی کوردستانی خوارووی ڕۆژهەڵات، هەم هەمەوەندەکانیش کە تەنانەت لە ڕۆژگارەکانی سەروەریشیاندا ژمارەیان لە هەزار و پێنجسەد کەس تێنەدەپەڕی[12]. لە چوارچێوەی خانەوادەی بەگزادەدا، کە هەندێ جار بە "شاهانە" ناوزەد دەکرا[13]، گۆڕین و بەشینەوەی دەسەڵاتی باڵا لەنێو کۆمەڵەی خێڵەتیدا ڕوویداوە، هەروەهاش گۆڕینە بنەماڵەییەکان هەرگیز بەبێ دەوری لق و پۆپە خێڵەتییەکان نەبووە. پلەی بەرزی "نیمچە شاهانە" بەناو هەموو خانەوادەی بەگزادەدا بڵاو بووبووەوە. دەوری سەرباشقەی بەگزادە لەناو خێڵدا، هەروەکو دەسەڵاتی میر لە میرنشینیی کوردیدا، لەسەر هەمان نەخشەی "خودا پێداوی" و پلەی باڵای قسە لێ نەکراو، بووبوو بە ڕاستییەك لەناو هوشیاریی کۆمەڵایەتیدا.

ئەندامی خانەوادەی بەگ ژنخوازیی لەگەڵ خەڵکی خێڵ نەدەکرد و، هەروەکو فەرمانڕەوایانی میرنشینی، بانگەشەی گینیالۆگیای تایبەت و ڕەچەڵەکی "بێگانە"ی دەکرد. لە شەجەرەی بنەماڵەی بەگزادەی جاف وەچەی محەمەد پەیامبەر دەدۆزینەوە ؛ لەم ڕووەوە س. ج. ئێدمۆندس خێڵی جاف، کە خانەوادەی ئەریستۆکراتیی هەبوو، بە خێڵێکی کوردیی ئاسایی تیپی کلاسیکی ناو دەبات. گەلێ لە بنەماڵە نەجیبزادە خێڵەتییەکانی تریش بانگەشەی ڕەچەڵەکی "بێگانە"یان کردووە[14]. وەکو لە "شەرەفنامە"دا هاتووە، سەرانی خێڵەکانی میرداسی، سولەیمانی، سوەیدی هەمان ئەم جۆرە بانگەشەیان کردووە[15]. بەڵام لەم بانگەشەیەی ئەمانەدا ڕازاندنەوەیەکی ئایینیشی تیا هەبووە. لەم ڕووەوە، پڕبایەخترین (بەبێ تێکەڵکردنی ئایین و شتی تر) بانگەشەی بنەماڵەی سەرکردەی خێڵی دومبوولییە- خۆیان دەبەنەوە سەر عەرەبێکی سووریی، تەنانەت، بێ ڕەچەڵەکی نەجیبزادەییش[16].

باوەڕ بە خزمایەتیی خوێن لە نێو هەموو ئەندامانی خێڵدا، با ئەو باوەڕە دروستکراو و لە ڕەوشێکی کۆمەڵایەتی- سیاسیی کۆنترەوە هاتبێت، بوو بە پاشخانێکی ئایدیۆلۆگی بۆ یەکێتیی خێڵەتی، هێز و کاریگەریی ئەم ئینستیتووتە ئایدیۆلۆگییە لەسەر کۆچەریی کوردی بێ وێنە بوو و ئەم خەیاڵە بەرژەوەندیی هاوبەشی سەران و ئەندامانی خێڵی پاراست. لێکدابڕانی کۆمەڵایەتی، کە خۆی لە بانگەشەی خانەوادە فەرمانڕەواکان بۆ ڕەچەڵەکی "بێگانە" دا دەردەبڕی، دەستدرێژیی کردە سەر پیرۆزترین بنیادی خێڵەتی- مەبەست باوەڕی خزمایەتییە.

چیرۆکەکانی ڕەچەڵەکی " بێگانە"ی خانەوادە بەهێزەکانی کوردستان بەڵگەی ئەوەیە کە بیرۆکەی یەکێتیی خێڵەتی لەنێو پرۆسەی جیابوونەوە و لێکدابڕانی کۆمەڵایەتیدا توایەوە و لەجیاتی بیرۆکەی پەرشوبڵاویی سەرەتایی و تێکەڵ بەیەك نەبوونی گرووپەی کۆمەڵایەتی جێگەی گرتەوە کە تیایدا بنەماڵەی بەگزادە دەسەڵاتی سیاسی و ئابووریی گرتەدەست لە پاڵ خەڵك و ئەندامانی خێڵی خۆی، کە لەڕاستیدا نەدەکرا ئاواش ناویان بنێن. سەرۆکی خێڵ پشتی دەبەست زێتر بە پاسەوانانی خۆیی[17] کە هێزی ڕاستەقینە بوون، نەك بە بیرۆکەی ڕەچەڵەکی هاوبەش.

ئێلیتی خێڵەتی توێژێکی کۆمەڵایەتیی تایبەت بوو کە تەواو دابڕاو بوو لە بەشەکانی تری خێڵەوە. دەزگای خێڵەتی وەکو بەشێکی کۆمەڵگای کوردی لەنێو بنیادی فیۆدالیدا و توخمێکی کارای بوو، نەك بڵێی پاشماوەی قۆناغەکانی بێچینایەتیی مێژووی هەرە کۆنی کورد- ئەگەرچی ئەم بیرۆکەی دوایی زۆریش بەربڵاوە. خێڵە کوردییە گەورەکان و یەکێتییە خێڵەتییەکان پێکهاتەی کۆمەڵایەتی- سیاسیی بوون و لە ئەنجامیشدا دەرکەوت کە پلەی یەکەم بۆ واقیعی پەرشوبڵاوی و دابەشبوونی خێڵە بەسەر دوو توخم – یەکێکیان خاوەن مافی سەرەتایی و قسەلێ نەکراوی حوکمڕانیی بەسەر ئەوەی ترەوە هەیە، نەك بڵێی بۆ بیرۆکەی خەیاڵ ئامێزی ڕەچەڵەکی هاوبەش.

بەم جۆرە، بردنەوەی بانگەشەی ڕەچەڵەکی "بێگانە"ی خانەوادە فەرمانڕەواکانی کوردستان بۆ فاکتەکانی مێژووی ئێتنیکی و کۆمەلأیەتیی میللەتی کورد دروستکراو و بێ بەڵگەیە. سەرلەبەری ئەم جۆرە بانگەشەیە دەچێتەوە سەر پەیوەندییەکانی کۆمەلأیەتی– چینایەتی.

دەتوانین چیرۆکەکانی ڕەچەڵەکی "بێگانە"ی خانەوادە نەجیبزادەکان وەکو نیشانەیەکی لێك جیابوونەوەی چینەکان تەماشا بکەین — لەناو خێڵ و هەروەهاش لە دەرەوەی خێڵدا.

**پەراوێز**

1- Шараф-Хан ибн Шамсаддин Бидлиси.Шараф-наме.переводб, предсловие и приложение Е.И. Васильеиой. Т.1.М.1967б с.
.167,175,220,247,322,406 شـەرەفنامە ( شـەرەفخان ئـیبن شەمسـەدین بەدلیسـی
وەرگێڕان، پێشەکی و پەراوێز ئی. ی. ڤاسیلییەڤا. بەرگی ١، مۆسکۆ ١٩٦٧ ، لاپەڕە– ١٦٧، ١٧٥ ، ٢٢٠، ٢٤٧، ٣٢٢، ٤٠٦ )

٢– هەمان سەرچاوە، ل Там же, с. 232,274,290,30

3- Mardukh Abdullah.Contribution a l'etude de l'Histoire des Kurdes sous la dynastie Ardalan du XVI sie'cle au XIX sie'cle. These de doctorat. P. 1988, p.178

4- См. Г.Б. Акопов. Арабские источники по этнической истории курдов и версии их арабского происхождения.- Страны и народы Ближнего и среднего Востока. III. Арабские Страны. Ериван.1967 с.193 -196
( گ. ب. ئاکۆپۆف. سەرچاوەی عەرەبی دەربارەی مێژووی ئێتنیکیی کـورد و بیرۆکـەی ڕەچەڵەکی عەرەبییان. " وڵات و میللەتانی ڕۆژهـەڵاتی نزیـك و ناوەڕاسـت" بـەرگی ٣. ئێریڤان ١٩٦٧. ل ١٩٣– ١٩٦)

5- А. И.Перщиц. оседлое и кочевое общество северной Аравии в новое время. Автореф.дис....д-ра ист. Наук. М.1971, с.32-33
(ئـا. ئـی. پێرشـیتس. کۆمـەڵگای نیشـتەجێ و کۆچـەریی عـەرابیا لـە چـەرخی نوێـدا. کورتەنامەی دکتۆرای زانست لە مێژوو. مۆسکۆ ١٩٧١، ل ٣٢–٣٣)

6- А. М.Васильев. История Саудовской Аравии (1745-1973). М., 1982, с. 48, 49
(ئا. م. ڤاسیلییەڤ. مێژووی عـەرابیای سـعوودی ١٧٤٥– ١٩٧٣./ مۆسـکۆ ١٩٨٢، ل ٤٨ و ٤٩)

7- А. М. Ментешашвили. Кнрды. Очерки общественно-экономических отношений , культуры и быта. М.,1984, с. 61,104/
(ئا. م. مێتەشێشڤیلی. کوردەکان. کورتەیەکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی– ئـابووریی، کولتوور و ژیاریان. مۆسکۆ ١٩٨٤، ل٦١، ١٠٤)

8- Qhassemlou Abdul Rahman. Kurdistan and Kurds. Prague,1965, P.106

9- Cl. J. Rich. Narrative of a residence in Koordistan and on the site of ancient Nineveh, with journal of a voyage down the Tigris to Bagdad and an account of visit to Shirauz and Persepolis.Vol.1,p. 150-151

10- Баязиди Мела Махмуд.Нравы и обычаи курдов. Перевод, предисловие и примичания М. Б.Рудерко. Мю 1963, с.42-43

(بایزیدی مەلا مەحموود. داب و نەریتەکانی کوردان. وەرگێڕان، پێشەکی و پەراوێز م. ب. ڕودینکۆ. مۆسکۆ ١٩٦٣، ل ٤٢-٤٣)

11- Х. Абовян. Курды. Полное собрание сочинений в 8 томах. Т.8 с. 360-361.

(خ. ئابۆڤیان. کوردەکان. تەواوی بەرهەمەکانی لە ٨ بەرگدا/ . بەرگی ٨، ل٣٦٠- ٣٦١)

12- F. Barth. Principles of social organization in Southern Kurdistan. Universitetes Etnografiska Museum Bulletin, N7. Oslo 1953,p.45

13- Ibid.p.36; Van Bruinssen M. M.- Agha, Shaikh and State. On the social and political organization of Kurdistan. Utrecht, 1978,p.80

14- C. J. Edmonds.Kurds Turks and Arabs. Politics, travel and research in North- eastern Iraq 1919- 1925. L.,1957, p.145, 146

15- Шараф- Наме , Т.1, с.232, 313, 304.(شەرەفنامە، بەرگی ١، ل

16- Там же , с. 357هەمان سەرچاوە، ل

17- Barth , p. 39

ئەم بابەتە بە زمانی ڕووسی بڵاوکراوەتەوە لە :

Pismennie pamitniki I Problemi Istori Kulturi Narodof Vostoka, XXIV, M, 1991

(سەرچاوەی نووسراوی کۆن و گرفتەکانی مێژووی کولتووری میللەتانی ڕۆژهەڵات، بەرگی ٢٤، مۆسکۆ ١٩٩١)

# بارودۆخی سیاسیی ئێران[1]
# لە نێوان ساڵانی (١٥٢٤ - ١٥٨٧ز)

م.ی. مستەفا محەمەد کەریم

زانکۆی سەلاحەددین / کۆلێژی ئەدەبیات — بەشی مێژوو

## پێشەکی

سەردەمی سەفەوی بەیەکێك لە گرنگترین و کاریگەرترین ماوە لە مێژووی ئێران دادەنرێت، کە کاریگەریی قووڵ و گرنگی مەعنەوی لە فەرهەنگی ئێراندا بەجێ هێشتووە، بە تایبەتی دەرکەوتنی دەوڵەتێکی شیعەگەرایی لەسەر شانۆی سیاسیی وڵاتێکی پان و بەرین وەك گەورەترین رووداوی مێژوویی و سیاسیی ئەم وڵاتە هەژمار دەکرێت، بەدیارکەوتنی ئەم دەوڵەتە لەسەر شانۆی سیاسیی ئێراندا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زریانە بەهێزەی کە قزڵباشەکان لە دوای خۆیاندا هەڵیانکرد، یەکێك لە گەورەترین رووداوە مێژوویی و سیاسییەکانی مێژووی دوور و درێژی وڵاتی ئێرانە، کە پێویستە زۆر بە وردی بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوەیەکی بابەتییانە.

سەبارەت بە توێژینەوەکە (بارودۆخی سیاسیی ئێران لە نێوان ساڵانی ١٥٢٤ —١٥٨٧ز) گرنگییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم قۆناغە مێژووییەی ئێران، کە بە بەشێکی گرنگی مێژووی رۆژهەڵات هەژماردەکرێت. بێ گومان شا تەهماسبی یەکەم (١٥٢٤ — ١٥٧٦) توانی دەسەڵاتێکی بەهێز لە ئێرانی ئاڵۆز و پەشۆکاوی دوای مردنی شا ئیسماعیلی سەفەوی دابمەزرێنێت، بە درێژایی زیاتر لە نیو سەدە تێکۆشانی بەردەوام و هەوڵ و تەقەللایەکی زۆر، وێڕای سەقامگیرکردنی دەسەڵات و دابینکردنی ئارامی و ئەمنیەت و یەکێتیی جوگرافیایی و چەسپاندنی بیروباوەڕی (شیعەگەرایی دەمارگرژانە) تەنانەت هەندێ جاریش سنووری فەرمانڕەوایەتی بەرفراوانتر بکات و هەوڵی ئەوەش بدات پارێزگاری لە یەکێتی سیاسیی وڵات بکات، پاش ئەوەی هەوڵەکانی چڕ کردەوە بۆ زاڵبوون بەسەر هەموو کێشە

ناوخۆییەکانی وڵات و هەروەها توانی ئێران رزگار بکات لە پەلامارەکانی هەریەکە لە دەوڵەتی عوسمانی و ئۆزبەکەکان، بەمەش نیو سەدە پارێزگاری لە دەوڵەتی سەفەوی کرد و توانی لەسەر پێی خۆی رابیگرێت و دووری بخاتەوە لە لاوازی و دارمان. هەرچەندە لە دوای مردنی شا تەهماسبی یەکەم بارودۆخی سیاسیی ئێران جارێکی دیکە بەرەو پشێوی و ئاڵۆزی هەنگاو دەنێت، بە تایبەت لە نێوان ساڵانی (١٥٧٦–١٥٨٧)، چونکە جارێکی دیکە باڵادەستبوونی سەرانی قزلباش سەر هەڵدەداتەوە، لەگەڵ دروستبوونی ململانێی توندی نێوان نەوەکانی شا تەهماسب، بە مەبەستی قۆرخکردنی دەسەلات، کە تێیدا سەرانی قزلباش و حەریمەکانی شا رۆڵی سەرەکی دەگێڕن.

## تەوەری یەکەم

## فەرمانڕەوایەتی و باڵادەستبوونی قزلباشەکان (١٥٢٤ – ١٥٣٣):

دوا بە دوای مردنی شا ئیسماعیلی یەکەم (١٥٠١–١٥٢٤) کوڕە گەورەکەی بە ناوی شا تەهماسبی یەکەم هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی لە ئێراندا، لە تەمەنی دە ساڵیدا، نزیکەی پەنجاو دوو ساڵ و نیو فەرمانڕەوای ئێران بووە[٢]، ئەم ماوەیەش پڕە لە رووبەڕووبوونەوە و کێشمەکێشمی ناوخۆیی لە لایەن سەرۆك هۆزەکان، کە چاویان بڕیبووە دەرباری سەفەوی[٣]، هەروەها مەترسییەکانی دەرەوە کە خۆی لە هێرشەکانی ئۆزبەکەکان[٤] لە رۆژهەلات و دەوڵەتی عوسمانی لە رۆژئاوا دەبینییەوە [٥].

تەمەن بچووکیی شا تەهماسب لەو کاتەی وەك شای ئێران جڵەوی دەسەلاتی گرتەدەست، بووە هۆکارێك کە زۆرێك لە سەرکردە و سەرۆك هۆزەکان و پیاوماقووڵانی وڵات چاو ببڕنە دەرباری سەفەوی، بە مەبەستی پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییەکانیان[٦]، ئەوەش بارودۆخەکەی زیاتر قووڵ کردەوە، چونکە سەرهەڵدانی ناکۆکی و ململانێی توندی لێ کەوتەوە لە نێوان سەرۆك هۆزە قزلباشەکان بە مەبەستی چاودێری و سەرپەرشتیکردنی شا تەهماسبی تەمەن دە ساڵان، زیاتر لە نێوان هەردوو هۆزی ئۆستاجلو و تەکەلو تیژ ببۆوە[٧].

له‌م بارودۆخه‌دا ده‌سه‌ڵاتی شا ته‌هماسبی یه‌که‌م بۆ ماوه‌ی ده‌ ساڵان قۆرخ کرا له‌ لایه‌ن سه‌رکرده‌ قزلباشه‌کان، له‌و باره‌یه‌وه‌ دێو سوڵتان سه‌رۆك هۆزی رۆملۆ بانگهێشتی ژماره‌یه‌کی زۆر له‌ سه‌رۆك هۆزه‌کان به‌ مه‌به‌ستی ئاشکراکردن و نیشاندانی وه‌سیه‌تنامه‌ی شا ئیسماعیلی یه‌که‌م، به‌گوێره‌ی ناوه‌رۆکی وه‌سیه‌تنامه‌که‌ ماف درابوو به‌ دێو سوڵتان، ئه‌رکی چاودێری و سه‌رپه‌رشتیکردنی (شا) ی بچووك بگرێته‌ ئه‌ستۆ و له‌ هه‌مان کاتیشدا وه‌ك فه‌رمانده‌ی گشتیی هێزه‌ چه‌کداره‌کان ده‌ستنیشان کرابوو[٨].

بانگهێشته‌کانی دێوسوڵتان بۆ سه‌رپه‌رشتیکردنی شا ته‌هماسب هه‌رزوو له‌ لایه‌ن کۆپه‌ك سوڵتانی ئۆستاجلو ره‌ت کرایه‌وه‌ و به‌ره‌نگاری وه‌ستا، له‌ ئاکامدا هه‌ریه‌که‌ له‌ (نائیب سه‌ڵته‌نه‌ت) به‌ یارمه‌تی چوهاسوڵتانی ته‌که‌لو توانییان له‌ شه‌ڕێکدا له‌ساڵی (١٥٢٦) نزیك سوڵتانییه‌ی ئازه‌ربایجان شکست به‌ هێزی کۆپه‌ك سوڵتانی ئۆستاجلو بهێنن[٩]، پاشه‌کشه‌یان پێبکه‌ن بۆ گه‌یلان، ساڵی دواتر هێزه‌کانی ئۆستاجلو توانییان هێرش بکه‌نه‌ سه‌ر ئه‌رده‌بیل و دوای کوژرانی (بادنجان) فه‌رمانڕه‌وای شاره‌که‌، که‌ سه‌ر به‌ هۆزی رۆملۆ بوو شاره‌که‌یان داگیر کرد[١٠]، ئه‌مه‌ش کێشه‌ و ململانێیه‌که‌ی زیاتر قووڵ کرده‌وه‌ و شه‌ڕه‌که‌ی زیاتر درێژ کرده‌وه‌، تاکو روودانی شه‌ڕێك له‌ ناوچه‌ی (شه‌ڕوور)، که‌ تێدا ئۆستاجلویه‌کان شکستیان خوارد و کۆپه‌ك سوڵتانیش کوژرا[١١].

به‌ کوژرانی کۆپه‌ك سوڵتان به‌هێزترین ڕکابه‌ر له‌ گۆڕه‌پانی ململانێیه‌کان کۆتایی پێهات، به‌ڵام زاڵبوونی به‌رژه‌وه‌ندییه‌ تایبه‌تییه‌کان به‌سه‌ر که‌سایه‌تی سه‌رۆك هۆزه‌ قزلباشه‌کان دووباره‌ دۆستایه‌تیی نێوانیانی تێکدا، به‌ تایبه‌تی نێوان دێو سوڵتانی رۆملۆ و چوها سوڵتانی ته‌که‌لو، سه‌ره‌ڕای بوونی په‌یوه‌ندییان دژ به‌ کۆپه‌ك سوڵتانی ئۆستاجلو، به‌ڵام دواتر چوهاسوڵتان ده‌توانێت باوه‌ڕ به‌ شا ته‌هماسبی یه‌که‌م بێنێت، که‌ هۆکاری ململانێ و دروستبوونی ناکۆکییه‌کان له‌ نێو سه‌رانی قزلباش به‌ پله‌ی یه‌که‌م ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ دێو سوڵتان و پێشنیازی له‌ناوبردنی دێو سوڵتانی بۆ شا ته‌هماسبی یه‌که‌م کرد[١٢]، وه‌ك چاره‌سه‌ر بۆ نه‌هێشتنی کێشه‌کان، سه‌رئه‌نجام دێو سوڵتان له‌ ساڵی (١٥٢٧) به‌ ده‌ستی شا ته‌هماسب به‌ پیلانی چوهاسوڵتان له‌ناوبردرا [١٣].

به‌م شێوه‌یه‌ ڕێگا والاَ بوو بۆ چوهاسوڵتان كه‌ ببێته‌ (نائیب سه‌ڵته‌نه‌ت) به‌بێ ركابه‌ر، به‌ڵام ئه‌م پله‌وپایه‌یه‌ ته‌نها سێ ساڵی خایاند و حه‌ز و ئاره‌زووه‌كانی چوهاسوڵتانی زینده‌به‌چاڵ كرد[١٤]، چونكه‌ له‌ ساڵی (١٥٢٨) ئۆزبه‌كه‌كان توانییان شاری هرات له‌ باكوری رۆژهه‌ڵاتی ئێران گه‌مارۆ بده‌ن، كه‌ ئه‌و كات حوسێن خانی شاملو فه‌رمانڕه‌وای ناوچه‌كه‌ بوو، نه‌نواندنی هیچ هه‌ڵوێستێك له‌ لایه‌ن چوهاسوڵتان له‌ (شه‌ڕی جام)[١٥] به‌رامبه‌ر به‌ ئۆزبه‌كه‌كان و دواتر ساردی نواندن له‌ ناردنی كۆمه‌ك بۆ حوسێن خانی شاملو كه‌ بووه‌ هۆكاری له‌ ده‌ستدانی شاری هرات و داگیركردنی له‌ لایه‌ن ئۆزبه‌كه‌كان ئه‌مه‌ش بووه‌ هۆكارێك بۆ له‌ناوبردنی چوها سوڵتان و كوشتنی به‌ فه‌رمانی شا ته‌هماسبی یه‌كه‌م، كه‌ له‌ لایه‌ن هه‌ریه‌كه‌ له‌ هۆزی شاملو و زولقه‌در جێبه‌جێ كرا، به‌ كوژرانی چوها سوڵتان و دواتر له‌ ساڵی (١٥٣٠) له‌ شه‌ڕێكی یه‌كلاكه‌ره‌وه‌ له‌ نزیك هه‌مه‌دان ته‌كه‌لویه‌كان شكستیان خوارد و به‌مه‌ش له‌ شانۆی سیاسیی ئێران كۆتاییيان هات[١٦].

دوای ئه‌م رووداوه‌ زۆربه‌ی ته‌كه‌لوه‌كان روویان له‌ به‌غداد كرد، چونكه‌ حاكمی ئه‌و كاتی به‌غداد له‌ ته‌كه‌لوه‌كان بوو، هیچ هه‌ڵوێستێكی نه‌نواند به‌رامبه‌ر به‌م رووداوه‌، به‌ڵكو ده‌ستی كرد به‌ گه‌ڕاندنه‌وه‌ی ژماره‌یه‌ك له‌ خانه‌واده‌ ته‌كه‌لوه‌كان بۆ ئێران وه‌ك دووپاتكردنه‌وه‌ی وه‌فاداری بۆ شا ته‌هماسبی یه‌كه‌م، به‌شێكی دیكه‌ له‌ خانه‌واده‌كانی ته‌كه‌لو روویان له‌ ناوچه‌كانی ژێر ده‌سه‌ڵاتی ده‌وڵه‌تی عوسمانی كرد، ئه‌م رووداوه‌ش له‌ مێژووی نوێی ئێران به‌ (ئافاتی ته‌كه‌لو)[١٧] ناسراوه‌[١٨].

له‌ دوای كوژرانی چوهاسوڵتان و به‌رزبوونه‌وه‌ی پایه‌ی حوسێن خانی شاملو له‌ ده‌رباری سه‌فه‌وی، له‌ یه‌كه‌مین هه‌نگاوی ده‌ستی كرد، به‌ په‌راوێزكردنی شا ته‌هماسبی یه‌كه‌م له‌ كاروباری حكومه‌ت، ئه‌و كات ته‌مه‌نی شا له‌ نێوان شانزده‌ تاكو حه‌ڤده‌ ساڵان ده‌بوو، به‌ڵام ئه‌م كاره‌ی زۆر درێژه‌ی نه‌كێشا، چونكه‌ شا ته‌هماسبی یه‌كه‌م سنوورێكی بۆ ده‌ست رۆیشتوویی حوسێن خانی شاملو دانا، به‌ تایبه‌ت دوای ئه‌وه‌ی له‌ ڕێگای پیلانێكه‌وه‌ توانی ئه‌میر جه‌عفه‌رساوجی وه‌زیر، كه‌ له‌ كه‌سایه‌تییه‌ خۆشه‌ویست و نزیكه‌كانی شا بوو بكوژێت، له‌ جێگای ئه‌ویش كه‌سێكی نزیكی خۆی دابنێت، هه‌روه‌ها هه‌وڵدانه‌كانی بۆ دانانی سام میرزای برای شا بۆ ته‌ختی ده‌سه‌ڵاتی سه‌فه‌وی[١٩].

لەلایەکی دیکەوە تۆمەتی هەڵگەڕانەوەی دژ بە دەوڵەتی درایە پاڵ و بە پاڵپشتیکەری دوژمنانی دەوڵەت لە قەڵەمیان دا، هەموو ئەو کارانەی حوسێن خان بوونە هۆکار، کە متمانەی خۆی لای شا تەهماسبی یەکەم لەدەست بدات، بە شێوەیەك شا تەهماسب گەیشتە ئەو باوەڕەی کە حوسێن خانی شاملو دەیەوێت رابکاتە ژێر رکێفی دەوڵەتی عوسمانی و لەوێشەوە هانیان بدات بۆ پەلاماردانی ئێران[٢٠]، بۆیە شا تەهماسب لە ساڵی (١٥٣١) دەستووری کوشتنی دەرکرد، بە کوژرانی حوسێن خانی شاملو نیشانەی کۆتایی هاتنی دە ساڵەی فەرمانڕەوایی قزلباشەکان (١٥٢٤ – ١٥٣٣) و گەڕانەوەی دەسەڵاتی شا بوو بۆ فەرمانڕەواییکردنی ئێران[٢١].

**تەوەری دووەم**

**شا تەهماسبی یەکەم و مەترسییەکانی دەرەوە:**

**أ– دەوڵەتی عوسمانی:**

شا تەهماسبی یەکەم سەرقاڵییەکانی سوڵتان سلێمان قانوونی(١٥٢٠ – ١٥٦٦) لەساڵی (١٥٢٩) بەگەمارۆی ڤییەننا قۆستەوە و لە رێگای هێزێکەوە هێرشی کردە سەر تەورێز و دەستی بەسەردا گرت، ئولامە تەکەلوی فەرمانڕەوای شارەکە رایکردە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، دواتر ئەم هێزەی سەفەوی رێچکەی گرتەبەر بەرەو بەغدا و لە ساڵی (١٥٣٠) دەستی بەسەردا گرت و محەمەد خانی تەکەلو وەك والیی بەغدا لە لایەن دەوڵەتی سەفەوی دانرا[٢٢].

دوا بەدوای داگیرکردنی بەغدا لە لایەن سەفەوییەکان کە لەژێر دەسەڵاتی زولفەقار خانی کوردی سەرۆك هۆزی کەلهوڕ سەربەدەسەڵاتی عوسمانی[٢٣]، بووە هۆکاری دەستپێکی ململانەیەکی توند جارێکی دیکە لەسەر عێراق لە نێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی، بەتایبەتی دوای کوژرانی زولفەقار خانی کوردی لە لایەن براکانی بە پیلانی شا تەهماسبی یەکەم[٢٤]، ئەم رووداوەش کاریگەریی زۆری کردە سەر سوڵتان سلێمان قانوونی، چونکە خۆی وا دادەنا کە پارێزەری ناوچە پیرۆزەکانە لە عێراق و لە هەمان کاتدا رۆڵی دەرباری عوسمانی لە هاندانی سوڵتان سلێمان و باسکردنی رۆڵی باوکی لە

ڕووبەڕووبوونەوەکانی بەرامبەر بە ئێرانییەکان[٢٥]، لەلایەکی دیکەوە شا تەهماسبی یەکەم کە لە ساڵی (١٥٢٤) وەك (شـا) ی ئێران دەسەڵاتی گرتـە دەست، ڕەتـی کردەوە کـە دان بنێت بـە دەسـەڵاتی سـوڵتان سـلێمان قـانوونی وەك خەلیفـەی موسڵمانان، هەروەها داگیرکردنـی (بەغـدا)ش لەلایـەن سـەفەوییەکان بەهانەیـەکی باشی دایە دەست سوڵتانی عوسمانی کە هێرش بکاتە سەر ئێران[٢٦].

هێزەکانی عوسمـانی وەك کاردانەوەیـەك بەرامبـەر بەسـەفەوییەکان لەسـاڵی (١٥٣٣) هێرشیان کردە سـەر ئازەربایجـان لـە ڕێگـای یارمـەتی و هانـدانی ئولامـە تەکەلوی حاکمی ئازەربایجان کە یەکێ لە گەورە سەرکردەکانی قزلباش بـوو، ئـەو کات لە شا تەهماسبی یەکـەم یـاخی ببـوو، پـەنای بردبـووە لای سـوڵتان سـلێمان قانوونی[٢٧]، لەو هەلومەرجەدا تـوانی هەریەکـە لـە (ئیـبراهیم پاشـا)[٢٨]ی سـەدری ئەعزەم و سـوڵتان سـلێمان قـانوونی ڕازی بکـات لەسـەر پـەلاماردانی ئێـران، ئـەم لەشکرکێشییەش بەناو خاکی کوردستاندا گوزەری کرد و دواتر هێرشی کردە سـەر ئازەربایجان، بەڵام ناکرێت ڕۆڵی ئولامە سوڵتانی تەکەلو پشتگوێ بخرێت کـە وەك چاوساغێك و یارمەتییەکانی توانرا پایتەختی دەوڵەتی سەفەوی داگـیر بکرێـت[٢٩]، بێ گومان هەڵگەڕانەوەی ئولامە تەکەلو و چوونە ژێـر ڕکێفـی دەوڵـەتی عوسمـانی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەڵوێستە توندەی شـا تەهماسبی یەکـەم کـە لـە سـاڵی (١٥٣٠) بەرامبـەر بـە خێڵـی تەکـەلو ئـەنجامی دابـوو، هـەروەها دەکرێـت پاڵنـەری بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی ئولامە تەکەلو بۆ وەرگرتنی پۆسـتی بـاڵا لـە جێگـای چوهاسوڵتان وەك هۆکارێکی دیکە هەژمار بکرێت بۆ ئەو یاخیبوونە[٣٠].

لە کاتی دەستپێکردنی پێشڕەوییەکانی سـوپای عوسمـانی بـۆ ئازەربایجـان، شا تەهماسبی یەکەم لە بـەرەی ڕۆژهـەڵات لـەدژی ئۆزبەکـەکان دەجـەنگا،، بـەڵام گەیشــتنی هــەواڵی پێشــڕەویی عوسمانییــەکان جــارێکی دیکــە بــووە هــۆی درێژکردنـەوەی هەڕەشـەی ئۆزبەکـەکان لـە ڕۆژهـەڵات تـاکو مردنـی (عوبەیـدوللا خان)[٣١]ی ڕێبەری ئۆزبەکی لە ساڵی ١٥٤٠ز[٣٢].

سوڵتان سلێمان قانوونی لە ساڵی ١٥٣٤ز بۆ جێگیرکردنی ئەم سەرکەوتنە بە هێزێکـی گـەورەوە بـەناو کوردسـتاندا ڕووی کـردە تـەورێز و لەوێشـەوە بـە هـۆی نالەباریی کەش و هەوا و سەختیی زستان و کەمیی ئازووقە تـەورێزی چـۆڵ کـرد و

گەڕایەوە هەمەدان، دواتر دووبارە بە کوردستاندا گوزەری کرد و رووی کردە بەغدا[٣٣]، پاش نزیکبوونەوەی لە بەغدا ترس و دڵەڕاوکێ لە نێو سەفەوییەکان بلأو ببۆوە، بەبێ بەرگرییەکی ئەوتۆ سولتان سلێمان قانوونی چووە نێو بەغدا و داگیری کرد، ئەوەی زانراوە کە سولتانی عوسمانی رێگەی بە تالآنکاری و ئازاردانی خەلك نەداوە[٣٤]، لە دوای گەیشتنی هەواڵی لەشکرکێشییەکەی عوسمانی بۆ ئازەربایجان، شا تەهماسبی یەکەم بریاری وەستاندنی هێرشەکانی بۆ سەر مۆلگەکانی ئۆزبەك راگەیاند، پاشان گەڕایەوە بەرەو ئازەربایجان بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای عوسمانی و دانانی سنوورێك بۆ هێرشەکەیان، بەلأم تەورێز لە لایەن سوپای عوسمانی چۆڵ کرابوو[٣٥]، هەر بۆیەش شا تەهماسبی یەکەم لە بڕیارێکی بوێرانە پایتەختی دەوڵەتی سەفەوی لە تەورێز گواستەوە بۆ قەزوین[٣٦].

هێزەکانی سەفەوی لە ساڵی (١٥٣٨) بەردەوام لەرووبەڕووبوونەوەدا بوون لەگەڵ پاشماوەی هێزەکانی عوسمانی لە سەرووی هەمووشیانەوە ئولامە تەکەلو، کە رووی کردبووە قەلأی وان ئەمەش جارێکی دیکە بەهانەی دایە دەست سولتان سلێمان قانوونی لە ساڵی (١٥٣٨) هێرش بکاتە سەر ئازەربایجان[٣٧]، چونکە هێزەکانی سەفەوی لە پێشڕەویدا بوون و تەنانەت توانییان قەلأی شێروانە گەمارۆ بدەن، لە ئاکامی بەگژداچوونی هەردوو سوپا لە نزیك گوندی (دمە) لە ناوچەی درگزین[٣٨]، سوپای عوسمانی تووشی شکست هات، بە تایبەتی دوای ئەوەی میر سولتان رۆملو توانی زەبرێکی کوشندە لە هێزەکانی عوسمانی بدات، هاوکات (سینان پاشا) ی فەرماندەی هێزی عوسمانی بەدیل بگرێت، ئەم رووداوە بووە هۆکارێك، کە سولتانی عوسمانی پێشڕەوی هێزەکانی، سەرەڕای توندیی شەڕەکان بۆ ناو قووڵایی خاکی ئێران رابگرێت[٣٩].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە سولتان سلێمان قانوونی لە شەڕە یەك لە دوا یەکەکانی ئێران، نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك سەرەڕای ئەو راستییە حاشاهەڵنەگرە سەبارەت بەسولتان سلێمان کە چەندین سەرکەوتنی لە بەرەی رۆژئاوا تۆمار کردبوو، بەلأم پەیڕەوکردنی سیاسەتی پاشەکشێی سوپا و ئەنجامدانی جەنگی ئیستفزازی لە لایەن شا تەهماسبی یەکەمەوە هۆکار بوون بۆ یەکلانەبوونەوەی جەنگەکە.

پەیوەندیی نێوان دەوڵەتی سەفەوی و دەوڵەتی عوسمانی ڕۆژ بە ڕۆژ لەگرژی و ئاڵۆزیدا بوو، تا ئەو کاتەی (ئەلقاس میرزا)[٤٠]ی برای شا تەهماسبی یەکەم یاخیبوونی خۆی ڕاگەیاند، دژ بە دەسەڵاتی براکەی، کە ئەو کات حاکمی شێروانە بوو[٤١]، دیارە ئەم ڕووداوە ڕەوشەکەی نێوان هەردوو دەوڵەتی زیاتر ئاڵۆزتر کرد، هەرچەندە سەرکردەکانی قزلباش هەوڵێکی زۆریان دا بۆ باشکردن و هێورکردنەوەی ئاڵۆزییەکانی نێوان شا تەهماسبی یەکەم و ئەلقاس میرزای برای، بەڵام نەگەیشتنە هیچ چارەسەرێك، هەربۆیە شا تەهماسبی یەکەم بڕیاری ڕەوانەکردنی هێزێکی گەورەی دا بۆ شێروانە بە مەبەستی دامرکاندنەوەی یاخیبوونی ئەلقاس میرزا[٤٢]، لەبەرامبەر ئەم کارەی شا تەهماسب، ئەلقاس میرزا کاردانەوەیەکی توندی وەرگرت و پەنای بردە بەر دەوڵەتی عوسمانی و لەوێشەوە دەستیکرد بەهاندانی سوڵتان سلێمان قانوونی بۆ هێرشکردنە سەر ئێران[٤٣].

سەرەڕای هەموو ئەو بەربەستانەی کە شا تەهماسبی یەکەم لە بەرامبەر لەشکرکێشییەکەی سوپای عوسمانی دایانابوو وەك پەیڕەوکردنی سیاسەتی زەوی سووتاندن و تێکدانی هەموو کەناڵ و سەرچاوە ئاوییەکان، سوپای عوسمانی لە ساڵی (١٥٤٨) جارێکی دیکە لەشکرکێشی کردە سەر ئێران و تەورێزی داگیرکرد[٤٤]، لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا سوپای عوسمانی نەیتوانی پارێزگاری لە شارەکە بکات، بە هۆی کەمیی ئازووقەو ئەو هێرشە لەناکاوانەی سوپای سەفەوی کە دەکرایە سەریان، وای لە سوڵتان سلێمان قانوونی کرد تەورێز جێبهێڵێت و پاشەکشە بکات بەرەو دیاربەکر[٤٥].

سوڵتان سلێمان قانوونی گەیشتە ئەو باوەڕەی کە قسەکانی ئەلقاس میرزا پووچەڵ و بێ ناوەرۆکە، بە تایبەت دەربارەی یارمەتییەکانی خەڵکی ئێران بۆ ئەلقاس میرزا و سوپای عوسمانی دژ بە شا تەهماسبی یەکەم، بۆیە سوڵتانی عوسمانی داوای لە ئەلقاس میرزا کرد پێویستە ڕووبەڕووی ئەو هێزە (سەفەوی)یە ببێتەوە کە لەکاتی پاشەکشێی سوپای عوسمانی هەوڵەکانیان چڕ دەکەنەوە بۆ پەلاماردانی هێزەکانی عوسمانی، بەڵام ئەم داوایە، ئەلقاس میرزای خستە ناو داوێکی کوشندە[٤٦]، چونکە لەپێشڕەوییەکانی ئەلقاس میرزا بۆ ناوەوەی ئێران بە تایبەتی بۆ قوم و لەوێشەوە بەرەو کاشان[٤٧] و ئەسفەهان خەڵکەکە دەرگایان

لەسەر داخست و دواتر هەوڵی دا بچێتە شیراز، بەڵام بێ ئومێد بوو لە راکێشانی سەرنجی خەڵك[٤٨] لەئاکامدا لە خوزستانەوە رووی کردە بەغدا لەوێش وەدەرنرا، بۆیە بە ناچاری رووی کردە کوردستان و پەنای بردە لای سرخاب بێگ کوڕی مەئموون بێگی یەکەم لە قەڵای مەریوان، لەوێشەوە وەك دەستبەسەرکراوێك رادەستی شا تەهماسبی یەکەم کرایەوە [٤٩].

دوای رادەستکردنەوەی ئەلقاس میرزا، لە لایەن شا تەهماسبی یەکەم سەرکۆنە کرا، بەڵام لە گیانی خۆش بوو تەنها زیندانی کرد لە قەڵای دوورە دەستی (قەهقەهە)[٥٠]، پاشان ئەلقاس میرزا لەو قەڵایە لە لایەن دوو پاسەوانی زیندانەکە دەکوژرێت، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ وەرگرتنەوەی تۆڵەی خوێنی باوکیان کە لەسەر دەستی ئەلقاس میرزا کوژرابوو[٥١]، شا تەهماسبی یەکەم، دوای دەستگیرکردنی ئەلقاس میرزا، یەکێ لەکوڕەکانی بەناوی ئیسماعیل، کە دواتر بە (شا ئیسماعیلی دووەم ١٥٧٦ – ١٥٧٧) دەناسرێت، دەکاتە حاکمی شیروانە، لەساڵی ١٥٥١ز چەند هێرشێکی کردە سەر ئەرزەرووم و ئەرمەنستان چەندین ناوچەی داگیرکرد، لەبەرامبەریشدا چەندین پەلاماری سوپای عوسمانی تێکشکاند[٥٢]، ئازایەتی و دلاوەریی (ئیسماعیل) بووە مایەی ئیرەیی باوکی، چونکە (شا) ی سەفەوی لەوە دەترسا ئەو ئازایەتییە و فرەوانخوازییانەی لە داهاتوودا ببێتە هۆکارێك بۆدەستگرتن بەسەر دەرباری سەفەوی، هەربۆیە زوو بڕیاری دەستگیرکردنی بۆ دەرکرد و لە قەڵای (قەهقەهە) زیندانی کرد[٥٣].

لە دواین قۆناغی جەنگی بیست ساڵەدا شا تەهماسب لە چوار قۆڵەوە هێزەکانی خۆی نارده سەر ئاوایی و قەڵاکانی (ئەرجیش)[٥٤] و بارگیری و پاسین و مووش و پەندماهی و (عادلجواز)[٥٥] سەرانسەری ئەو ناوچانەیان لە ئاگر و خوێن نقوم کرد، لەلایەکی دیکەوە بۆدووەمین ساڵ لەسەریەك هەموو ناوچەکانی (وان، ستان، ئامۆك، کواش، ئەلباق، خوشاب)یان تاڵان کرد و ئاگریان لە دانەوێڵە و پووش و پاوانیان بەردا[٥٦]، لە دوای ئەم هێرشانەدا سوڵتان سلێمان قانوونی هێزەکانی عوسمانی ئامادەکرد، بە مەبەستی هێرشکردنە سەر ئێران، لەساڵی (١٥٥٣) گەیشتن بۆ نەخچەوان، دوای ئەوەی شا تەهماسبی یەکەم هەستی کرد سوپای عوسمانی لە توخوبەکانی ئێران نزیك بۆتەوە، بڕیاری دا باڵوێزی خۆی

بەناوی (فەرخ زادە) بە مەبەستی بەستنی پەیماننامەی ئاشتی بنێرێتە دەرباری عوسمانی، لەبەرامبەردا سولّتان سلێمان قانوونی بە پێشنیازەکەی شا تەهماسبی یەکەم قایل دەبێت و پەیماننامەی ئاشتی (ئاماسیا)[٥٧] لەسالّی ١٥٥٥ز لە نێوان هەردوولادا بەسترا[٥٨].

پەیماننامەی ئەماسیا کە لە سالّی ١٥٥٥ز مۆرکرا لە نێوان هەردوو دەولّەت، بووە هۆکارێك بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی لە نێوانیان، لەمیانەی مۆرکردنی ئەو رێکەوتننامەیە ئێرانییەکان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە گرتنی بەغداد و گەڕانەوەی بۆ ژێر دەسەلآتی سەفەوی کارێکی ئەستەمە و لە بەرامبەریشدا سولّتان سلێمان قانوونی گەیشتە ئەو بڕوایەی لەشکرکێشییەکانی بۆ ناو خاکی ئێران بە هیچ جۆرێك ناتوانێت جێ پێی خۆی لەم ولآتەدا قایم بکات، هەر بۆیەش هەردوو لایەنی ناکۆك بڕیاری بەستنی پەیماننامەی ئاشتییان قبوولّ کرد[٥٩]، کە بووە هۆکارێك بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی لە نێوان هەردوو دەولّەت، تاکو مردنی شا تەهماسبی یەکەم لە سالّی ١٥٧٦ز[٦٠].

بەگوێرەی رێکەوتننامەی ئەماسیا کە خۆی لە چەند بەندێکی کەم دەبینێتەوە و بەپێی تەرازووی هێزەکانی هەردوولا ئەرمەنستان و گورجستان و کوردستان و بەشێکی عەرەبستان بەسەر هەردوو دەولّەتدا دابەش کران و ناوچەی قارس بە بێلایەن و قەلآکانی بەخاپووری بهێلّێرێتەوە، هەردوو لایەنیش بڕیاریان دا کاربەدەستانی سنوور کێشە و ئاژاوە دروست نەکەن و دالّدەی راکردووەکانی یەکتر نەدەن[٦١].

دەکرێت بلّێین بەستنی پەیماننامەی ئاشتیی ئەماسیا پێویستییەکی لە رادەبەدەر بوو بۆ هەردوو ولآت، چونکە ئەم رێکەوتنە بووە مایەی بەرقەرارکردنی ئاشتی لە نێوانیان، لەلایەکی دیکەوە سوودێکی گەورەی هەبوو بۆ هەردوولا، چونکە توانییان لەو ماوەیەی کە ئاشتی بەرقەرارە، بپرژێنە سەر کێشە گەورەکانی ناوخۆ و دەرەوەی ولآتیان.

لە کۆتاییەکانی حوکمڕانیی شا تەهماسبی یەکەم ئێران جۆرە سەقامگیرییەکی سیاسی لە خۆ دەگرێت، کە مێژووی ئێران هیچ کات ئەو پەیوەندییە باشەی نێوان هەردوو دەولّەتی بەخۆوە نەبینیبوو، چونکە لەو

ماوەیەدا ئاڵوگۆڕی شاندەکان و ناردنی نامە و دیاریی بە بەها لە نێوان هەردوو فەرمانڕەوای عوسمانی و سەفەوی لە ئارادا بووە[٦٢]، لەساڵی (١٥٥٦) شاندێکی دەوڵەتی سەفەوی بەسەرکردایەتی ئیسماعیل بێگ چووەتە دەرباری عوسمانی لە ئیستانبوڵ زۆر بەڕێزەوە پێشوازییان لێ کراوە ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە لە سەر نیەت پاکیی هەردوو دەوڵەت و پابەندبوونیان بەڕێکەوتننامەی ئاشتیی ئەماسیا[٦٣].

**ب– ئۆزبەك:**

ململانێ و گرژیی پەیوەندییەکانی نێوان خانەکانی ئۆزبەك و بنەماڵەی سەفەوی لە ئێران مێژوویەکی تاڵ و دوور و درێژی هەیە، کە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی حوکمڕانیی شا ئیسماعیلی یەکەم، چونکە ئەو کات محەمەد شیبك خانی ئۆزبەك دەسەلآتی بەسەر ناوچەیەکی پان و بەرینی لێوارەکانی رووباری جیحۆن و تا دەگەیشتە سنووری ئێران لەسەر هێڵی تەریبی سمنان لە خۆراسان و لە رۆژئاواش تاکو بەدەخشان و لە خوارووش تادەگاتە ناوچەکانی کاخیندار، بەمەش دەرگاکانی رۆژهەلآتی ئێران لەژێر دەسەلآتی خانی ئۆزبەك دابوو[٦٤].

هۆکاری رووبەڕووبوونەوەکانی نێوان هەردوولا زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ کێشەی مەزهەبی، چونکە شا ئیسماعیلی یەکەم لە هەوڵی ئەوەدا بوو، بە زۆر مەزهەبی شیعە بسەپێنێ، لەبەرامبەریشدا خانی ئۆزبەك داوای لێ کردووە واز لە مەزهەبی شیعە بهێنێت و کاری باوك و باپیرانی (دەروێشایەتی) ئەنجام بدات و لە مزگەوتەکانیش وتار بەناوی ئەو بخوێندرێتەوە، هەروەها ناویشی لەسەر پارە و پوول بێت[٦٥]، لەلایەکی دیکەوە خانی ئۆزبەك دەیویست دەسەلآتداریەتی خۆی بەسەر ئێراندا بسەپێنێ، چونکە رۆژانێك خاکی ئێران لەژێر فەرمانڕەوایی باوك و باپیرانیان بووە، محەمەد خانی شەیبانی بەڕەچەڵەك راستەوخۆ دەگەڕێتەوە سەر (جەنگیزخان)[٦٦]ی مەغۆلی[٦٧].

محەمەد خانی شەیبانی دەستی بەچالاکییەکان کرد لەناو خاکی ئێران بەتایبەتی دوای هەڵقۆستنەوەی هەلێکی زێڕین، کاتێك شا ئیسماعیلی یەکەم خەریکی جەنگەکانی بوو لەگەڵ حاکمی شێروان، خانی ئۆزبەك توانی دەست

بگرێت بەسەر کرمان لە ساڵی (١٥٠٧) [٦٨]، سەرەڕای ئەوەش شا ئیسماعیلی یەکەم لە ڕێگای ناردنی نێردراوەکانی داوای لە محەمەد خان کرد کێشەکانیان بەڕێگایەکی ئاشتی چارەسەر بکەن، بەلاّم هەوڵەکان هیچ ئەنجامێکی نەبوو[٦٩].

دەکرێت بڵێین شا ئیسماعیلی یەکەم کەسێکی توند و دڵڕەق بووە بەرامبەر بە نەیار و دوژمنەکانی، بەلاّم بەرامبەر بە خانی ئۆزبەك نەرمی نواند، ڕەنگە هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ تەواو جێگیر نەبوونی پایەی دەسەلاّتی لە تەواوی ئێران.

شا ئیسماعیلی یەکەم لە ساڵی (١٥١٠) بە هێزێکی گەورە ڕێگای گرتەبەر بەرەو خۆراسان بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خانی ئۆزبەك، ئەوەی یارمەتی (شا ئیسماعیلی یەکەمی)دا بریتی بوو لە چەندین هەلگەڕانەوە و شۆڕش دژ بە خانی ئۆزبەك، لەوانە شۆڕشەکانی فەیروز کوە، هەروەها هەلگەڕانەوەی (بیونسز حەسەن) لە حوکمڕانیی محەمەد تەیموور لەنزیك ڕووباری سیحۆن، لەلایەکی دیکەوە زیرەکی و فێڵەکانی شا ئیسماعیلی یەکەم لە تەکنیکی جەنگی توانی هێزەکانی ئۆزبەك بخاتە ناو بۆسەیەکەوە، کە تێیدا زۆرێك لە سەرکردەکانی ئۆزبەك کەوتنە تەڵە و کوژران[٧٠]، لە نێویاندا محەمەد خانی شەیبانی سەرکردە و ڕابەری ئۆزبەکەکان[٧١].

سەبارەت بە محەمەد خانی ئۆزبەکی دوای کوژرانی لە لایەن سەفەوییەکان لە مەیدانی جەنگ، بەناشرینترین شێوە مامەڵە لەگەڵ لاشەکەی کراوە لە لایەن موریدەکانی شا ئیسماعیلی یەکەم، بەشێوەیەك گۆشتەکەیان بە کاڵی خوارد[٧٢]، هەرچەندە کوژرانی محەمەد خانی ئۆزبەك نەبووە، هۆی کۆتاییهێنان بەهەڕەشەکانی ئۆزبەك لە بەرەی ڕۆژهەلاّت، بەڵکو ململانێیەکەی زیاتر قووڵ کردەوە، لە هەمان کاتیشدا درێژەی کێشا تاوەکو رووخانی دەوڵەتی سەفەوی بەدەست ئەفغانەکان.

لە سەردەمی شا تەهماسبی یەکەم دووبارە ئۆزبەکەکان لە بەرەی ڕۆژهەلاّت هەڕەشەیان لە ئێران کردەوە، بەشێوەیەك لە ساڵی (١٥٢٤) تاکو مردنی عوبەیدوڵلا خان لە ساڵی (١٥٣٩) بەردەوام هەڕەشەیان لەسەر دەوڵەتی سەفەوی هەبووە[٧٣]، عوبەیدوڵلاخان کوڕی شیبك خانی ئۆزبەك بە گوتەی خاوەنی کتێبی

(ئەحسەن ئەلتەواریخ) حەوت جار پەلاماری کردۆتە سەر ئێران، تەنها لەیەك پەلامار شکستی خواردووە، زۆربەی پەلامارەکانیش ناوچەی تووس و مەشهەد و هراتی گرتۆتەوە، دوای هەر پەلامارێکیش توندوتیژیی مەزهەبی هاتۆتە ئاراوە[٧٤].

سەبارەت بە شاری هرات پاش هەژدە مانگ لە گەمارۆدانێکی سەخت، توانرا لە لایەن سوپای سەفەوی بە ڕابەرایەتی شا تەهماسبی یەکەم رزگار بکرێت[٧٥]، دواتر هێزەکانی سەفەوی لە ئامادەباشیدا بوون بۆ راوەدوونانی ئۆزبەکەکان لە ئەوبەر رووبار (ماوراء النهر)[٧٦]، بەلاّم هەڕەشەکانی عوسمانی لە بەرەی رۆژئاوا بووە بەربەست لە بەردەم سوپای سەفەوی بە مەبەستی کۆتاییهێنان بەهەڕەشەکانی ئۆزبەك، لە لایەکی دیکەوە مەترسی و هەڕەشەکانی ئۆزبەکی لەبەرەی رۆژهەلاّت درێژ کردەوە[٧٧].

شا تەهماسبی یەکەم بۆ پارێزگاریکردن لە هەرێمەکانی رۆژهەلاّت پێویستی بە بەرزکردنەوەی لایەنی سەربازی هەبووە، سەرەڕای خۆبەستنەوە بە لایەنی باوەڕی (عقیدە) بە مەبەستی هاندانی ئێرانییەکان دژ بە دوژمنەکانیان کە سوننە مەزهەب بوون[٧٨]، هەرچەندە سوپای سەفەوی لە رێگای بەکارهێنانی تۆپی ئاگرین توانی شکست بە سوپای ئۆزبەك بگەیەنێت، لە هەردوو شەڕی (جام و روزئاباد)[٧٩]، بەلاّم ناتوانێت بە یەکجاری کۆتایی بە مەترسییەکانیان بهێنێت، بەڵکو ئاراستەی هێزەکەی بەرەو بەغدا تاو دا و توانی لەژێر دەستی میر زولفەقار خانی کوردی سەرۆکی هۆزی کەلهوڕ لە سالّی (١٥٣٠) دەربهێنێت، کە سەر بەدەولّەتی عوسمانی بوو[٨٠].

### تەوەری سێیەم

### ڕووداوە گرنگەکانی تایبەت بە شا تەهماسبی یەکەم:

#### أ — ڕادەستکردنەوەی بایەزید کوڕی سوڵتان سلێمان قانوونی:

ماوەی حوکمڕانیی شا تەهماسبی یەکەم بە درێژترین ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەژمار دەکرێت لەنێو بنەماڵەی فەرمانڕەواییی سەفەویدا، هەرچەندە لە ماوەی کۆتاییەکانی حوکمڕانیی شا تەهماسبی یەکەم ئێران جۆرە سەقامگیرییەکی سیاسی لە خۆ دەگرێت، بەلاّم پەڵەیەکی رەشیش دەخاتە سەر مێژووی ئەو بنەماڵەیە[٨١]، ئەویش بریتییە لە ڕادەستکردنەوەی بایەزیدی کوڕی سوڵتان سلێمان، پاش ئەوەی لە باوکی یاخی دەبێت و روو دەکاتە ئێران لە ساڵی (١٥٥٩)، هەرچەندە شا تەهماسبی یەکەم لە سەرەتادا بەڕێزەوە لە قەزوین پێشوازی و مامەڵەی لەگەڵ کرد[٨٢]، بەلاّم دواتر لە ساڵی (١٥٦١) ڕادەستی شاندی عوسمانی دەکاتەوە لە بەرامبەر چوارسەد هەزار سکەی زێڕ[٨٣].

لەو ماوەیەی (بایەزید) لە دەرباری سەفەوی بوو، هەوڵی دەدا هانی شا تەهماسبی یەکەم بدات بۆ هێرشکردنە سەر دەوڵەتی عوسمانی، بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجەکانی، بەلاّم (شا)ی سەفەوی ئەم پێشنیازانەی ڕەت کردەوە، چونکە پابەند بوو بە ڕێکەوتننامەی ئەماسیا[٨٤]، لە هەمان کاتدا سوڵتان سلێمان قانوونی بۆ درێژە پێدانی ئاشتی و پابەندبوون بە ڕێکەوتننامەی ئەماسیا، ڕادەستکردنەوەی بایەزید و کوڕەکانی کردە مەرج لەسەر شا تەهماسبی یەکەم[٨٥]، هەرچەندە ڕادەستکردنەوەی بایەزید و کوڕەکانی لە لایەن شا تەهماسبی یەکەم بۆ دەرباری عوسمانی، بۆتە مایەی ڕەخنە و تانە لێدان لەسەر کەسایەتیی (شا)ی سەفەوی، لە لایەن هەندێك لە مێژوونووسان، هەرچی مێژوونوسە ئێرانییەکانە لە رووی مرۆڤایەتییەوە پۆزش بۆ ئەم کارەی شا تەهماسبی یەکەم دەهێننەوە و دەڵێن " مردنی کەسێك باشترە لە مردن و کوژرانی چەندان کەس " لەلایەکی دیکەوە ئەگەر شا تەهماسب داواکەی سوڵتان سلێمان قانوونی لە ڕادەستکردنەوەی بایەزید و کوڕەکانی ڕەت بکردبایەوە، بێ گومان دەبووە هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتننامەی ئەماسیا و دووبارە هەڵگیرساندنەوەی جەنگ و ئاشووب[٨٦].

جێی ئاماژە پێکردنە لە کۆتاییبیـەکانی مـاوەی حـوکمڕانیی سـوڵتان سـلێمان قانوونی، حـەریمی سـوڵتان ڕۆڵـی سـەرەکی دەگێـڕن لـە دروسـتکردنی ئاشـووب و نانەوەی دووبەرەکی لەناو دەرباری عوسمـانی، بەشـێوەیەك هەریـەك لـە ژنـەکانی سوڵتان سلێمان قانوونی لە هەوڵی ئەوەدا بوونە کە کوڕەکانیان بکەنـە جێنشـینی سـوڵتان، لـەو ململانێیەشـدا (ڕۆکسـلانە خـوررەمی)[٨٧] خێزانـی سـوڵتان سـلێمان قـانوونی بەیارمـەتیی (ڕۆسـتەم پاشـا)ی سـەدری ئـەعزەم توانییـان ململانێیەکـە بەقازانجی خۆیان تەواو بکەن، بەشێوەیەك وایان لە سلێمان قانوونی کرد لە ڕێگای فێڵ و تەڵەکەیەکەوە مستەفای کوڕی لە ناوببات[٨٨]، دواتریش کوڕەکانی دیکـەی، بۆئەوەی سەلیمی دووەمی کوڕی ڕۆکسلانە ببێتە جێنشین[٨٩].

هەر لە میانەی پیلانەکەیاندا، بڕیاری ئاڵوگۆڕکردنی شوێنەکانی هەریەکـە لـە بایەزید و سەلیمی دووەم درا کە تێیدا فەرمانڕەوا بوون، بەشـێوەیەك بایەزیـد کـە ئەوکات والیی (قونیە) بوو لەسەری پێویست کـرا ئـەو شـوێنە جێبهێڵێـت و ببێتـە والیی (ئەماسیا)، لە بەرامبەریشدا سـەلیمی دووەم (مغنسـیە) جێبهێڵێـت و بچێتە (کوتاهییە)، بەڵام بایەزید بەم ئاڵوگۆڕییە ڕازی نابێـت[٩٠]، ئاکامەکـەی بـە شـەڕێك کۆتایی هات لە ساڵی (١٥٥٩)، کە تێیـدا بایەزیـد شکسـت دەخـوات و ڕوو دەکاتـە ئێران و لە لایەن شا تەهماسبی یەکـەم بـەڕێزەوە پێشـوازی لـیٚ کـرا لـە قـەزوین، بـەڵام دواتـر لەبـەر هەوڵـەکانی بایەزیـد بـۆ لـەناوبردنی شـا تەهماسـبی یەکـەم و ئاشکرابوونی بووە هۆکارێك کە بایەزید و کوڕەکانی زیندانی بکـرێن[٩١]، پاشـان لـە ساڵی (١٥٦١) ڕادەستی نێردەی سوڵتان سـلێمان قـانوونی دەکـرێن و کۆتـایی بـە گیانی هەریەکـە لـە بایەزیـد و کوڕەکـانی هێنـرا، بەمـەش سـەلیمی دووەم بـەبیٚ ڕکابەر مایەوە بۆ جێنشینیی سوڵتانی عوسمانی[٩٢].

سەبارەت بە کوژرانی هەریەکە لە بایەزید و کوڕەکانی، دوای ئەوەی نێـردەی تایبەتی دەرباری عوسمانی کە پێك هاتبوون لە خسرۆ پاشا حاکمی وان، عەلی ئاغا و سـینان بـێگ، گەیشـتنە دەربـاری سـەفەوی لـە قـەزوین دوای وەرگرتنـەوەی هەریەکە لە بایەزید و کوڕەکانی لە مەیدانی ئەسب لە قەزوین خنکێندران، ئەمـەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بایەزید و کوڕەکانی ڕەوانەی ئیستانبوڵ نەکراونەتـەوە، بەڵکو تەنها لاشەیان گەیاندراوەتەوە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی[٩٣].

**ب – دەمارگیریی مەزهەبی لە خودی شا تەهماسب بەرامبەر (هەمایونی کوڕی بابەر)[٩٤]:**

پەیوەندییەکانی شا تەهماسب لەگەڵ خانی تەیموری هیندی دەگەڕێتەوە ئەو کاتەی کە ململانێی توند لە نێوان هەمایونی بابەر دەسەڵاتداری هیندستان و شێرشا دەسەڵاتداری ئەفغانستان هاتە ئاراوە[٩٥]، لە ساڵی (١٥٣١) هەمایونی کوڕی بابەر لەشوێنی باوکی دەسەڵاتی دلهی گرتە دەست، هەوڵی دا هەردوو میرنشینی گجرات و مالوە یەکبخات، بەڵام هەوڵەکانی سەری نەگرت [٩٦]، لەبەرامبەریشدا شێرخان کە سەرکردایەتیی ئەفغانستانی دەکرد، بە دەسەڵاتی هەمایون رازی نەبوو، بۆیە هەردوولا لە کەنارەکانی رووباری گنگ لە ساڵی (١٥٤٠) رووبەڕووی یەکتر بوونەوە، کە تێدا هەمایون تووشی شکست هات[٩٧].

شکست خواردنی هەمایون لە شەڕی گنگ (قەننوج) بووە، هۆکارێك کە تەوای هیندستان بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی شێرخان و محەمەد هەمایونیش تووشی سەرگەردانی و ئاوارەیی هات، بۆیە سەرەتا رووی کردە سند و لەوێشەوە رێگای گرتە بەر بە ئاراستەی سنوورەکانی دەوڵەتی سەفەوی [٩٨]، کاتێك هەمایون گەیشتە سنوورەکانی ئێران، زۆر بەگەرمییەوە لە لایەن سەفەوییەکان پێشوازی لێ کرا تاکو گەیاندیانە قەزوین[٩٩]، لەکاتی دیدارەکەشیدا لەگەڵ شا تەهماسب، زۆر بەزەقی دەمارگیری مەزهەبی لەخودی شا تەهماسب بەدیار دەکەوێت، چونکە داوا دەکات لە میوانەکەی کە سوننە مەزهەبە ئامادەیە یارمەتی پێشکەش بکات بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتی بۆ دلهی، بەمەرجێك مەزهەبەکەی بۆ شیعە بگۆڕێت[١٠٠]، لە لایەکی دیکەوە شا تەهماسبی یەکەم ئەو هەلەی قۆستەوە کە هەمایون وەك پەناهەندە لە دەرباری سەفەوی بوو، مەرجێکی دیکەی بەسەردا سەپاند، ئەویش داوای قەندەهاری لێ کرد، چونکە ئەو ناوچەیە کێشەی زۆری لەسەر بوو لە نێوان هەردوولادا[١٠١].

سەرەتا هەمایون ئەم پێشنیازانەی شا تەهماسبی بەلاوە پەسند نەبوو، بەڵام بەئامۆژگاریی (پیرەمخان)ی راوێژکاری کە لەسەر مەزهەبی شیعە بوو، رەزامەندی نواند لەسەر گۆڕینی مەزهەبەکەی و لە دواییشدا بە مەرجی دووەمیش رازی دەبێت، دیارە قایلبوونی هەمایون زیاتر بۆ ئەوەیە شا تەهماسبی یەکەم نەرمی

بنـوێنێ لـە یارمەتیـدانی[١٠٢]، دوای پـانزە سـاڵ مانـەوە لـە ئێـران، هـەمایون زۆر بەوردی چـاودێریی بـاردودۆخی هیندسـتان و ئەفغانسـتانی دەکـرد، پـاش ئـەوەی شـێرخان دەمرێـت، بـارودۆخ رەخسـا، چـونکە ململانـێ لـە نێـوان جێنشـینەکانی لەئارادا بوو، بۆیە هەمایون بەیارمەتی سوپای سەفەوی لە ساڵی (١٥٥٦)، سـەرەتا لە ئەفغانستان و دواتر دەسەڵاتی بۆ دلهی گەڕاندەوە[١٠٣].

## تەوەری چوارەم

## بارودۆخی سیاسیی ئێران لە نێوان ساڵانی ( ١٥٧٦ — ١٥٨٧ز):

سەرەڕای بوونی چەندین ئاکاری نابەجێ لە خودی شا تەهماسبی یەکەم وەك حەزکردن لە کۆکردنەوەی پارە و باوەڕکردنی بەخورافات و راڤەکردنی خەونـەکان و هەروەها بوونی دەرمارگیریی مەزهەبی شیعەگەریی، بەڵام ناکرێت دەستبەرداری ئەو راستییە بـین کـە شـا تەهماسب لـە مـاوەی حـوکمڕانی تـوانی پارێزگـاری لـە یەکێتی سیاسیی ئێران بکات [١٠٤]، هـەروەها ئێـران رزگـار بکـات لـە پـەلامارەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی و ئۆزبەکـەکان و زاڵبـوونی بەسـەر هـەموو شـۆڕش و کێشـە ناوخۆییەکانی وڵات، لە ساڵی (١٥٧٦) کۆچی دوایی دەکـات، دووبـارە ململانـێ و نـاکۆکی لـە نێـو نـەوەکانی شـا تەهماسـبی یەکـەم دەسـت پێـدەکات، لـەپێناو دەستگرتنیان بە سەر تەختی شاهێتیی دەوڵەتی سەفەوی[١٠٥].

بارودۆخی سیاسیی دەوڵـەتی سـەفەوی کەوتـە قـەیران و گێـژاوی ململانێیـە نێوخۆییـەکانی نـاو بنەماڵـەی سـەفەوی بـە تایبـەت لـە نێـوان نـەوەکانی شـا تەهماسبی یەکـەم بـە مەبەسـتی وەرگـرتنی دەسـەڵات و تـاج گـوزاریی سـەفەوی، هەرچەندە محەمەد میرزا، کە ئەو کات حاکمی فارس بوو جێنشینی شـەرعی (شـا) بوو، بەڵام نەهاتە ناو ململانێیەکە [١٠٦]، ئیسـماعیل مـیرزا (ئیسـماعیلی دووەم) لـە قـەڵای قەهقەهـە زینـدانی کرابـوو[١٠٧]، بۆیـە بـارودۆخ بـۆ حەیـدەر مـیرزا رەخسـا، بەتایبەت لە دوا ساتەکانی ژیانی شا تەهماسبی یەکەم، زۆربەی کارەکـانی دەربـار بـەو راسـپێردرابوو، بەیارمـەتی هـۆزی ئۆسـتاجلو تـوانی لـەدوای مردنـی بـاوکی دەسەڵات بۆ خۆی قۆرخ بکات[١٠٨].

لە کۆتاییەکانی ماوەی حوکمڕانیی شا تەهماسبی یەکەم، حەریمی شا ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕن لە دروستکردنی ئاشووب و نانەوەی دووبەرەکی لە ناو دەرباری سەفەوی، بەشێوەیەك هەریەك لە ژنەکانی شا تەهماسبی یەکەم لە هەوڵی ئەوەدا بووە کە کوڕەکانیان بکەنە جێنشینی شا، ئەمەش کاردانەوەیەکی نەرێنی هەبووە لەسەر ئاڵۆزی و ناکۆکی لەناو بنەماڵەی دەسەڵاتداریەتی سەفەوی، لەلایەکی دیکەوە بوونی ڕەگەزی چەرکەسی و گورجی لەناو دەرباری سەفەوی، کە وەك هێزی سێیەم لە ئێران دەرکەوتن بە هەمان شێوە ڕۆڵیان هەبووە لە دروستکردنی ناکۆکییەکان(١٠٩).

قۆرخکردنی دەسەڵات لە لایەن حەیدەر میرزا بووە مایەی ناڕەزایی لە لایەن سەرکردەی هۆزەکانی ئەفشار و ڕۆملو و بەیات(١١٠)، سەرەڕای سەرکەوتنی ئۆستاجلو و گورجییەکان لە هەوڵەکانیان بۆ دانانی حەیدەر میرزا لە دەسەڵات، بەڵام دواتر لەرێگای دارشتنی پیلانێك لە لایەن پەریخانی خوشکی ئیسماعیل میرزا و سەرکردەی ئەو باڵەی قزلباشەکان، کە دژ بەحەیدەر میرزا بوون، توانییان شاهی تازە لە هەوادارانی دووربخەنەوە و بیکوژن(١١١)، پاش کوژرانی حەیدەر میرزا لە قەزوین، هەواداران و لایەنگرانی ئیسماعیل میرزا توانییان لەزیندانی قەهقەهە ئازادی بکەن و دوای نۆ ڕۆژ لە مردنی باوکی لە تەمەنی چل سالێدا تاج گوزاریی پاشایەتی تەختی ئێرانی پێدرا، لە مزگەوتی قەزوین وتاری (شا)یەتی بەناوی ئیسماعیلی دووەم خوێندرایەوە(١١٢)، سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیسماعیلی دووەم بە سەردەمی خوێناوی لە مێژووی ئێران دادەنرێت، چونکە کەسێکی زۆر دڵڕەق و بێ بەزەیی بووە تەنانەت بەرامبەر بە باوکی کۆچکردوو و کەسە نزیکەکانی و هەڵگەڕانەوەشی لە مەزهەبی شیعەگەرایی، ڕەنگە هۆکارەکەشی بگەڕێتەوە بۆ ئەو ماوەیەی کە نزیکەی بیست ساڵ زیندانی کرابوو لە قەلای قەهقەهە، کاردانەوەیەکی خراپی لە سەر ئاکار و هەڵسوکەوتی ئیسماعیلی دووەم دروست کردبێت(١١٣).

ئیسماعیلی دووەم نەك تەنها زۆربەی لایەنگرانی حەیدەر میرزا بەتایبەتی ئۆستاجلویەکانی قەلاچۆ کرد، بەڵکو لەگەڵ لایەنگرانی خۆشی کەوتە توندوتیژی، بەتایبەتی ئەو کەسانەی لەسەردەمی باوکی بالادەست بوونە، هەروەها کەوتە گیانی کەسە نزیکەکانی خۆی لە بنەماڵەکەیدا، کە گومانی نزیکبوونەوەی لە

ناوەندی دەسەلأت لێ بکردبایە، ئەوە دەیکوشت یاخود کوێری دەکرد[١١٤]، لە ساڵی (١٥٧٧) شا ئیسماعیلی دووەم کوشتارگەیەکی بۆ براکانی دانا، کە تێدا هەڵسا بەکوشتنی شەش لە براکانی لەوانە ئیبراهیم میرزا، مەحموود میرزا، ئیمام قوولی میرزا و سولْتان ئەحمەد میرزا و بەدیعولزەمان میرزا و عەلی میرزا و نەوەکانیان[١١٥]، هەروەها نزیکەی هەڤدە کەس لە سەرانی (قزلباش)یش کەوتنە بەر شالأوی تووڕەیی شا ئیسماعیلی دووەم و چارەنووسیان وەك براکانی شا بوو[١١٦]، سەرەڕای ئەو کارەی کە ئیسماعیلی دووەم ئەنجامی دا دڵی ئاوی نەخواردەوە، بەڵکو عەلی قوڵی خان شاملوی نارده هەرات بە مەبەستی کوشتنی عەباس میرزا، بەلأم بەهۆی مردنی ئیسماعیلی دووەم، عەباس میرزا لەکوشتنێکی حەتمی رزگاری بوو[١١٧].

پەیڕەوکردنی سیاسەتی توندوتیژی و بەئاشکرا دژایەتیکردنی مەزهەبی شیعە و لابردنی دروشمەکانیان لەسەر پارەو پوولیان و قەدەغەکردنی جنێودان بەهەرسێ خەلیفەی راشیدین بە دیارترین سیماکانی سەردەمی شا ئیسماعیلی دووەم دادەنرێن[١١٨]، بەلأم ئەوەی جێی گومانە هۆکار چین بۆ گرتنەبەری ئەم جۆرە سیاسەتانە لە لایەن ئیسماعیلی دووەم، ئایا بۆ رازیکردنی دوژمنە تەقلیدییەکانیەتی کە خۆی دەبینێتەوە لەدەوڵەتی عوسمانی و ئۆزبەکەکان کە سوننە مەزهەب بوونە، یاخود وەك کاردانەوەیەك لەدژی باوکی کە کەسایەتییەکی توندڕەوی شیعە مەزهەب بووە، یان وەك قەرەبووکردنەوەی ژیانیەتی کە بۆ ماوەی نزیکەی بیست ساڵ لەزیندان نابوود کرابوو[١١٩].

شیاوی باسکردنە پەیڕەوکردنی ئەم جۆرە سیاسەتانە لە لایەن ئیسماعیلی دووەم بوونە هۆکار بۆ تووڕەبوونی سەرکردە قزلباشە توندڕەوەکانی مەزهەبی شیعە و گەیشتنە ئەو رایەی کە شا ئیسماعیلی دووەم ئەو شاهە نییە کە لێی دەگەڕان و هیوایان پێ بوو، بۆیە بڕیاریان دا لە رێگای پیلانێکەوە لەناوی بەرن، بەهانەشیان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، گوایە ئیسماعیلی دووەم شیعەیەکی زۆر بە باوەڕ نییە[١٢٠]، چونکە هەر لەمنداڵییەوە لە هرات لە لایەن مامۆستایەکی سوننە مەزهەب پەروەردە کراوە[١٢١].

ماوەی حوکمڕانیی ئیسماعیلی دووەم ساڵێك و سێ مانگ درێژەی کێشا و لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٥٧٧) دەکوژرێت [١٢٢]، سەبارەت بە کوژرانیشی چەندین راڤەی جیاوازی بۆ کراوە، هەندێك پێیان وایە بەهۆی خواردنەوەی زۆر و بەکارهێنانی بێ سنووری تریاك هۆکار بووە بۆ مەرگی، لەلایەکی دیکەوە هەندێکی تر لەو باوەڕەدان کە پانزە کەس لە رێگای پۆشینی جلوبەرگی ئافرەتان لەناو کۆشکەکەی خۆیدا توانییان بیکوژن[١٢٣]، بەڵام سەرچاوەی تایبەت بەو سەردەمە باس لە هەوڵەکانی پەریخانی خوشکی دەکەن بەهاندانی سەرکردە قزلباشە توندڕووەکانی شیعە لەرێگای ژەهراویکردن، کۆتایی بە ژیانی ئیسماعیلی دووەم هێناوە، ئەوەی جێی سەرنجە دەربڕینی خۆشحاڵیی خەڵك لەکاتی بیستنی هەواڵی مەرگی ئیسماعیلی دووەم بووە هۆکارێك کە پرسیارکردن دەربارەی کوشتنی ئەو شاهە بەشاراوەیی بمێنێتەوە[١٢٤].

ئەنجوومەنی باڵای سەرانی قزلباش و پیاوماقووڵانی دەربار لە دوای کوژرانی شا ئیسماعیلی دووەم بڕیاری دانانی (محەمەد خودابەندە)یان دا وەك شاهی نوێی ئێران[١٢٥]، هەرچەندە محەمەد خودابەندە، ئارەزووی دەسەڵاتی نەبووە، چونکە کەسێکی نەخۆش و کەم بینا بوو، بەڵام سەرانی قزلباش بەزۆری رازییان کرد، زیاتر لەبەر مەترسیی رووخانی دەوڵەتی سەفەوی[١٢٦]، دوای ئەوەی محەمەد خودابەندە بەبڕیاری ئەنجوومەنی باڵای سەرانی قزلباش وەك شاهی ئێران دانرا، هەرزوو لەبەر لاوازی و نەبوونی ئیرادەیەکی بەهێز و دوودڵی لەوەرگرتنی بڕیارە چارەنووسسازەکاندا، وەك بووکە شووشەیەك کەوتە دەست مەهدی عولیای خێزانی[١٢٧]، بەشێوەیەك بە ناو شاهی ئێران بوو، بەڵام کاروباری دەوڵەت لەدەست خێزانەکەیدا بوو[١٢٨].

محەمەد خودابەندە پاش ماوەیەکی کەم لەوەرگرتنی دەسەڵات، کەوتە نێوان رق بە رقەی دوو ژنی خۆ بەزلزان و بێ بەزەیی، کە هەریەکە لە مەهدی عولیای خێزانی و پەریخانی خوشکی بوون، هەرچەندە پاش کوژرانی ئیسماعیلی دووەم، پەریخان کاروباری وڵاتی لە رێگای ئەنجوومەنێکی باڵای قزلباشەوە هەڵدەسووڕاند[١٢٩]، بەڵام مەهدی عولیا بەم کارە رازی نەبوو بۆیە بڕیاری دوورخستنەوەی پەریخانی دا لەو مەیدانە، لە سەرەتادا توانی لە قەزوین

سەرکردە قزلباشەکان لە پەریخان دووربخاتەوە و دوای گەیشتنی بە قەزوین خەلیل خانی ئەفشاری راسپارد بە کوشتنی پەریخان[١٣٠]، هەروەها شەمخال خان کە یەکێك بوو لە مەزنەکانی چەرکەس و تەنانەت شا شوجاع کوڕە بچووکەکەی شا ئیسماعیلی دووەم لەو پیلانە بەدەر نەبوون و کوژران[١٣١].

تاکڕەویی لە دەسەڵات و بەلاوەنانی محەمەد خودابەندە و پشتگیرکردنی لە تاجیکەکان و دژایەتیکردنی قزلباشەکان وای کرد ململانێیەکی توندوتیژ لە لایەن سەرانی قزلباش و مەهدی عولیا بێتە ئاراوە، چونکە سەرانی قزلباش گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە مەهدی عولیا دەسەڵاتی شاهی بۆخۆی قۆرخ کردووە، دواتریش هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی رەفتاری نەشیاویش بەرامبەر بەسەرکردە قزلباشەکان[١٣٢]، سەرەڕای ئەوەش سەرانی قزلباش چەندین جار هۆشدارییان دا بە شاژن دەست لە کاروباری وڵات وەرنەدات، بەلام بێ هوودە بوو، لەئەنجامدا سەرانی قزلباش یەکیان گرت و لە ساڵی (١٥٧٩) لەناو حەرەمی خۆی خنکاندیان[١٣٣].

خراپی و ناهەمواریی بارودۆخی سیاسیی ئێران جارێکی دیکە ڕێگای خۆش کرد بۆ سوپای عوسمانی لە سەردەمی موورادی سێیەم لە ساڵی (١٥٧٨) بە سەرکردایەتی عوسمان پاشا هێرش بکاتە سەر ئێران بەتایبەت دوای پشتگوێ خستنی ڕێکەوتننامەی ئاماسیا و دەستی گرت بەسەر تەورێز و تەفلیس و داغستان[١٣٤]، بەلام جوامێری و دلاوەریی هەمزە میرزای کوڕە گەورەی محەمەد خودابەندە توانی سنوورێك بۆ پێشڕەوییەکانی سوپای عوسمانی دابنێت، بەتایبەت دوای مردنی فەرماندەی هێزەکانی عوسمانی (عوسمان پاشا) لە ساڵی (١٥٧٩) ناوچە داگیرکراوەکانی گەڕاندنەوە ژێر رکێفی دەوڵەتی سەفەوی و پاشەکشەی بە سوپای عوسمانی کرد[١٣٥]، لە ساڵی (١٥٨٥) هێزەکانی عوسمانی جارێکی دیکە توانییان تەورێز داگیر بکەن و ساڵێك دواتر هەمزە میرزا لە کاتی پێشڕەوییەکانی بۆ قەرەباغ لە هەلومەرجێکی نادیار دەکوژرێت[١٣٦].

سەرانی قزلباش لە قەزوین دوای کوژرانی هەمزە میرزا و داگیرکردنی تەورێز لە لایەن عوسمانییەکان، داوایان لە محەمەد خودابەندە کرد کە ئەبوتالیب کوڕە بچووکی وەك جێنشینی خۆی دەستنیشان بکات[١٣٧]، بەلام سەرانی قزلباش لە

خۆراسان بەپێچەوانەی قەزوین لەهەوڵی ئەوەدا بوون، عەباس میرزا بخەنە سەر دەسەلآت و کودەتا لەسەر محەمەد خودابەندە بکەن، هەرچەندە ئەنجامدانی ئەو کارە ئاسان نەبوو، چونکە هەریەك لە مورشید قوڵی خان حاکمی مەشهەد و عەلی قوڵی خان حاکمی هەرات لە رکابەری و ململانێی توندا بوون سەبارەت بە چاودێریکردنی عەباس میرزا، بۆ ئەوەی لەداهاتوودا پۆستی بالآ وەربگرن، هەرچەندە لەسەرەتادا عەباس میرزا لەژێر چاودێریی عەلی قوڵی خان بووە، بەلآم دواتر لەرێگای فێڵ و پلانێکەوە مورشید قوڵی خان دەتوانێت بۆ لای خۆی رایبکێشێت، ئەم کارەش بووە هۆی روودانی شەڕێك لە نێوان هەردوولا، ئاکامەکەی بە قازانجی مورشید قوڵی خان کۆتایی هات، دوای سەرکەوتنی لە جەنگێکدا بەرامبەر بەرکابەرەکەی و دواتر هەر لە مەشهەدەوە عەباس میرزای وەك شاهی ئێران ناوزەد کرد[١٣٨].

مورشید قوڵی خان و عەباس میرزا بە هێزێکی گەورەوە لە مەشهەد بەرەو قەزوین بەڕێ کەوتن[١٣٩]، دوای گەیشتنیان بە پایتەخت لە ساڵی (١٥٨٧) لە مەراسیمێکدا محەمەد خودابەندە تاجی شاهێتی خستە سەر عەباس میرزا، کە ئەو کات تەمەنی هەڤدە ساڵان دەبوو، بە وەرگرتنی دەسەلآت لە لایەن عەباس میرزا جارێکی دیکە ئێران دەگاتە پەرپەرۆچکەی دەسەلآت و سەقامگیریی یەکێتی سیاسی[١٤٠].

## ئه نجامی توێژینەوە

لە سەرەتای فەرمانڕەوایەتی شا تەهماسبی یەکەم، دەوڵەتی سەفەوی بەرەو لاوازی هەنگاو دەنێت، بەهۆی ململانێی توندی سەرانی قزلباش بۆ وەدەستهێنانی دەسکەوتی زیاتر لە دام و دەزگاکانی دەوڵەت، دیارە ئەم هۆکارەش کاریگەریی گشتگیری دروست کردووە لە هەموو بوارەکانی سیاسی و ئابووری و سەربازی و کۆمەڵایەتی، بەشێوەیەك هەڕەشە و مەترسییەکانی دوو هێزی سوننە مەزهەب ئۆزبەکەکان لە رۆژهەڵات و عوسمانییەکان لە رۆژئاوا لە سەردەمی شا تەهماسبی یەکەم بەئاراستەی توخوبەکانی ئێران روو لەزیادبووندا بووە، لەهەمان کاتدا ئەو هێزەی (دەوڵەتی سەفەوی) کە توانای بەرەنگاربوونەوەی ئەو هەڵمەتانەی هەبووە، بەهۆی سەرقاڵییەکانیان بەئاگری جەنگی ناوخۆ نەیتوانی سنوورێك بۆ ئەم شاڵاوانە دروست بکات.

سەرەڕای بوونی چەندین ئاکاری نابەجێ لە خودی شا تەهماسبی یەکەم وەك حەزکردن لە کۆکردنەوەی پارە و باوەڕکردنی بەخورافات و راڤەکردنی خەونەکان و هەروەها بوونی دەرمارگیریی مەزهەبی شیعەگەرایی، بەلام ناکرێت دەستبەرداری ئەو راستییە بین کە شا تەهماسب لە ماوەی حوکمڕانی توانی پارێزگاری لە یەکێتی سیاسیی ئێران بکات و هەروەها ئێران رزگار بکات لە پەلامارەکانی دەوڵەتی عوسمانی و ئۆزبەکەکان و زاڵبوونی بەسەر هەموو شۆڕش و کێشە ناوخۆییەکانی وڵات و توانی نیو سەدە دەوڵەتی سەفەوی لەسەر پێی خۆی رابگرێت.

سەرکەوتنەکانی شا تەهماسبی یەکەم لە جەنگی جام و کاریگەرییەکانی تا ماوەیەك توانی پایەکانی دەوڵەتی سەفەوی لەخۆراسان وەك خۆی بهێڵێتەوە، سەرەڕای ئەو پێنج هەڵمەتە وێرانکەرەی کە عوبەیدوڵڵا خانی ئۆزبەك لە خۆراسان ئەنجامی دا، جگە لەمەش چوار لەشکرکێشیی عوسمانییەکان بەسەرکردایەتی سوڵتان سلێمان قانوونی کە دەرئەنجامەکەی دەوڵەتی سەفەوی زۆرێك لەزەوییەکانی لەدەست دا، بەلام تواناکانی رابەرایەتی شا تەهماسب لە سەرکەوتنی لەجەنگەکانی ئۆزبەك و کۆتاییهێنان بە باڵادەستبوونی سەرانی قزلباش و ئەنجامدانی رێکەوتننامە لەگەڵ بەهێزترین سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی

یەکێك لەدیارترین سیماکانی کەسایەتیی ئەو (شا)یە دەردەخەن، کە وێنایەکی ترە لەدووبارە بنیاتنانەوەی دەوڵەتی سەفەوی.

دوای مردنی شا تەهماسب لەتەمەنی شەست و چوار ساڵیدا، دووبارە ئێران کەوتەوە گێژاوی ململانێیە نێوخۆییەکانی ناو بنەماڵەی سەفەوی بەتایبەت لە نێوان نەوەکانی شا تەهماسب (١٥٧٦–١٥٨٧) بە مەبەستی وەرگرتنی دەسەلآت و تاج گوزاریی سەفەوی، دیارە حەریمی شا رۆڵی سەرەکی دەگێڕن لەدروستکردنی ئاشووب و نانەوەی دووبەرەکی لەناو دەرباری سەفەوی، بەشێوەیەك هەریەك لە ژنەکانی شا تەهماسبی یەکەم لەهەوڵی ئەوەدا بووە کە کوڕەکانیان بکەنە جێنشینی شا، هەروەها بوونی رەگەزی چەرکەسی و گورجی لەناو دەرباری سەفەوی، کە وەك هێزی سێیەم لە ئێران دەرکەوتن ئەمەش کاردانەوەیەکی نەرێنی هەبووە لەسەر ئاڵۆزی و ناکۆکی لەناو بنەماڵەی سەفەوی بەتایبەتی و بارودۆخی سیاسیی ئێران بەگشتی.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

([1]) ناوی ئێران لە سەرەتادا بە وڵاتی فارس هاتووە، ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ هۆزێك كە لە ساڵی ٩٠٠ پێش زایین نیشتەجێی باشووری وڵات بوونە و توانییان ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی دابمەزرینن، دوای ئەوەی ئەم ئیمپراتۆریەتە لەسەردەستی ئەسکەندەری گەورە لەناوچوو،کەچی ئەو شوێنە جوگرافییە بەناوی وڵاتی فارس لەناو یۆنانییەکان بڵاو بۆوە و پاشانیش ئەوروپاییەکان و عەرەبەکان ئەم زاراوەیان بەکارهێنا، ئەم ناوە بەردەوام بوو تاکو سەردەمی فەرمانڕەوایەتی رەزا شا، بەڵام لەساڵی ١٩٣٥ز بەفەرمانی رەزا شا ناوەکەی گۆڕا بۆ ئێران. دونالد ولبر، ایران ماضيها وحاضرها، ترجمة: عبدالنعيم محمد حسنين، مراجعة، ابراهيم امين الشواربي، القاهرة، ١٩٥٨م، ص١؛ مصطفى عبدالقادر النجار وآخرون، تاريخ الخليج العربي الحديث والمعاصر، الطبعة الأولى، مطبعة جامعة البصرة، ١٩٨٤م، ص١٩٩.

(2) Gene R. Garthwaite, The Persian, Cowley Road, Oxford,UK,2005,P.172.

([3]) مريم مير احمد، تاريخ سياسي، اجتماعي، اقتصادي و فرهنگی در عصر صفوی، انتشارات امير كبير، تهران، ١٣٧١هـ.ش،ص ٥٨.

([4]) ئۆزبەکەکان رەگەزیان دەگەڕێتەوە بۆ ئۆزبەك خانی نۆیەمین فەرمانڕەوایی بنەماڵەی جوجی، ناسراو بە شێخ سەید ئەتای تورکستانی ( ٧١١هـ –٧٣٩هـ)، زێدیان بەرزاییەکانی تورانە، لە سەرەتادا بریتی بوون لە کۆمەڵێك هۆزی کۆچەر لەناوچەکانی باکوری رۆژهەڵاتی فارس، دواتر محەمەد خان دوای ئەوەی توانی بەشێکی زۆر لەهۆزە کۆچەرییە ئۆزبەکەکان لەژێر فەرمانڕەوایی خۆی لە ساڵی (١٥٠٠)ز یەکبخات و خۆی بکاتە پادشای سەمەرقەند، کە ئێستا شارێکی ئۆزبەکستانە، هەروەها دەسەڵاتی بەسەر ناوچەیەکی پان و بەرینی لێوارەکانی رووباری جیحۆن و تا دەگەیشتە سنووری ئێران لەسەر هێڵی تەریبی سمنان لە خۆراسان و لە رۆژئاواش تاکو بەدەخشان و لە خوارووش تا دەگاتە ناوچەکانی کاخیندار، بەمەش دەرگاکانی رۆژهەڵاتی ئێران لەژێر دەسەڵاتی خانی ئۆزبەك دابوو. بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ: و. بارتلد، تاريخ الترك في آسيا الوسطى، ترجمة: احمد السعيد سليمان، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٦م، ص ص١٩٧ –١٩٨ ؛ محەمەد سوهێل تەققوش، مێژووی دەوڵەتی سەفەوی، وەرگێڕانی: شاخەوان محەمەد، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر،٢٠١٠ز، ل ٧٥.

([5]) محمودى طلوعي، خواندنيهاى تاريخي، چ٤، نشر علم، تهران، ١٣٧٧ هـ.ش،ص٢٥ ؛ بهنام محمد پناه، تركان در كذر تاريخ، انتشارات سبزان، تهران، ١٣٨٧ هـ.ش، ص ١٧٠.

([6]) خورشاه بن قباد الحسيني، تاريخ ايلچي نظام شاه، تصحيح و تحشيه و توضيح و اضافات: محمد رضا نصيرى، گوليچي هانەدا، انجمن اثار و مفاخر فرهنگی، تهران، ١٣٧٩هـ.ش، ص٨٨.

(٧) عبدالحسین زرین کوب، روزگاران تاریخ ایران از اغاز تا سقوط سلطنت پهلوی، چ٥، انتشارات سخن، تهران، ١٣٨٣ هـ.ش،ص٦٧٢.

(٨) راجر سیوری، ایران عصر صفوی، ترجمه: کامبیز عزیزی، نشر مرکز، تهران، ١٣٧٢ هـ.ش، ص٤٩.

(٩) همان، ص ص ٥٠—٥١.

(١٠) عبدالحسین نوایی، عباسقلی غفاری فرد، تاریخ تحولات سیاسی، اجتماعی، اقتصادی فرهنگی ایران در دوران صفویه، چ٤، سازمان مطالعة و تدوین کتب علوم انسانی دانشگاها ( سمت)، تهران،١٣٨٦ هـ.ش، ص ١٠٧.

(١١) فاروق سومر، نقش ترکان اناطولی در تشکیل و توسعه دولت صفوی، چ١، ترجمه: احسان اشراقی، محمد تقی امامی، نشر گسترده، تهران، ١٣٧١هـ.ش، ص ص٧٤—٧٥.

(١٢) عبدالحسین نوایی، منبع پیشین، ص١٠٧.

(١٣) عباس سرافرازی، نقش طایفه تکلو در تثبیت و تضعیف دولت صفوی تا پایان دوره شاه عباس اول، دانشکده ادبیات و علوم انسانی (دانشگاه اصفهان)، شماره (٤٠)، بهار ١٣٨٤هـ.ش،ص١١٤.

(١٤) ابراهیم خلیل احمد و خلیل علی مراد، ایران وترکیا دراسة في التاریخ الحدیث والمعاصر، دار الکتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٢م، ص٢٥.

(١٥) جەنگی جام لە ساڵی ١٥٢٨ز لە نێوان سەفەوییەکان و ئۆزبەکەکان رووی دا، کە ئۆزبەکەکان ماوەی هەژدە مانگ گەمارۆی شاری (هرات)یان دابوو، دواتر سەفەوییەکان بەسەرکردایەتی شا تەهماسبی یەکەم توانییان سەرکەوتن بەدەست بهێنن و ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی ئۆزبەك کوژران و تەنانەت عوبەیدوڵلا خانی ئۆزبەك فەرمانڕەوای ئۆزبەکەکان لەو جەنگە بریندار کرا، دوای ئەم جەنگە مەترسیی ئۆزبەکەکان لە رۆژهەلاتی ئێران تا رادەیەك نەما، تاکو مردنی شا تەهماسب لەساڵی ١٥٧٦ز. بۆزیاتر زانیاری سەبارەت بەو جەنگە بگەڕێوە بۆ: حسن بیك روملو، احسن التواریخ، جلد ١٢،تصحیح: عبدالحسین نوائی، انتشارات بابك، تهران، ١٣٥٧هـ.ش، ص ص ٢٨٣—٢٨٨ ؛ یحیی بن عبداللطیف قزوینی، لب التواریخ، انتشارات بنیادگویا، تهران، ١٣٦٣هـ.ش، ص ص ٤٢٧—٤٢٨.

(١٦) عباس سرافرازی، منبع پیشین، ص ص ١١٦—١١٧.

(١٧) لە هەندێك شوێن بە (فاجعه)ی تەکەلو هاتووە.

(١٨) اسکندر بیگ ترکمان، تاریخ عالم ارای عباسی، جلد اول و نیمی از جلد دوم، با اهتمام و تنظیم: ایرج افشار، چ٤، انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٨٧هـ.ش، ص ٤٢.

(١٩) عبدی بیگ شیرازی ( نویدی)، تکمله الاخبار، تصحیح، عبالحسین نوایی، نشر نی، تهران، ١٣٦٩ هـ.ش، ص ٧١.

(٢٠) عبدالحسین نوایی، منبع پیشین، ص١٠٩.

([٢١]) محه‌مه‌د سهێل ته‌ققوش، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل١٢١.

([٢٢]) هه‌مان سه‌رچاوه‌، ل ١٢١.

([٢٣]) شه‌ره‌فخانی به‌دلیسی، شه‌ره‌فنامه‌ (( مێژووی ماڵه‌ میرانی کوردان)، وه‌رگێڕانی: مامۆستا هه‌ژار، چ٣، ده‌زگای ئاراس، هه‌ولێر، ٢٠٠٦، ل ل ٤١٧–٤١٨.

([٢٤]) عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٣، انتشارات الشريف الرضي، قم، ١٣٦٩هـ. ش، ص ص٣٦٣–٣٦٤.

([٢٥]) حسن كريم جاف، الوجيز فى تأريخ ايران، ط٢، ج٣، مطبعة مؤسسة ئاراس، أربيل، ٢٠٠٨م، ص٣٠.

([٢٦]) كارل بروكلمان، تاريخ **الشعوب الاسلامية**، ترجمه: نبيه امين فارس، منير البعلبكي، دار العلم للملاين، بيروت، ٢٠٠٥ م، ص ٤٥٢.

([٢٧]) عبدالحسين نوايى، منبع پيشين، ص١١٨.

([٢٨]) ئیبراهیم پاشا سه‌رکردایه‌تی سوپای عوسمانی کردووه‌ له‌ ساڵی ١٥٢٤ز وه‌ خزمه‌تی ده‌وڵه‌تی عوسمانی کردووه‌ له‌ میسر و ئه‌نادۆڵ و هه‌نگاریا، پۆستی سه‌دری ئه‌عزه‌می وه‌رگرتووه‌، له‌ ساڵی ١٥٣٦ز، سه‌ره‌ڕای خزمه‌ته‌کانی که‌ پێشکه‌شی ده‌وڵه‌تی عوسمانی کردبوو، به‌ فه‌رمانی سوڵتان سلێمان قانوونی به‌ هاندانی روکسلانا له‌ سێداره‌ درا. بۆ زانیاریی زیاتر بگه‌ڕێوه‌: الامير شكيب ارسلان، تاريخ الدولة العثمانية، جمع اصوله وحققه وعلق عليه: حسن السماحي سويدان، الطبعة الأولى، دار ابن كثير، دمشق، ٢٠٠١م، ص ص١٥٢ – ١٥٧.

([٢٩]) نه‌وشیروان مسته‌فا ئه‌مین، کوردو عه‌جه‌م، چ٣، چاپخانه‌ی روون، سلێمانی، ٢٠٠٧ز، ل ٢٢.

([٣٠]) فاروق سومر، منبع پيشين، ص ص ٧٨–٧٩.

([٣١]) برازای محه‌مه‌د خانی ئۆزبه‌که‌، دوای کوژرانی خانی ئۆزبه‌ك رابه‌رایه‌تی ئۆزبه‌کییه‌کانی گرته‌ده‌ست و له‌ هێرشه‌کانی بۆسه‌ر ئێران به‌رده‌وام بوو تاکو مردنی له‌ساڵی ١٥٣٩ز.عبدالرضا هوشنگ مهدوى، تاريخ روابط خارجى ايران از ابتداى دوران صفويه تا پايان جنگ دوم جهانى (١٥٠٠–١٩٤٥)، چاپ دوم، انتشارات امير كبير، تهران، ٢٥٣٥ شاهنشاهى، ص٣١.

([٣٢]) عبدالحسين زرين كوب، منبع پيشين، ص٦٧٤.

([٣٣]) نه‌وشیروان مسته‌فا ئه‌مین، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل ٢٢.

([٣٤]) علي وردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، ج١، المطبعة اسوة، قم، ٢٠٠٤م، ص ٥٦.

([٣٥]) محمودى طلوعي، منبع پيشين، ص٢٥.

([٣٦]) فريدون اسلام نيا، نگاهى به تاريخ ايران بعد از اسلام، چ٢، حسين اصل، اوروميه، ١٣٨٢ هـ.ش، ص ١٧٠.

([٣٧]) عبدالرضا هوشنگ مهدوى، منبع پيشين، ص ٣٢.

([٣٨]) ده‌که‌وێته‌ باکوری ئێران.

(٣٩) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص ٣١.

(٤٠) بۆزیاتر زانیاری دەربارەی ئەلقاس میرزا و پەیوەندییەکانی لەگەڵ شاه تەهماسب بڕوانە: شا طهماسب بن اسماعيل بن حيدرى الصفوى، تذكره شاة طهماسب، با ممقدمه و فهرست اعلام: امر الله صفرى، چ٢، انتشارات شرق، تهران، ١٣٦٣ هـ.ش، ص ٤٢.

(٤١) امير محمود خواندامير، تاريخ شاه اسماعيل و شاه طهماسب صفوى، تصحيح و تحشيه: محمد على جراحى، چ١، نشر گسترده، تهران، ١٣٧٥ هـ.ش، ص ص ٢٢٤–٢٢٥.

(٤٢) ادوارد براون، تاريخ ادبيات ايران، ترجمه: بهرام مقدادى، چ٢، انتشارات مرواريد، تهران،١٣٧٥هـ.ش، ص١٠١.

(٤٣) مريم مير احمد، منبع پيشين، ص٦٤.

(٤٤) عبدالحسين نوايى، منبع پيشين، ص١١٩.

(٤٥) شا طهماسب بن اسماعيل بن حيدرى الصفوى، منبع پيشين، ص ص ٥١–٥٣.

(46) kaya sahin , empire and power in the reign of suleyman: narrating the sixteenth – century ottoman world, (united states of America- 2013), p.120.

(٤٧) شارێکە کەوتۆتە باشووری رۆژئاوای قوم.

(٤٨) محمودی طلوعي، منبع پيشين، ص ٢٥.

(٤٩) ميرزا شكرالله سنندجى (فخر الكتاب)، تحفه ناصرى در تاريخ و جغرافياى كردستان، مقابله و تصحيح: حشمت الله طبيبى، مؤسسة انتشارات امير كبير، تهران، ١٣٦٦هـ.ش، ص ٩٨ ؛ خورشاه بن قباد الحسينى، منبع پيشين، ص ص١٧١–١٧٢.

(٥٠) لە سەردەمی سەفەوی ئەو قەلأیە شوێنی زینداینکردنی شازادەکان و ئەمیرە یاخیبووەکان لەدەسەلأت بوو، لە سەردەمی شاە تەهماسب ئەم قەلأیە هەریەکە لە ئیسماعیلی دووەمی سەفەوی کوڕی شا تەهماسب و ئەلقاس میرزاو سام میرزای برایی و خان احمد گەیلانی فەرمانڕەوای گەیلانی تێدا زیندانی کراوە. بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە قەلأیەکە و گرنگیی لە دەوڵەتی سەفەوی بگەڕێوە بۆ: حسين مير جعفرى، قلعه قهقهه و اهميت ان در عصر صفويه، مجله علمى– پژوهشى دانشكده ادبيات و علوم انسانى اصفهان، شماره (١٨–١٩)، پاييز و زمستانى١٣٧٨هـ.ش ص ص ١–١٣.

(٥١) منشى بوداق قزوينى، جواهر الاخبار، مقدمه وتصحيح و تعليقات: محسن بهرام نژاد، ميراث مكتوب، تهران، ١٣٧٨ هـ.ش، ص ص ٢٠٤–٢٠٥ ؛ امير محمود خواندامير، منبع پيشين، ص ص ٢٥٨–٢٥٩.

(٥٢) محمود طلوعي، منبع پيشين، ص ٢٦.

(٥٣) عبالحسين زرين كوپ، منبع پيشين، ص ٦٧٦.

(٥٤) دەکەوێتە کەنارەکانی باکوری دەریاچەی وان.

(٥٥) دەکەوێتە کەنارەکانی دەریاچەی وان، بەشێکە لە ویلایەتی ( بەدلیس)ی کوردی لە تورکیا.

(٥٦) نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣.

(٥٧) شارۆچکەیەکە لە باکوری ئەنادۆڵ.

(٥٨) فاروق سومر، منبع پیشین، ص ص٨٤–٨٥ اسکندر بیگ ترکمان، منبع پیشین، ص ٧٩؛
John M. Flannery, The Mission of the Portuguese Augustinians to Persia and Beyond (1602-1747) , (U,S.A- 2013), P.22.

(٥٩) عبدالرضا هوشنگ مهدوی، منبع پیشین، ص ص ٣٤–٣٥ ؛ حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص ص ٣٣–٣٤.

(٦٠) همان، ص ص ٣٤–٣٥.

(٦١) سەبارەت بەزانیاریی زیاتر دەربارەی رێکەوتننامەی ئەماسیا بگەڕێوە بۆ:
Sabri Ates, ottoman – Iranian borderlands: making a boundary 1843 – 1914 , (cambirdge university press - 2013), P.20.

(٦٢) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص ٣٥.

(٦٣) عبدالرضا هوشنگ مهدوی، منبع پیشین، ص ٣٥.

(٦٤) محەمەد سوهێل تەققوش، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٥.

(٦٥) عبدالحسین نوایی، منبع پیشین، ص٧٧.

(٦٦) بە گوێرەی زۆربەی مێژوونووسان جەنگیز خان لەساڵی ١١٥٥ز لەنزیك زێی ئونون لەدایك بووە، لەماوەی فەرمانڕەواییەکەی توانی هەموو هۆزەکانی مەغۆل لەژێر چەتری یەك سەرکردایەتی کۆبکاتەوە و فرەوانخوازییەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوای گرتەوە، لەساڵی ١٢٢٧–١٢٢٩ز مردووە. بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی جەنگیزخان بڕوانە: سەید باز ئەلعرینی، مەغۆلەکان، وەرگێڕان: شاخەوان محەمەد، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨ز.

(٦٧) ادوارد براون، منبع پیشین، ص١٠٢ ؛ حمید حاجیان پور، روابط ایرانیان و اوزبکان در دوره شاه طهماسب صفوی، مجله علمی– پژوهشی دانشکده ادبیات و علوم انسانی اصفهان، شماره (١٨– ١٩)، پاییز و زمستانی١٣٧٨هـ.ش،ص٤١.

(٦٨) مریم میر احمد، منبع پیشین، ص٥١.

(٦٩) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص٢٥.

(٧٠) محمدیار بن عرب قطفان، مسخر البلاد ( تاریخ شیبانیان)، تصحیح: نادره جلالی، چ١، مرکز پژوهشی میراث مکتوب، تهران، ١٣٨٥ هـ.ش، ص ص ١١٠–١١١.

(٧١) جیمس داون، شاه اسماعیل صفوی، ترجمه و اقتباس: ذبیح الله منصوری، چ١٤، انتشارات زرین، تهران، ١٣٨٤هـ.ش،ص ٦٤٩.

(٧٢) نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨.

(٧٣) عبدالرضا هوشنگ مهدوی، منبع پیشین، ص٣١.

(٧٤) ادوارد براون، منبع پیشین، ص١٠٢ ؛حمید حاجیان پور، منبع پیشین، ص ص ٤٣—٤٤.
(٧٥) عبدالرضا هوشنگ مهدوی، منبع پیشین، ص٣١.
(٧٦) ئەو ناوچانە دەكەونە نێوان هەردوو رووباری جیحۆن و سیحۆن كە سەمەرقەند و بوخاراو خـوارزم و چەند ناوچەیەكی دیكە دەگرێتەوە.
(٧٧) عبدالحسین زرین كوب، منبع پیشین، ص ٦٧٤.
(٧٨) بهنام محمد پناه، منبع پیشین، ص ٦٩ ؛ امیر محمود خواندامیر، منبـع پیشـین، ص١٤٩؛ قاضـی احمد منشی قمی، خلاصه التواریخ، تصحیح: احسان اشراقی، جلداول، انتشارات دانشـگاه تهـران، تهران، ١٣٥٩هـ.ش،ص١٨٣.
(٧٩) ن.و.بیكولوسـكایا و دیگـران، تـاریخ ایـران از دوران باسـتان تـا پایـان سـده هیجـدهم مـیلادی، انتشارات پیام، تهران،١٣٥٤هـ.ش، ص٤٨٥.
(٨٠) عباس اقبال اشتیانی، تاریخ مفصل ایران از صدر اسلام تا انقراض قاجاریه، بكوشش: محمد دبیر سیاقی، انتشارات كتابخانه خیام، تهران، ١٣٤٦ه.ش، ص٦٦٥.
(٨١) محمود طلوعي، منبع پیشین، ص ٢٦.
(٨٢) قاضی احمد غفـاری قزوینـی، تـاریخ جهـان ارا، كتابفروشـی حـافظ، تهـران، ١٣٤٣هـ.ش، ص ص ٣٠٤—٣٠٥.
(٨٣) همان، ص ص ٣٠٧—٣٠٨ ؛عبدالحسین زرین كوب، منبع پیشین، ص ص ٦٧٥—٦٧٦.
(٨٤) اسكندر بیگ تركمان، منبع پیشین، ص ١٠٣—١٠٤.
(٨٥) عبدالحسین نوایی، عباسقلی غفاری فرد، منبع پیشین، ص١٢٣.
(٨٦) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص ص ٣٤—٣٥.
(٨٧) رۆكسلانە لەلایەن سوڵتان سلێمان قانوونی جێگـای بایـەخ و گرنگـی پێـدان بـووە، لـە تـەواریخی عوسمانی بە خرم سولتان هاتووە، بەڵام لەسەرچـاوە بیانییـەكان بـە رۆكـزالان هـاتووە. اسماعیـل حقی اوزون چارشی لی، تاریخ عثمانی، جلد دوم، نشر كیهان، تهران، ١٣٦٩هـ.ش، ص ٤٣٢.
(٨٨) همان منبع، ص ٤٣٢.
(٨٩) محمود شاكر، الخلفاء العثمانيون، ط١، المكتب الاسلامي، بيروت، ٢٠٠٣، ص ١٤١
(٩٠)) محمودي طلوعی، منبع پیشین، ص ٢٦.
(٩١) عبدالحسین نوایی، منبع پیشین، ص١٢٣.
(٩٢) كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص ص ٤٥٦—٤٥٧.
(٩٣) مریم میر احمد، منبع پیشین، ص٦٢.
(٩٤) هەمایون لە ساڵی ١٥٠٨ لە ئەرگی كابول لەدایك بووە، لەتەمەنی ٢٣ ساڵیدا لەدوای مردنی بـاوكی دەسەڵاتی وەرگرتووە، بەڵام بەهۆی كەم ئەزموونی لـە بـەڕێوەبردنی وڵـات و خـووگرتنی بـەتریاك

نەیتوانی پارێزگاری لە ئیمپراتۆریەکەی باوکی بکات، لەساڵی ١٥٥٦ کۆچی دوایی کردووە. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: سید هیدایت علی شاه رضوی، تاریخ سیاسی اجتماعی بابریان هندوستان، فصلنامه ( سخن تاریخ)، شماره (٣)، قم، تابستان ١٣٨٧هـ.ش،ص ص ٧٩–٨١.

(٩٥) راجر سیوری، منبع پیشین، ص٦٤.

(٩٦) امیر محمود خواندامیر، منبع پیشین، ص ٢٥٧–٢٥٨.

(٩٧) عبدالحسین نوایی، منبع پیشین، ص١٢٨.

(٩٨) خورشاه بن قباد الحسینی، منبع پیشین، ص ص ١٤٧ – ١٤٨.

(٩٩) محمد علي سلطانی، قیام و نهضت علویان زاگرس یا تاریخ تحلیلی اهل حق، چ٢، مؤسسه فرهنگی نشر سها، کرمانشاه، ١٣٧٦ –١٣٧٧ هـ.ش، ص ٥٢.

(١٠٠) مریم میر احمد، منبع پیشین، ص٦٣.

(١٠١) بهنام محمد پناه، منبع پیشین، ص ص ٦٩–٧٠.

(١٠٢) راجر سیوری، منبع پیشین، ص ص٦٤–٦٥.

(١٠٣) امیر محمود خواندامیر، منبع پیشین، ص ص ٢٥٧–٢٥٨.

(١٠٤) ابو القاسم طاهری، تاریخ سیاسی و اجتماعی ایران، تهران، ١٣٤٩هـ.ش،ص٢٠٠.

(١٠٥) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص٣٦.

(١٠٦) محمد جواد مشکور، تاریخ ایران زمین، چ٤، انتشارات اشراقی، تهران، ١٣٧٢ هـ.ش، ص ٢٧٢.

(107) Colin P. Mitchell, New Perspectives on Safavid Iran: Empire and Society, New yourk-2011) ,P.36.

(١٠٨) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص ٦٧٩.

(109) Lois Beck, Guity Nashat, Women in iran from the rise of islam to 1800, University of Illinois ( U.S.A – 2003),PP.146-147.

(١١٠) مریم میر احمد، منبع پیشین، ص٦٥.

(١١١) محمود بن هدایت الله افوشتەای نطنزی، نقاوة الاثارفی ذکر الاخبار در تاریخ صفویه، به اهتمام احسان اشراقی، چ٢، انتشارات علمی و فرهنگی، تهران، ١٣٧٣ هـ.ش، ص ص ٢٠ – ٢١ ؛حسن بیگ روملو، منبع پیشین،ص ١٧.

(١١٢) ادوارد براون، منبع پیشین، ص ١٠٦.

(١١٣) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص ٦٨٠.

(١١٤) بهنام محمد پناه، منبع پیشین، ص ٧٠.

(١١٥) ادوارد براون، منبع پیشین، ص ص ١٠٦–١٠٧.

(١١٦) محمودی طلوعي، منبع پیشین، ص ٢٨.

([١١٧]) ایران میر عابدینی، پریخان دختر شاه تهماسب، مجله (رشد اموزش تاریخ— وزارت اموزش و پرورش)، شماره (٨)،تهران،زمستان ١٣٨٠هـ.ش، ص٤٠.

([١١٨]) اسکندر بیگ ترکمان، منبع پیشین، ص ص ٢١٣ — ٢١٤، ٢١٧.

([١١٩]) کارل بروکلمان، المصدر السابق، ص ٥٠١.

([١٢٠]) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص ٦٨١.

([١٢١]) فریدون اسلام نیا، منبع پیشین، ص ١٧١.

([١٢٢]) محمودی طلوعي، منبع پیشین، ص ٢٨.

([١٢٣]) اسکندر بیگ ترکمان، منبع پیشین، ص ص ٢١٨–٢١٩.

([١٢٤]) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص ٦٨١.

([١٢٥]) ایران میر عابدینی، منبع پیشین، ص ٤٠.

([١٢٦]) فاروق سومر، منبع پیشین، ص ١٤٥.

([١٢٧]) عبدالرضا هوشنگ مهدوی، منبع پیشین، ص٤٥.

([١٢٨]) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص ٣٨.

([١٢٩]) عبدالحسین نوایی، منبع پیشین، ص١٥٢.

([١٣٠]) ایران میر عابدینی، منبع پیشین، ص ٤١.

([١٣١]) راجر سیوری، منبع پیشین، ص ٦٨.

([١٣٢]) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص ٦٨٢.

([١٣٣]) بهنام محمد پناه، منبع پیشین، ص ٧٠.

([١٣٤]) مریم میر احمد، منبع پیشین، ص٦٩.

([١٣٥]) فاروق سومر، منبع پیشین، ص ١٤٨.

([١٣٦]) اسکندر بیگ ترکمان، منبع پیشین، ص ص ٣٤٢–٣٤٧.

([١٣٧]) عبدالحسین نوایی، منبع پیشین، ص١٦٥.

([١٣٨]) محمودی طلوعي، منبع پیشین، ص ٣٠. بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ململانێی مرشد قولی خان و عەلی قولی خان بڕوانە: محمود بن هدایت الله افوشتەای نطنزی، منبع پیشین، ص ص٢٦٠ — ٢٦٢.

([١٣٩]) کارل بروکلمان، المصدر السابق، ص ٥٠٢.

([١٤٠]) ادوارد براون، منبع پیشین، ص ١١١.

## ملخص البحث

البحث الموسوم بـ (الاوضاع السياسية في ايران خلال سنوات ١٥٢٤–١٥٨٧م) والذي يبدأ بارتقاء الشاه طهماسب الاول الى السلطة سنة ١٥٢٤ الى ان خلع (محمد خدابند) عن السلطة وتعين الشاه عباس الكبير شاهاً على ايران سنة ١٥٨٧، يعتبر من الفترات السياسية المهمة في ذلك الوقت، وكان له أثر عميق ومباشر في توازن القوى في المنطقة بشكل عام، وفي ايران بشكل خاص. كما ان وفاة الشاه اسماعيل الاول سنة ١٥٢٤ وتداعياته في تفكيك الدولة الصفوية من جانب، وحملات دول الجوار العسكرية مثل (الاوزبك و العثمانيين) في عمق الاراضي الصفوية من جانب آخر، قد زادت من توتر الاوضاع، في هذه المرحلة العصيبة كانت ايران بحاجة الى شخصية قوية متنفذة، ليخلص البلاد من حالة التفكك، وانقساماتها الداخلية، ويعتبر الشاه طهماسب الاول الفاعل الرئيسي لانجاز الهدف المذكور آنفا. بتعبير آخر فانه يجعل من الدولة الصفوية من حالة التشتت الى حالة التوحد تحت قيادة موحدة، رغم ان طهماسب الاول قد استطاع ولما لا يقل عن نصف قرن من الاحتفاظ باركان واعمدة الدولة الصفوية، الا ان وفاته سنة ١٥٧٦ قد قضى على الآمال المنشودة واعاد بالبلد الى خطواتها السابقة، واستفحال امر القزلباش مرة اخرى وخلافاتهم الداخلية ومجيء عدد لا بأس بها من الحكام الضعفاء.

يتألف الدراسة من مقدمة وأربعة مباحث مع اهم النتائج التي توصل اليها البحث. فالمبحث الاول يتناول فترة حكم القزلباش (١٥٢٤–١٥٣٣م) وخاصة الصراع والخلافات فيما يتعلق بمسالة الوصاية ورعاية الشاه طهماسب، ومن ثم كيفية تخطي الشاه الموانع التي كانت امامه. وأما المبحث الثاني خصصت للتهديدات الخارجية والذي يتمثل في مخاطر الاوزبك من جهة الشرق والدولة العثمانية من جهة الغرب، مع ذكر لأهم الحوادث السياسية والعسكرية في فترة حكم السلطان (سليمان القانوني) الذي يعتبر من أقوى سلاطين الدولة العثمانية آنذاك.وفي المبحث الثالث من الدراسة نشير الى مواقف الشاه طهماسب الاول تجاه الحوادث الجارية كقيامه باعادة تسليم بايزيد ابن السلطان سليَمان، وقيامه بمنح اللجوء لـ(همايون بن بابر). اما المبحث الرابع والاخير فيتناول الاوضاع السياسية في ايران خلال سنوات (١٥٧٦–١٥٨٧م) والتغيرات التي أعقبت وفاة الشاه طهماسب، منها عودة القزلباش الى الحكم مرة أخرى واستعادة سلطانهم في الدولة، وكذلك ظهور الخلافات بين افراد عائلة طهماسب بغرض الوصول الى سدة الحكم.

## Abstract

This study entitled 'Iran's political situation between 1524-1587' which started from (Shah Tahmasib I) reign in 1524 to the exile of Muhammad Khudaband from the rule and nominating (Shah Abbass ) the great as Iran's Shah in 1587. This period is full of the significant political changes that had a deep and direct effect on the power balance change in this region generally and on Iran's political, economic and social situation in particular.

The death of (Shah Ismail I) in 1524 and its effects on the disintegration of the Iran's territorial unity and the military campaigns by the neighboring forces (Ozbags and Ottomans) into the Iran's territory made the situation more complicated. Therefore, this situation needed someone who has a good personality to rescue Iran from bad this condition. For this purpose (Shah Tahmasib I) become the main character to do this work because his appearance is the beginning of a new history in Iran .

This study consists of an introduction, four chapters and a conclusion.The first chapter discusses the Qizelbash's reign and their control (1533- 1524) particularly the dispute and struggles between them on the monitoring Shah Tahmasb's troubles, then the success of Shah on their problems. The second chapter is an overview about Shah Tahmasb and the foreign risks which included the Ozbags risk in the East and the Ottomans in the West. In addition, the significant events in this time that was simultaneous with Sultan Sulaiman Qanuni who was recognized as the strongest Ottoman sultan.. The third chapter is the most significant incidents related to shah Tahmabs with more focus on the Tahmasb's positions toward the surrender of Bayazed the son of sultan sulaiman . Moreover ،it shows Shah Tahmasb's positions in front the Hamayon's immigration, the son of Babar. The last chapter is about Iran's political situation during (1576-1587) and the changes that occurred after Shah Tahmasb's death, it includes returning the power and authority to Qizelbashes and the emergence of conflict among the Tahmasb's descendants on the throne.

# کاریگەری کارەساتە سروشتییەکان لە پەیدابوونی تەنگژەی ئابووری لە کوردستان

## لە سەدەکانی (٦-٨ك/١٢-١٤ز)

**م.ی.مەهدی عوسمان هەروتی**

کۆلیژی پەروەردە/ زانکۆی کۆیە
mahdiharuti@gmail.com

**پێشەکی:**

سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلامی لە کوردستاندا بەتایبەتی هەرسێ سەدەی ٦-٧-٨ك/١٢-١٣-١٤ ز کە ماوەی دیاریکراوە بۆ ئەم توێژینەوەیە، سەرەڕای لایەنە پرشنگدارەکانی، پڕبوو لە رووداو و کارەساتی ناخۆش و دژوار ئەم رووداو و کارەساتانە کاریگەری درێژخایەن و بەرچاویان بەسەر کوردستاندا بەجێهێشت و رۆڵی کاریگەریان هەبوو لە ڕەنگرێژکردنی دوارۆژی ئەم وڵاتە.

ئەم توێژینەوەیە تایبەتە بە دیاریکردنی کاریگەری کارەساتە سروشتییەکان لەسەر ئەو تەنگژە ئابوورییانەی کە لەماوەی ناوبراودا لەکوردستان روویاندا. بێگومان ئەم کارەساتە سروشتییانە تەنیا هۆکاری کاریگەر نەبوون بۆ دروستکردنی ئەم تەنگژە ئابوورییانە، بەڵام زۆرجار کاریگەری بەرچاویان هەبوو لەم بوارەدا بەتایبەتی وشکەساڵی و شاڵاوی زیندەوەرە زییانبەخشەکان بەتایبەتی کللۆ کە زۆرجار دەبوونە هۆی مایەپووچ بوونی جووتیاران و پرۆسەی کشتوکاڵ هەروەها بارینی بەفر و کەوتنی تەزرە و سەهۆڵبەندانیش زۆرجار بەروبوومە کشتوکاڵییەکانیان لەناو دەبرد، لافاو و بای بەهێزیش هەندێ جار هەمان کاریگەری خراپیان هەبوو بێگومان بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و پەتاش کاریگەری نێگەتیڤیان لەسەر کرداری بەرهەمهێنان هەبوو .

**دەروازە:**

مەبەست لە تەنگژە ئابوورییەکان: ئەو تێکچوون و شێواوییە لە ناکاوەیە کە بەسەر باڵانسی لایەنێك لە لایەنەکانی چالاکی ئابووری دێت، یان بەسەر هەموو چالاکییە ئابوورییەکان.

وە هەروەها ئەو کاتە تەنگژە دێتە ئاراوە، کە کێشەیەك لە باڵانسی نێوان هۆکاری خستنەرووی داواکاری یان پێداویستی دروست دەبێت، لە ئەنجامدا تەنگی و کێشە لە باڵانسی نێوان بەرهەمهێنان و بەکارهێنان دێتە بوون[1].

دەکرێت بەو جۆرەش پێناسە بکرێت هەروەکو (ابو الرشتة) دەڵێت: ((ئەو شێواوییە بەهێزەیە لە جێبەجێکردنی کاروباری دارایی دەوڵەت کە پێویستی بە فێرۆدان و خستنەرووی توانایەکی زۆر هەیە بۆ لادانی و گێڕانەوەی بارودۆخ بۆ جێگیری، وە مەبەست لە تەنگژەی ئابووری ئەو کێشە و خەلەلە سادەیە نییە کە لە کاروباری دارایی هەیە و دەکرێت چارەسەر بکرێت بە هۆکاری سادە و ساکار بە ئاسانترین رێگا[2].

کەواتە تەنگژەی ئابووری وا دەناسرێت، کە هەر کێشەیەك روویدات لە داهات و بەروبوومی دەوڵەت بەهۆی هۆکاری سروشتی یان مرۆیی و کاریگەرییەکەشی کاردانەوەی پێچەوانەی هەبێت لەسەر دەوڵەت و تاکەکەس، بێگومان کشتوکاڵ و بەربوومە کشتوکاڵییەکان سەرچاوەی سەرەکیی خۆراك و بژێویی مرۆڤن، ئەگەرچی بازرگانی و پیشەگەریش لەم بوارەدا رۆڵی خۆیان هەیە بۆیە هەر نەهامەتی و کەموکورییەك لە بەرهەمی کشتوکاڵی هۆکارێکە بۆ سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری و پەیدابوونی مەترسی لەسەر ژیانی رۆژانەی مرۆڤ. بە تایبەتی کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی وەك کۆمەڵگەی کوردستان لەو ماوەیەدا کە سەردەمی توێژینەوەیە، چەند هۆکارێك مەترسییان لەسەر کشتوکاڵ و داهاتەکەیدا دروست دەکرد کە دەتوانین بڵێین هەندێکیان هۆکاری سروشتین و پەیوەندییان بە کەشوهەواوە هەبووە، هەندێکی تریشیان هۆکاری مرۆیین و پەیوەندییان بە خودی مرۆڤ لە شەڕو هێرشکاری و سیاسەتی دەسەڵاتدارانەوە هەیە. بەڵام ئەوەی جێگای باسی ئێمەیە تەنها هۆکارە سروشتییەکانن .

گومانی تێدا نییە کارەساتە سروشتییەکان یان هۆکارە سروشتییەکان بە گشتی کاریگەریی زۆریان هەبوو لەسەر دروستکردنی تەنگژەی ئابووری چ لە داڕمانی ژێرخانی ئابووری ناوچە کوردییەکان بێت یان سەرخان ، وە کاریگەری ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆشیان لەسەر خودی کەسەکان و دام دەزگای دەسەڵاتداری ئەو سەردەمەدا هەبووە. وەگرنگترینیشیان ئەمانەن:

**یەکەم: وشکە ساڵی:**

وشکە ساڵی یەکێکە لە دیاردە هەرە مەترسیدارەکانی ژینگە کە بەسەر زۆربەی ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا دێت، سەردەمە جیاوازەکانی مێژووش چەندین ڕووداوی لەو جۆرەی بە خۆوە بینیوە و تۆمارکراوە، کە لە بنەچەدا بەهۆی کەمی باران بارین یان نەبارینی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو[٣]، ئەمەش دەکرێت ببێتە هۆی لەناوبردنی کشتوکاڵ و نەهاتی ، بەمەش برسیەتی، نەخۆشی، و مردن و کۆچی بە کۆمەڵ بۆ ناوچەی شێداری لێدەکەوتەوە، بۆیە ئەو برسیەتیەی کە پەیدا دەبێت لەسەرخۆترین کارەساتە و بە قۆناغ کاریگەری دەست پێدەکات، وەکو تەنگژەیەکی ئابووری، کە سەرەتا بارانی چاوەڕوانکراو نابارێت، و ئینجا کشتوکاڵ دەپووکێتەوە و پاڵپشتی خۆراکی نامێنێ لە کۆتاییدا برسیەتی دێت، قاتوقڕیش بە پێچەوانەی کارەساتەکانی دیکەی وەکو بوومەلەرزە لەبری کۆکردنەوەی خەڵك بە دەوری یەکتر بۆ یارمەتی، پەرتەوازەیان دەکات، و دەست دەکەن بە ململانێ لەسەر خۆراك و ژیان[٤]، سەبارەت بەبوونی ئەو دیاردەیە لە کوردستان گومانی تێدا نییە، لەبەر ئەوەی کشتوکاڵی کوردستان کە بڕبڕەی ژیانی ئابووری بوون لەو سەردەمەدا ـ دەتوانین بڵێین ئێستاش– بەڕێژەیەکی زۆر پشتی بە باران بارین دەبەست. واتە دێمی بوو بۆیە وشکە ساڵی و نەبارینی باران یان کەمی ڕێژەکەی لە ناوچەیەك نەهامەتی لێ پەیدا دەبوو.

هەرچەندە ناوچە کوردییەکان لەلایەن زۆر لە گەڕیدەکان بەناوچەیەکی دەوڵەمەندی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری، و گرنگیدان و زۆری ئاوەکانی ناوچەکەیان ناسراون، ئەوەتا هەروەکو (ابن حوقل) لە بارەی شاری جەزیرەی ئیبنو عومەر دەڵێت : ((داروبار و بەڕوو و ئاوی زۆری هەیە...)) [٥]. لەبارەی (سەیمەرە) و سیروان، (الاصطخري) دەڵێت: ((ئاو و داروبار و کشتوکاڵی زۆری لێیە و جێگای خۆشی و رابواردنن))[٦]. وە لەبارەی ناوچەی ( شقلاباد) شەقلاوە وڵاتناسان دەڵێن: (( خاوەنی مێو و ڕەز و بێستانی زۆرە، و ترێیەکەی دەگوازرایەوە بۆ هەولێر بە درێژایی ساڵ و پێویستی دانیشتوانی شارەکە لە ترێ تا ڕادەیەکی زۆر دابین دەکات)) [٧]. یاخود وەك (الصفدي) لە بارەی شاری مەلاتیە دەڵێت: (( لە دەرەوە و دەوروبەری شارەکە بێستانی زۆر هەبوو، کە جۆرەها میوەجاتی لە خۆ

دەگرت، هەروەها رووباری پێدا دەڕۆیشت، و لە هەمان کاتدا کانی و کاریز و کۆمەڵێك سیفاتی هەبوو...))[٨] ئەمە و چەندین دەقی دیکە لەو بارەیەوە .

هەرچی تایبەتیشە بە ئاژەڵداری بە هەمان شێوە چەند ئاماژەیەك هەیە کە گەشاوەیی ئەو بوارەش نیشان دەدەن. هەروەکو (ابن حوقل) کاتێك بەراوردی شاری ماردین دەکات بە چەند شارێکی تر دەڵێت: (( وەکو ئەرزن و میافارقین نییە لە چۆڵبوونی لە خانوو و ماڵ و نەبوونی ڕەز و باغ... کەمی مەڕ و ماڵات))[٩].

هەروەها زۆریی ئاژەڵی مەڕ لە دونەیسەری سەر بە دیاربەکر سەرنجی گەڕیدە ( ابن جبیر)ی راکێشاوە کە بڵێت: مەڕو ماڵاتی بە ژمارەی زۆر لەو ناوچەیەدا هەیە[١٠].

هەروەها لەبارەی بوونی ژمارەیەکی زۆری کانی و سەرچاوەکانی ئاو لە ناوچە کوردییەکان بە هەمان شێوە ئاماژەی زۆر لە کتێبی گەڕیدەکانی وەکو (یاقوت الحموي[١١]، مقدسی[١٢]) و قزوینی[١٣] و چەندینی تر..) دەبینرێت[١٤]. کە مانای دەوڵەمەندیی ئەو وڵاتە دەبەخشن لە رووی سەرچاوەکانی ئاوەوە.

سەرەڕای ئەمانەی باسکران ، ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە رێژەی ئەو زەوییە کشتوکاڵییانەی کە دێمینە و بەپشتبەستن بە باران دەچێندرێت چەندین هێندەی ئەو زەوییانەن کە پشت بە جۆرێکی تری ئاودێری دەبەستن ، لەبەر ئەوە تێبینی دەکرێت کە زۆرترین کشتوکاڵی کوردستان دێمییە بۆیە گەنم و جۆ سەرەکیترین بەرهەمی داچێنراوی ناوچەکەن[١٥]. لەگەڵ ئەمانەشدا کە ئاماژەیان بۆ کرا ، ناوچە کوردییەکان سەرچاوەی سەرەکین بۆ زۆر لەو رووبارانەی کە دەڕژێنە ناوچەکانی دەوروبەر، بەڵام بە رێژەیەکی ئەوتۆ سوودی لێ نەبینراوە، لەبەر ئەوەی لە زۆربەی ئەو شوێنانەی رووبارەکانی پێدا دەڕوات زەوییە کشتوکاڵییەکان شوێنیان بەرزترە - لە کەنارەکان چونکە ئەو پێدەشتانە زۆربەیان لە نێوان چیاکانن، و شوێنیان بەرزە.

جۆرێکی تری ئاودێری کە بەکارهێنراوە لە کوردستان ئاوی کانی و کاریزەکانە ئەوەتا هەروەکو (المقدسي) ئاماژەی بۆ دەکات، (لە شاری رەئسولعەین (٣٦٠) کانی ئاوی پاك هەبووە و سوودی لێوەرگیراوە بۆ ئاودانی بێستان)[١٦]. یان هەروەکو (الاصطخري) دەڵێت: ((کێڵگە و بێستانەکانی

نوســەیبین بــە ئــاوی ئــەو كانییــە ئــاو دەدرا كــە لــە گردەكــانی دەوروبــەری هەڵدەقوڵا[١٧])). بەڵام ئـەوەی شـایانی باسـە ئەوەیـە كـە ئـەو كـانی و كارێزانـەی لەبەر ئەوەی زۆربەیان لە ناوچەی پێدەشت و گوندە شـاخاوییەكانن بۆیـە ئـەویش كەمتر سوودی لێوەرگیراوە[١٨].

هەروەها ئەو بەشەی ناوچە كوردییەكان كە پشـت بـە بـاران دەبەسـتێت لـە كشتوكاڵكردندا، ئینجا بە هۆی بەرزی زەوییەكەی بێت وەك باسكرا، یان دووری لە ڕێڕەوی رووبار و زێیەكان، بەهۆی كەمی ڕێـژەی سـاڵانەی بـاران بارینـەوە كـە بـە نزیكەی ٣٠٠ملم/ ٢٥٠ ملم مەزەندە دەكرێت[١٩]، یان نـەبارینی لـە وەرزی پێویسـت خۆیدا كە بریتییە لە ماوەی نێوان مانگی تشرینی یەكـەم تـاكو نیسـان[٢٠]، ئەوانـە ئەو بارودۆخە دروست دەكەن لە كوردستان كە پێی دەوترێت وشكە ساڵی[٢١].

یاخود ئەو بارانە ئەگەر ناوەخت بێت ئەوە سامناكترین نەخۆشـی دەغڵـودان دروسـت دەكـات كـە پێـی دەوترێـت ژەنـگ یـا ژەنگـی دەریـایی ــ مـەراكیش ــ مامەلی[٢٢]. واتە ئەگەر ئەو جۆرە بارانە نەبارێت كە پێی دەگوترێت (پەڵـە) كـە بـۆ ڕوانی دەغڵودان گرنگە [٢٣]، ئەوەتا هەروەكو (ابن الجوزي) لە ڕووداوەكـانی سـاڵی ٥٧٤ك/ ١١٧٨ز ئاماژە بەوە دەكات كە لە مانگی كانوونی یەكەم و نیسـان كـەمێك باران لە ناوچەكانی موسڵ بـاریوە بـەڵام لەمانگـەكانی كـانونی دووەم و شـوبات و ئازار هیچ بارانێك نەباریوە بۆیە، وشكە سـاڵی هاتۆتـە ئـاراوە و گرانـی لێ دروسـت بووە كە تەنانەت كاریگەری كردۆتە سەر ڕێژەی ئاوی دیجلەش[٢٤]، كە ئەمە مانای بوونی هەمان بارودۆخ دەكات لە بەشەكانی دیكەی كوردستان.

هەروەها باران بارینەكەش سەرەڕای ماوە و ڕێژەكەی ، جۆرەكەشی گرنگی زۆری هەیە بۆ كشتوكاڵ، واتە تا چەند جۆری بارانەكە كاریگەری (فعالیة)ی تیایە، واتە المیتولوجی نەبێت[٢٥]. ئەوەتا هەروەكو مێژوونووسان لە سـاڵی ٦٢١-٦٢٢م/ ١٢٢٤-١٢٢٥ ز باس لە بوونی بـاران بـارینی مـاوە جیـاواز دەكـەن لـە ناوچـەكانی هــەولێر و موســڵ، بــەڵام نەبۆتــە هــۆی بــە تــەواوی پێگەیشــتنی بەرهەمــە كشتوكاڵییەكان، لە ئەنجامدا گرانی لە نرخی خۆراك دروست بووە [٢٦].

ئـەوەی جێگـای ئاماژەیـە ئەوەیـە كـە ئـەو ناوچـانەی كوردنشـین بـوون و پشتیان بە رووبار و زێ و جۆگەلەكان دەبەستا، وەكـو ئـەوەی ئـەو سـەردەمە لـە

ناوچەی جەزیرە لە كەناری هەردوو رووباری دیجلەو فورات و لقەكانیان بە تایبەتی زێی خاپوور كشتوكاڵی چڕ دەكرا[٢٧]. بەڵام ئەمانەش لە ئەنجامی كەمی باران بارین و بەفرو وشكە ساڵی بە گشتی كاریگەرییان لەسەر دەبێت و ئاوەكەیان لە كەمی دەدات [٢٨]. یان نموونە وەك ئەوەی لە ساڵی ٥٣٤ك/ ١١٣٩ز لە ئاوی دیجلە روویدا[٢٩]. لەبەر ئەوەی وەك دەزانرێت سەرچاوەی سەرەكی رووبارو زێیەكانیش هەر ئەو باران و بەفرەیە كە دوای توانەوە دروستیان دەكەن[٣٠]، بەڵام بە گشتی ئەو ناوچانەی لە كشتوكاڵدا پشت بە باران دەبەستن زیاتر بەرەو رووی وشكە ساڵی دەبنەوە بە هۆی دوورییان لە رووبار و زێیەكان [٣١].

هەروەها ئەو وشكە ساڵییەی لە كوردستان دروست دەبوو كۆمەڵێك زیانی ئابووری و مرۆیی گەورەی بەدوای خۆیدا دەهێنا هەر لە لەناوبردنی كێڵگە كشتوكاڵییەكان و وشكبوونیان، وەك ئەوەی كە لە رووداوەكانی ساڵی ٥٤٨ك/ ١١٥٣ز مێژوونووسانی سریانی باس لەوە دەكەن كە ناوچە كوردییەكانی وڵاتی نێوان دوو رووبار هیچ بارانێكیان تێدا نەباریوە و بە هۆی تووڕەبوونی خوداوە تووشی وشكە ساڵی و گرانی و برسیەتی بوونەتەوە، سەرەڕای وشكبوونی ڕەز و باخەكان، خەڵكێكی زۆریش مردوون[٣٢].

هەر بە هۆی ئەو دیاردەیەوە بێگومان ژمارەیەكی زۆری ئاژەڵیش بەرەو رووی قاتوقڕی و لەناوچوون دەبوویەوە. كە ئەویش خۆی لە خۆیدا بەشێكی گرنگی ئابووریی كوردستانی پێكدەهێنا.

یەكێكی تریش لە زیانە گەورەكانی وشكە ساڵی لە ناوچەكەدا ئەوەبوو كە گرانی لە نرخی خواردەمەنی و قاتوقڕییەكی زۆری بە دوای خۆیدا هێنا هەروەكو ئەوەی لە ساڵی ٥١٨ك/١١٢٤ز لە موسڵ و جەزیرە و دیاربەكر و چەندین ناوچەی تری جیهان روویدا [٣٣]، یاخود ئەوەی لە ساڵی ٥٧٤-٥٧٥ك/ ١١٧٨-١١٧٩ز لەهەولێر و جەزیرە و دیاربەكر و عێراق و شام و موسڵ و هەرێمی چیا و خەڵات روویدا گرانییەكی گشتی لە جیهان هێنا ئاراوە ،بەگوتەی (ابن المستوفی) تاكو ساڵی ٥٩٩هـ/١٢٠٢ز بەردەوامی هەبووە [٣٤]، كە وەك ناوبراو لە درێژەی رووداوەكە باس لەوە دەكات هەر چوار (مكوك)[٣٥] گەنم لە هەولێر بە دینارێك فرۆشراوە، ئەمە و چەندین نرخی تری خواردەمەنی وەكو هەنار و مریشك...[٣٦].

شایانی باسە ئەو گرانییە بە دوای خۆیدا برسیەتی زۆر گەورە و کاریگەری دەهێنا، لەبەر ئەوەی بەرە بەرە خۆراك رووی لە کەمبوونەوە دەکرد ئەوەی زیاتریش بارودۆخەکەی لەو سەردەمانەدا ئاڵۆزتر دەکرد ئەوەبوو کە لە کرداری بازرگانیدا کەمتر کڕین و فرۆشتن بەو کەلوپەلە کێش گەورانەی وەکو گەنم و جۆوە دەکرا لەبەر ئەوەی بە گواستنەوەی لەنێوان ناوچە جیاوازەکانی کوردستان و دەرەوەدا ئەزیەت و ماندووبوونی بەبەراورد لەگەڵ دەستکەوتەکانی زۆر زیاتر بوو، یان هەر نەدەتوانرا بەئەنجام بگەیەنرێت. تەنها لە نێوان ناوچەی نزیك لەیەکتر نەبێت ئەم کارە زیاتر ئەنجام دەدرا [٣٧]. بەڵام وەك دیارە ئەم قەیرانەی لە وشکە ساڵی دەهاتە ئاراوە زۆربەی جار کۆمەڵێك ناوچەی دەوروبەری یەکتری دەگرتەوە. بۆیە ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کە هەموو کەسێك نەتوانێت خۆراکی باش دابین بکات بە نموونە هەروەکو لە ساڵی ٧١٨ك/ ١٣١٨ز لە ناوچە کوردییەکانی وەکو هەولێرو جەزیرە و دیاربەکر و چەند ناوچەیەکی تر روویدا ژمارەیەکی زۆر تووشی مەرگەساتی گەورە بوونەوە، و مردن[٣٨]. تا لەئەنجامدا کەمی و دەست نەکەوتنی خۆراکی باش و بەسوود بە تایبەتی ئەو خواردەمەنییانەی وزە بەخشن بۆ مرۆڤ لە نێو ئەمانیش بۆ چینی کرێکار و پیشەگەر و جووتیاران کە بە پێی جۆری کارەکەیان پێویستییان بەو جۆرە خۆراکانە هەبوو زیاتر لە خەڵکی تر. لە نێو ئەو خواردنانەش کە لەو سەردەمەدا گرنگییان هەبوو بریتی بوو لە گۆشت، کە زۆربەی کات لەو بارودۆخەدا نرخی لە زیادبووندا بوو، وەك ئەوەی لە ساڵی٦٢٤ك/ ١٢٢٦ز لە موسڵ روویدا کە گۆشتی مەڕ زۆر کەم بوو، و ئەگەر هەشبوایە نرخەکەی زۆر بەرز بوو، کە هەر ڕەتڵێکی[٣٩]. بەغدادی لە موسڵ بە دوو حەببە[٤٠] یان زیاتر دەفرۆشرا لە بەهار[٤١] کەچی هەر لەو وەرزەدا لە ساڵانی پێشووتر هەر شەش ڕەتڵ یان حەوت ڕەتڵ بە ( قیراط) ێك[٤٢] دەفرۆشرا[٤٣]. بەڵام ئەو بارودۆخە تەنها ساڵێکی خایاند ، و لە ساڵی ٦٢٥ك/ ١٢٢٧ز کۆتایی بەو گرانی و وشکە ساڵییە هات [٤٤].

ئینجا بە هۆی دەست نەکەوتنی ئەم جۆرە خۆراکانە لە لایەن زۆربەی خەڵك، بووە هۆی ئەوەی بەرگریی لەشیان توانای کەم دەبۆوە، و کەمتر دەیانتوانی بەرەوڕووی بەکتریا و ڤایرۆسە گواستراوەکانی نەخۆشییەکان

ببنەوە. بۆیە ڕێژەیەکی زۆری خەڵك تووشی نەخۆشی درم و کاریگەر دەبوونەوە، و ژمارەیەکی زۆر لە ناو دەچوون بەو هۆیەوە یان بە هۆی برسیەتییەکە[٤٥]، یان ژمارەیەکیان کۆچیان دەکرد[٤٦]. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بارودۆخی پیشەگەر و جووتیارانی بەرەو خراپی دەبرد، گومانیشی تێدا نییە ئەمانەش کە بەدەستی کار هەژمار دەکرێن ڕەگەزێکی گرنگی هۆیەکانی بەرهەمهێنانن[٤٧]. لە کەمبوونەوە دەبن ، بەمەش کاریگەری دەبێت لەسەر جۆر و ڕێژەی، بەرهەمهێنان ، بەرەو خراپی دەڕوات. لە کۆتاییشدا تەنگژەی ئابووری لێدەکەوێتەوە.

### دووەم: زیندەوەر و ڕووەکە زیانبەخشەکان

هۆکارێکی دیکەی تەنگژە ئابوورییەکان کە ڕاستەوخۆ زیانی بە داهات و بەروبوومی کشتوکاڵی دەگەیاند. ئەوا زیندەوەرە زیانبەخشەکان بوون، کە لە هەمان کاتدا دەبوونە هۆی نەخۆشی بۆ کێڵگە کشتوکاڵییەکان لەمانیش وەك: کللۆی مەراکیش ــ خولانی ــ مشکە کوێرە ــ سن (سنە)ی گەنم[٤٨]ـــ ملە ـــ تڕ ترەـــ سیسکە ـــ مێشەپیاز ـــ مێشە شیناوردـــ کاردینای نۆك ـ یەنجە و چەوەندەرـ کرمی برك بڕ ـ کرمی ریشە خۆر ـ شەیتانۆکە. [٤٩].

لە هەموویان کاریگەرتر کللۆ بوو کە بەیەکێك لە ئافاتە کشتوکاڵییە هەرە کاریگەرەکان دادەنرێت، و لەمێژوودا ماوەماوە لەکشتوکاڵی دەدا، بەژمارەیەکی زۆر، کێڵگەکانی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەڕووتاندەوە[٥٠]، بە تایبەتیش لە وەرزی بەهار[٥١] و سەرەتای هاویندا[٥٢].

هەروەها وەك لە سەرچاوەکان دەردەکەوێت بەزیانترین کللۆ ئەو جۆرەیە کە پێی دەڵێن (سروە)[٥٣]، یان لەدەڤەری بادینان بە (بەش) ناودەبرێت ڕەنگی سپییە، و توانای فڕینی نییە کە لە بەر درێژایی ئەو ماوەیەی لەو شوێنەی لێی دەکەوێت و دەمێنێتەوە و زاوزێ دەکات، کە ماوەی مانگێك یان زیاترە، یان لەبەر زۆریی ڕێژەی گەراکانی وادەکات زیانەکانی زۆربێت لەهەمان کاتدا ئەم جۆرەیان بەمەترسیدارترین جۆر لەلایەن جووتیارانی کوردستان دیاریکراوە کە زیانی زۆر بەدانەوێڵە دەگەیەنێت[٥٤]. بەڵام کللۆی باڵدار کە لەلایەن کوردەکان بە (لووتك) ناودەبرێت. ماوەیەکی کورت لەسەر زەوی دەمێنێتەوە و دەفڕێت، واتە کەمتر لە

یەك شەو(٥٥)ئەم جۆرەیان زیاتر ڕەنگیان زەردە و زیانیشیان زیاتر بۆ ڕەز و باخـە نەوەکو دانەوێڵە، بەڵام بەگشتی ئەوەیان زیانی کەمترە لە جۆری یەکەم، کەوا لـە کاتی زیادبوونی پلەی گەرمی خـۆر، یـان لەبـەر سـەرما شـوێنی خـۆی دەگۆڕێـت. وەهەیانە کە لە ئاسمان دەفڕێت و چەند جۆرە ڕەنگێکی هەیـە(٥٦). ئەمـەو چـەند ناوێکی تریان پێدەڵێن وەکـو الحاسـە(٥٧) ــ الرحـال یـان ( الصـحراوي ـ بیابـانی)، جـێگیر( نیشـتـەجیٚ) یـان ڕوسـی ــ ( المهـاجر) کۆچـەری ئـەفریکی، و کۆچـەری ئاسیەوی، و مەراکیشی، سوور ـ میسری(٥٨).

زیانی زۆربـەیان لـەوە دەسـت پێـدەکات کـە دوای پێگەیشـتنی گەراکـەیان ڕاستەوخۆ دەست دەکەن بە خواردنی ڕنج و لاسك و بەرهـەمی کشـتوکاڵی، تـاکو توانای فڕین پەیدا دەکەن و کۆچ دەکەن بۆ شـوێنی تـر، بـەڵام مەترسـییەکەی لـە زۆری ژمـارەی هـەر کۆمەڵـە کللۆیەکـە کـە بەسـەر کشـتوکاڵدا دەدەن، وەلەبـەر بەپەلە و زۆر خـواردنی و زوو گواسـتنەوەی لـە شـوێنەکان، و لـەبنهێنانی زۆربـەی ئەوەی بەسەریدا تێدەپەڕێت(٥٩)، تەنانەت لە گژ و گیای وشکیش(٦٠).

شایانی باسە ئەم مەترسییە بەسەر کوردستان لەو کاتەوە هەست پێدەکرا. کاتێك هەزارەها کللـۆ لـە شـێوەی شـەپۆلی دەریـا ڕوویـان لـە ناوچـەیەك دەکـرد، جووتیارانی ئـەو ناوچـەیەی بـێ ئومێـد دەکـرد لـە دروێنـەی دەغـڵودانەکانیان، و کۆکردنەوەی بەری ڕەنج و ماندووبوونیان بێگومان مەترسی هێرشی کللۆ کـە هـەر چەند ساڵێك دووبارە دەبۆوە، تەنها ناوچەیەکی دیاریکراوی نەدەگرتەوە بەڵکو لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی تر دەپەڕییەوە. بەنموونە ئەو هێرشەی کللۆ کە لە سـاڵی ٦٢٠ــ/ ١٢٢٣ز هەموو ناوچەکانی عێراقی ئەو کاتە و هەرێمی جەزیرە، و دیاربـەکر و شامی گرتەوە(٦١).

واتە مەترسییەکە بە شێوەیەکی گشتی بوو، و ناوچەیەکی زۆری دەگرتەوە، و بەلێشاو لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی دیکە دەچوو(٦٢)، هـەروەکو ئـەوەی کـە لـە ساڵی ٥٤٦ك یان ٥٤٧ك/١١١١ یان ١١١٢ز هێرشێکی گەورەی کللۆی زیانبەخش لـە موسڵەوە دەستی پێ کرد و تا جەزیرە بەردەوام بوو، و کاریگەرییەکەشـی حـەوت ساڵان بەردەوامی هـەبوو تـاکو دیاربەکریشـی بـەرەوڕووی برسـییەتی و قـاتوقڕی کردەوە(٦٣).

یان ئەو رووداوانەی کە هەر یەك لـە سـالانی ٦٢٠–٦٢١ك/ ١٢٢٣و ١٢٢٤ز[٦٤]. لە هەولێر و عێراق و جەزیرە و موسڵ و دیاربـەکر و زۆربـەی شـام  روویـدا کـە لـە ئــەنجامی هێرشــی کللــۆ و نــەبارینی بــاران هاتــە  ئــاراوە، زۆربــەی  کێڵگــە کشتوکاڵییەکانی  لە نێو برد و برسیەتی و گرانیی نرخ هاتە ئاراوە[٦٥].

ئینجا بە گواستنەوەی ئەو کللۆیانە بۆ شوێنی تـر برسـیەتی و قـاتوقڕی بـۆ خەڵکەکەی دەهێنا ، و تەنانەت بە جۆرێك پەرەی دەسـەند کـە چـەند ناوچـەیەکی دەگرتەوە[٦٦]، زیانی زۆری ئابووری و مرۆیی لێدەکەوتەوە، هەروەك بە نموونە ئەو برسـیەتییەی  لـە سـاڵی ٧١٨ك ١٣١٨ز  سـەرەتا لـە ناوچـە کوردییـەکانی وەك شــەنگار و دواتــر موســڵ و هــەولێر و جــەزیرەی ئیبنــو عومــەر، و دیاربــەکر، و میافــارقین و چــەند ناوچــەیەکی  تــر دروســت بــوو[٦٧].  یــەکێك لــە هۆکــارە سەرەکییەکەی هێرشی کللۆ بوو کە بارودۆخی ناوچەکانی کوردستان گەیشتبوو بە ڕادەیەك خودی مـرۆڤ بفرۆشـرێت و بکرێـت بـە ژەمـە خواردنێـك ، بـە تایبـەتی لـە شاری هەولێر[٦٨].

ئەگەرچـی داهــاتی  دیاربــەکر و موســڵ و دەوروبــەری کــە ئــەو ســەردەمە هەولێریشی دەگرتەوە لە ساڵی ٧٣٦ك/ ١٣٣٥ز بـە (١٩٢٥٠٠٠) دینـار، و لـە سـاڵی ٧٥٠ك/ ١٣٤٩ز بە ( ٣٤٠٠٠٠) دینـار مەزەنـدە کـراوە[٦٩]. بـە تایبـەتیش ئـەو کاتـە شـاری هــەولێر وەك (مسـتوفی القـزويني) دەڵێـت: ((بـە گـەنم و لۆکـە بـەناوبانگ بـوو))[٧٠]. وە شـەنگاریش کـە دەکەوتـە ناوچـەیەکی دەوڵەمەنـد بـە بێسـتان و میوەجات لە هەمووشیان زیاتر بە زەیتوون و ترێی باش ناسرابوو[٧١].

هـەر لەبـەر ئەوەیـە لـە زۆربـەی  سەرچـاوەکان نـاوی کللـۆ بەسـتراوەتەوە بـەناوی وشـکە سـاڵی و  برسـیەتی و گرانیـی نرخـی خـۆراك، و قـاتوقڕی واتـە بـە بەشێکی هەرە گرنگی  ئەو کارەساتانە لێکدراوەتـەوە کـە دەبنـە هـۆی تەنگـژەی ئابووری[٧٢].

بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە هەندێك جـار  ئـەم هێرشـانەی کللـۆ بە زیانی کەم تێپەڕبوون، وەکو ئەو هێرشەی لە سـاڵی ٧٤٧ك/ ١٣٤٦ز لـە بـەرەی ڕۆژهەڵاتی  حەلەب[٧٣]. کرایە سەر شـارەکە، هەرچـەندە خـەڵکی تووشـی تـرس و

دڵەڕاوکێی زۆر کرد، بەڵام زیانی ئـابووری کـەمی نایـەوە[٧٤]. هـەروەکو یـەکێك لـە شاعیرانی ئەو سەردەمە لەبارەیەوە دەڵێت:

(( رجل جرادٍ صدهً عن الفساد الصمدُ

فكم و كم للطفه في هذه الرجل يد)) [٧٥]

یاخود جاری واش هەبوو هیچ زیانێکی لیّ نەکەوتۆتەوە بە نموونە لە شـاری مەڵاتیـە و ڕوهـا (ئورفـە) سـاڵی ٥٢٧ك/ ١١٣٢ز ئەگـەر چـی تووشـی هێرشـێکی گەورەی کللۆ بوونەوە، بەڵام هیچ زیانێکیان بەناوچەکە نەگەیاند بۆیە بە موعجیزە لێکدراونەتەوە لە لایەن سەرچاوەی مێژوویی سریانی ( مار میخائیل) [٧٦].

سەرەڕای ئەوە گەلێك جار باڵندەش کە ڕێژەی زیـادی دەکرد لـە ناوچـەیەك دەبووە مەترسی بۆ سەر کێڵگە کشتوکاڵییەکان کە هەڵدەستان بـەخواردنی تـۆوی داچـێنراو، هـەروەکو ئـەوە لـە سـاڵی ٦٠٩ك/ ١٢١٢ز [٧٧]. یـاخود هەڵدەسـتان بـە خواردنی بەرهەمی کێڵگەکان.

هەروەها مەترسی مشکیش لەسەر کشتوکاڵ و تەنگژەی ئابووری زۆر کـەمتر نەبوو لە کللۆ، ئەوەتا هەروەکو (العینی) ئاماژە بەوە دەکات کە لـە سـاڵی ٦٥٩ك/ ١٢٦٠ز لە زەوی حۆران و جولان و دەوروبەری مشـکێکی زۆر دەرچـوو، و نزیکـەی ٣٠٠٠٠٠ هـەزار ( غـرارەی) [٧٨] گـەنم جگـە لـە جۆیـان خـوارد و گـەنم لـەو سـاڵەدا (مکوك) ی بە چوارسەد درهەم فرۆشرا [٧٩].

شایانی باسە بوونی مشکی زۆر لە ناوچەی پشدەر لە ٦٢٥ك/١٢٢٧ز زیانی زۆری بە خەڵکەکەی گەیاند، هەروەکو ئەمـەش لـە ئـەنجامی شـەکوای یـەکێك لـە دەسەڵاتدارانی ناوچەی ناوبراو بە ناوی (غازی کوڕی مودود کـوڕی خضـر کـوڕی سودکین، ابو المظفر الحموي ناسراو بە ابن الطفسي) کە سەر بـە فەرمانڕەوایـەتی سـوڵتان (مظفـر الـدین کوکبـوری) خـاوەنی هـەولێر بـوو دەردەکـەوێت لـە ڕێگـەی نامەیەك کە بۆ (ابن المستوفي) بەرپرسی پۆستی (استیفاء)ی هەولێر لە چەند دێـرە شـیعرێکدا دەنووسـێت و شـەکوای خـۆی لـەبارەی تەنگژە و خراپیـی بـارودۆخی پشدەر لەبەر بوونی زیندەوەری زیانبەخش وەك مشك و دووپشك و کـێچ دەخاتـە ڕوو[٨٠].

وەك دەڵێت:

( ... الفأر يصوي دائبا          من جوعه لامن بَطر
وعقارب صفر يطا          برسُمَها مثل الشرر
و براغث يبعثن بی          فكانها وخز الابر
و عقارق ينعبن بی          وقت العشاء الى السحر
هذا ولا تخت لدي فاين منهن المفرً ...)[81].

سەرەڕای بوونی مەترسیی ئەو زیندەوەرانەی باسکران کە مەترسی زۆری ڕاستەوخۆیان بۆ سەر کشتوکاڵ هەبوو، ئەوا لە سەرچاوەی مێژوویی گەڕیدەکاندا ئاماژە بە کۆمەڵێك زیندەوەر و گیانلەبەری تری زیانبەخش کراوە، کە ناوچە کوردییەکانی وەکو شاری نوسەیبین کە بە دووپشکی بکوژ بەناوبانگ بوو[82]، یان چیای ماردین کە هەر لە نزیکی ئەو شارەیە بە جۆرێك مار ناسرابوو کە زۆر بەپەلە نێچیرەکەی دە گەزی[83] و دەیکوشت.

هەروەها شاری بندنیجین بە هەمان شێوە بە دووپشك و مار و گێچ و گورگ بەناوبانگ بوو[84].

ئەمەو سەرەڕای ئەوەی بە شایەتی هەندێك لە مێژوونووسان لە هەندێ ساڵدا ئاژەڵی وەك گورگ و بەراز، و زیندەوەری وەك دووپشك و مار زیادیان کردووەو مەترسییان لەسەر کشتوکاڵ و مرۆڤ دروست کردووە. بۆیە هەوڵیان داوە ڕاویان بکەن و بیانکوژن[85].

ئەوەی لێرەدا پێویستە باس بکرێ ئەوەیە کە ئەم زیندەوەرانەی وەکو مارو دووپشك یان دووپشکی باڵدار[86] زیاتر زیانیان ڕاستەوخۆ بۆ مرۆڤەکان هەبوو، بەڵام ئەوانی تر کە لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کرا وەکو کللۆ و مشك و بەراز... ئەوانیتر. زیان بە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری دەگەیەنن و ناڕاستەوخۆ لە ئەنجامی زیانگەیاندن بە خۆراکی مرۆڤ و دروستکردنی تەنگژەی ئابووری زیان بە خەڵك دەگەیەنن.

**سێیەم: نەخۆشی و پەتا**

**أ/ مرۆیی:**

سەرەتا دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە تەنگژەی ئابووری چەندین کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر ژیانی مرۆڤ هەیە، وە لە زۆربەی کاتدا بۆتە

هەڕەشەیەکی گەورە لەسەر مانەوەی خەڵك. لەهەمان کاتدا ئەگەر تێبینی بکەین دەبینین کە تا چ ڕادەیەك وابەستەیی هەیە لە نێوان ڕووداوەکانی قاتوقڕی و برسییەتی و گرانیی نرخ و چەندین هۆکاری دیکەی قەیرانی ئابووری، جا سروشتی بێت یان مرۆیی، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی پەتا و نەخۆشی درم و لەناوبەر تاکو بۆتە کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوان ئینجا بە مردن بێت یان کۆچ ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی زەوییەکی زۆر و فراوان بە بەراوی جێبهێڵدرێت و دانەچێنرێت، و دووکان و بازاڕگە و شوێنە بازرگانییەکانیش، خەڵکێکی ئەوتۆی تێدا نەمێنێت مامەڵەی تێدا بکات، هەروەکو ئەوەی لە ساڵی ٧١٨ك/ ١٣١٨ز لە شاری میافارقین و جەزیرە ڕوویدا. تەنها چەند دووکانێك مابوویەوە کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرا لە ئەنجامی ئەو برسیەتییەی بڵاوبوویەوە[٨٧].

هەموو ئەمانەش کاریگەریی خراپی جێدەهێشت لە سەر بارودۆخی ئابووریی وڵات و قەیرانەکەشی قووڵتر دەکردەوە.

وە ئەگەر هاتوو ڕووداوی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە نێوان خەڵك لە زیادبووندا بوایە بە تایبەتی لەو کاتەی هاوکاتە لە گەڵ ڕووداوەکانی تری تەنگژە ئابوورییەکان ، لە ئەنجامی خواردنی خۆراك و خواردنەوەی خراپ و ماوەبەسەرچوو و لەبەر کەمی خۆراك و دەست نەکەوتنی و گرانیی نرخەکەی ژمارەیەکی زۆر لە کەسە لاواز و کەم دەرامەتەکان نەیاندەتوانی بە دەستی بێنن بۆیە دەبووە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاکە کەسی[٨٨]. لە ئەنجامی نەمانی بەرگریی لەش، و دواتر ئەم نەخۆشییەش پەرەی دەسەند و دەبوو بە پەتا و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك دەمردن یان لە ترسی ئەو پەتایە ئەوەی لە توانایدا بوایە کۆچیان دەکرد [٨٩].

لەبەر ئەوە ژیانی ئابووری لەبار دەچوو بۆ ئەو ماوەیەی کە نەخۆشییەکە بەردەوامی دەبوو، و هەروەها هێزی کاری بەرهەمهێنان بەشی زۆری لە نێو دەچوو[٩٠].

ئەگەر بێتو ورد بینەوە ئەوا هەندێك نەخۆشی وەك دیارە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی هەندێ ڤایرۆس و بەکتریا و چوونیان بۆ نێو لەشی مرۆڤ و مانەوەیان بە زیندوویی لە ناویدا و زیادبوونیان و لەنێوبردنی خانەکانی، و

کاریگەری لەسەر بەرزبوونەوەی پلەی گەرمیی لەش و لەدەستدانی حەزی خۆراک و سەرە سوورە و ڕشانەوە و سکچوون، و چەندینی تر دەبوو[٩١].

هەروەها بەشێکی تر لە نەخۆشی درم هەبوو وەکو سیل و زەهرەیی و (جذام ــ گولی) وە جۆری سێیەمیش هەبوو کە زۆر بە پەلە بڵاو دەبوونەوە وەکو (خوریکە و تاعوون) بە نموونە. زۆر لەو نەخۆشییانە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە هۆی نەبوونی دەرمانی سەرکەوتوو دژ بە هۆکارەکانی نەخۆشییەکە دەبوونە هۆی مردن[٩٢].

هەروەها (ابن خلدون) هۆکاری بڵاوبوونەوەی پەتا دەگێڕێتەوە بۆ ((پیسبوونی هەوا، بە زۆربوونی ئاوەدانی ، و تێکەڵاوبوون و زۆریی هەڵم و شێ و پیسی، و کاتێکیش هەوا پیس دەبێت کە خۆراکی روحی گیانلەبەرانە، ئەمەش فەساد و خراپییەکە دەگوازێتەوە بۆ میزاجی، وە هەر کاتێکیش بۆگەنبوونەکەی هەوا بە هێز بێت نەخۆشی لە سییەکان روودەدات ، وە ئەمەش تاعوونە[٩٣]، و نەخۆشییەکانیش تایبەتە بە سیی، وە ئەگەر بۆگەنبوونەکەش بە هێز نەبێت و بەڵام زۆر بێت دەبێتە هۆی زۆربوونی تایەکان لە میزاج و لەش تێک دەدات))[٩٤].

بەهەمان شێوە لەسەردەمی نوێشدا دکتۆر ئازاد محەمەد ئەمین نەقشبەندی ئەو بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە کە ئەو شارانەی گەورەو قەبارە گەورەن بەرێژەی دانیشتووان هەوای پیسیان زیاتر تێدا قەتیس و پەنگخواردوو دەبێت و بۆ تەندروستی مرۆڤیش خراپە [٩٥].

واتە بە شێوەیەکی گشتی نەخۆشی و پەتا لە ناوچە نزم و شێدار و قەرەباڵغەکان لە دانیشتوان روودەدات، و هەروەها لەو کاتانەش کە برسییەتی و قاتوقڕی هەیە، بەتایبەتی لە کاتی شەڕ و هەڵمەت و گەمارۆ سەربازییەکاندا[٩٦].

بە نموونە هەروەکو ئەو نەخۆشییە گەورەیەی لە ئەنجامی گەمارۆی مەغۆلەکان لە ساڵی ٦٥٦ك/١٢٥٨ز بۆ شاری ماردین، تووشی خەڵکەکەی هات و ژمارەیەکی زۆری لەناوبردن[٩٧].

شایانی باسە وڵاتی کوردان لەو ماوەیەدا بەرەوڕووی چەند هێرشێکی نەخۆشی و پەتا بوویەوە. کەوا نەخۆشییە ئاساییەکان لە هەندێ ساڵ بڵاو

دەبوونەوە و دواتر دەگۆڕا بۆ نەخۆشی (درم) و پەتای لەناوبەر، لە ئەنجامی بارودۆخی ئابووری و خراپیی ئاستی ژیان، و دابەزیویی ئاستی پزیشکیی ئەو کاتە.

لێرەدا دەتوانین پێ لەسەر ئەوە دابگرین کە زۆربەی ئەو پەتا و نەخۆشییانە لەم ماوەیەدا لە نێو کورددا بڵاو بوونەتەوە، لە بنەڕەتدا زادەی ژینگە و بارودۆخی کوردستان نەبوون بەڵکو لە وڵاتانی ترەوە بۆی دەهات بە نموونە ئەوەتا لە ساڵی ٧٤٩ك/١٣٤٨ز ئەو تاعوونە جیهانییەی کە لە شاری حەلەب سەرەتا بڵاو بوویەوە ئینجا پەڕییەوە بۆ ناوچە کوردییەکان وەکو ماردین و دیاربەکر و ناوچەی تر بە هۆی (با)وە[٩٨]. ئەگەر چی هەندێك جاریش ناوچە کوردنشینەکان دەبوونە پردێك بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییانە بۆ ناوچەی تر، هەروەکو ئەو نەخۆشییەی کە ناوبراوە بە تا و کۆخە و هەڵامەت لە دیمەشق و حەلەب لە ساڵی ٧٢٦ك/١٣٢٥ز بڵاوبۆوە، سەرچاوەکەی لە شاری ماردینی کوردییەوە هاتبوو[٩٩].

لە پاڵ ئەمانەی باسکران دەبی ئاماژە بە هۆکاری شێوازی بەرزی و نزمی و کەشوهەواش بکەین کە لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی هەندێ نەخۆشی بە تایبەتیش چەند ناوچەیەك کە لەو بوارەدا ناویان ئاماژەی بۆ کراوە وەك: (هەمەدان[١٠٠] ـ نوسەیبین[١٠١] ـ رەئسولعەین [١٠٢] ـ دەوروبەری موسڵ ـ میافارقین...) واتە کوردستان خۆی سەرچاوەی بەشێك لە نەخۆشییەکان بوو. هەروەکو ئەوەی کە هەندێ لە شارەکانی دەکەونە دەشتاییەکی گەمارۆدراوی نێوان چیاکان یان دۆڵەکان لەبەر ئەوەیە کە هەندێکیان بەهەوا پیسی و پڕ لە نەخۆشی و ناتەندروستی ناسراون. ئەوەتا هەروەکو الاصطخري لە وەسفی شاری رەئسولعەین دا ئاماژە بەوە دەکات کە نەخۆشی و پەتای تێدا زۆرە[١٠٣]، وە لەبارەی نوسەیبین دەڵێت: ((پەتادارە و نەخۆشی و دەردی زۆری تێدایە)) [١٠٤] هەر بۆیە وەك لە سەرچاوەکان تێبینی دەکرێت زۆرترین نەخۆشی کە ئاماژەی بۆ کرابێت لە هەردوو شاری ناوبراو هەبوون[١٠٥]. وە هەروەها مێژوونووسی ناوبراو لەبارەی شاری میافارقین دەڵێت: (( وە میافارقین هەواکەی پڕیەتی لە نەخۆشی و پەتا ...)) [١٠٦]. لە هەمان کاتدا (یاقوت الحموي) لە وەسفی شاری حلوان دا

دەڵێت: ((پەتادارە و ئاوەکەی خراپە)) [١٠٧] ئەمە و چەندین دەقی دیکە لە لایەن گەڕیدەکان لە بارەی خراپی و یارمەتیدەری ئاووهەوای ناوچە کوردییەکان بۆ بڵاوبوونەوەی پەتا[١٠٨] لە دوای ئاماژەدان لە لایەنە باشەکانی ئەو ناوچانە.

جگە لەمانە گەلێك جار سەرەڕای بوونی نەخۆشی و پەتا بەهۆکاری تەنگژەی ئابووری، بەڵکو دەبن بە دەرئەنجامی یەکتر بە واتای یەکێکیان دەبێتە هۆکاری پەیدابوونی ئەویتر، بۆیە زۆرجار هەردووکیان بە دوای یەکتردا دێن و کارەساتێکی گەورە دەنێنەوە، بەتایبەتیش لەو کاتەی کوردستان بەرەو رووی قاتوقڕی و تەنگژەی ئابووری دێت لەئەنجامی کەمیی ئاو لە هەندێك ساڵدا یان پاشماوەی لافاو هەروەکو ئەوەی لەساڵی ٥٥٩ك/ ١١٦٣ز لە ناوچەی (کرکر) و سیبابرك کە چەند گوندێکی کوردی بوو لەناوبرد، و ژمارەیەکی زۆری لە خەڵکی ناوچەکە کوشت[١٠٩] یاخود هێرشی کللۆ و نەخۆشی گیانلەبەران و ئافاتە کشتوکاڵییەکان، دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خۆراکی پێویستی لەشی مرۆڤ جا گیایی بێت یا حەیوانی. ئەو برسیەتییە بڵاو دەبێتەوە کە بەرگری لەشی مرۆڤ لاواز دەکات لەبەرامبەر هەر نەخۆشییەك و لە ناوی دەبات[١١٠]. ئەوەتا هەروەکو (ابن کثیر)ی مێژوونووس لە ڕووداوەکانی ساڵی ٥٧٤ك/ ١١٧٨ز دا ئاماژە بەبوونی وشکە ساڵی دەکات لە هەرێمی جەزیرە، لە ئەنجامدا گرانی و قاتوقڕی بە دوای خۆیدا هێناوە و خەڵك ناچار بووە مردارەوەبوو و شتی حەرامکراویان خواردووە ئەم بارودۆخەش بەردەوام بووە تاکو کۆتایی ساڵی ٥٧٥ك/١١٧٩ز ئینجا دوای ئەمە، پەتایەکی گشتی بەهێزی بەدوادا هاتووە، و خەڵکێکی زۆر بەو هۆیەوە مردوون، بە تایبەتیش کە ناوی نەخۆشییەکە بە سەرسام [١١١] دەبات[١١٢].

سەرەڕای ئەوە سەرەتاییبوونی زانستی پزیشکی و نەتوانینی دیاریکردنی نەخۆشی و چارەسەریکردنی و کەمیی گرنگیدانی چینی دەسەڵاتداران بە بنیادنانی بیمارستان یان بەرنەگرتن لە هۆکاری نەخۆشییەکان، و سنووردارکردنی پەتاکە، و رێنەگرتن لە هاتوچۆکردن بەسەر ناوچەی پەتادار لە جیاکارییەکانی ئەو سەردەمە بوو، یاخود دەکرێ بوترێ بەشێکی گرنگی ئەو نەهامەتییە تەندروستییانە دەگەڕایەوە بۆ نزمیی ئاستی رۆشنبیریی خەڵکەکە بە گشتی لە چۆنیەتی خۆپاراستن یان ئاگاداربوون لە خۆیان و منداڵەکانیان یان نەبوونی

هۆشیاری لە کاتی تێکەلاوی و قەرەباڵغی وەك ئەو نەخۆشییەی لە شاری موسڵ لە یەکێك لە دێرەکان بە ناوی (مار متی) لە ئەنجامی تێکەلاویی قەرەباڵغی زۆر دروست بوو خەڵکێکی زۆر نەخۆشییان لە نێو بلاوبوویەوە و مردن [113]. هەر بۆیە لەسەردەمی ئێستاشدا ناکرێت ئەو نەخۆشییانەی ئەو کاتە دیاری بکرێت کە سەرهەڵداوی کامە ناوچەن و لە کوێوە هاتوون، کەوا زۆربەی زانیارییەکانمان لە رێگای ئەو ئاماژانەیە کە هەندێك لە مێژوونووسان بەپەلە بەسەریدا تێپەڕبوون[114].

بۆیە ئەو هەوالانەی لەبارەی نەخۆشییەکان دەیخوێنینەوە زۆربەی لە چوارچێوەی ناوی گشتی و نادیارن، وەکو ( الوباء[115] ، الطاعون ، الحمی، پەتا، تاعوون، گرانەتا ــ (تای بەهێز) یان مردنی لەناکاو ئاماژەی بۆ دەکرێت) [116]. کە مانای زاراوەیی ورد نادەن لەماناکەیان ، هەروەکو (الوباء) پەتا کە زۆر ئاماژەی بۆ کراوە لەوانەیە چەندین نەخۆشی درم و کاریگەری وەکو (مەلاریا ــ تیفۆد ــ تاعوون و کۆلێرا) بگرێتەوە. لەبەر ئەوە بارودۆخی ئابووری و تەندروستی وڵات لەو سەردەمەدا یارمەتیدەر بوو بۆ بلاوبوونەوەی[117].

شایانی باسە سەرەڕای ئاماژە کورتەکانی مێژوونووسان هەندێك جار لە باسی مردنی دەسەلاتدارێکی شارێك یان قەلایەکی ناوچە کوردییەکان ئاماژەیی بە ناوی هەندێك نەخۆش دەکرێت بە نموونە وەکو لە باسی مردنی ( قطب الدین مودود بن زنگی) دەسەلاتداری موسڵ لە ساڵی ٥٦٥ك/١١٦٩ز ابن الاثیر ئاماژە بە هۆکاری مردنەکەی دەکات کە نەخۆشی (گرانەتا) بووە[118]. یان مردنی سوڵتان مسعود بن محمد بن ملك شا لە هەمەدان لە ساڵی ٥٤٧ك/١١٥٢ز بە هۆی نەخۆشی گرانەتا[119]. یاخود مردنی جمال الدین اقوش بن عبدالله المنصوری ناسراو بە الافرم الصغیر نائب شام لە هەمەدان لە ساڵی٧١٦ك/ ١٣١٦ز بە نەخۆشی (الفالج) [120] هەروەها مردنی ( سیف الدین غازی مودود بن زنکی) دەسەلاتداری موسڵ لە ساڵی ٥٧٦ك/١١٨٠ز بە نەخۆشی سیل[121] بەلام بەر لە مردنی و بە هۆی درێژبوونەوەی نەخۆشییەکەی تووشی نەخۆشی سەرسامیش بوو ئینجا مرد. ئەمەو چەندین نەخۆشی تری ئەو سەردەمە کە بەم جۆرە ئاماژەیان بۆکراوە. وەکو( الفاج ــ القولنج ـ النقرس ــ التشنج ــ الاورام الحاسیةــ الریاح الغلیظة ــ الجدری[122] ــ البرسام[123] ـ الحصی ـ الرمل[124]...)[125].

**ب/ ئاژەڵی:**

سەرچاوە مێژووییەکان لە ئاماژەدان بە نەخۆشی و پەتا مرۆییەکان بە تەنها وازناهێنن بەڵکو ئەو سنوورە دەبەزێنن و خۆیان لەقەرەی ژمارەیەك نەخۆشی تر دەدەن کە تایبەتن بە ئاژەڵان، و لە هەمان کاتدا باس لە هێز و کاریگەرییەکانیش دەکەن.

بەڵام ناکرێ ئەوەش پشتگوێ بخرێ کە هەندێك لە نەخۆشی و پەتاکان هاوبەشن لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵاندا وەك سەرچاوەکان باسیان کردووە کاریگەرییەکانیان بەسەر هەردوو لایەن دیار خراوە وەك نەخۆشی سەگ (واتە هاری) کاتێك سەگ تووشی دەبوو مرۆڤیشی تووش دەکرد یان مرۆڤ کە دەمرد سەگ و گورگی تووش دەکرد نموونە ئەو گورگە هارەی کە باس کراوە لە لایەن مێژوونووس (الدواداری) لە ساڵی ٥٨٩ك لە شاری دونەیسەر چەندین مرۆڤی لە ناوبرد[١٢٦]. یان مشك و جورجەکان لەسەر لاشە زۆرە مردووەکانی مرۆڤ تووشی تاعوون دەبوون لەوێوە مرۆڤی دیکەی زیندوویان تووش دەکردەوە وەك ئەو تاعوونە گشتی و جیهانییەی کە لە ساڵی ٧٤٨ك یان ٧٤٩ك/ ١٣٤٨ ز روویدا قوربانییەکانی لە هەردوو لایەنی مرۆڤ و ئاژەڵدا هەبوو[١٢٧].

سەرەڕای ئەمە ئەگەر تێبینی بکەین دەبینین ژمارەیەك لەو نەخۆشییانەی ئەو کاتە چەند ئەدگارێکی جیایان لە یەکتر هەبوو، وەك ئەوەی هەندێکیان لە ئاژەڵانەوە دەگوازرانەوە بۆ مرۆڤ وەك تاعوون یاخود ئەو نەخۆشییەی کە لە مەڵاتیە روویدا کە سەرەتا لە باڵندەکانەوە دەستی پێکرد و ژمارەیەکی زۆری لێ لەناوبردن، ئینجا ئاماژە بەوە دەکات منداڵان تووشی نەخۆشی ( خوریکە) بوونە و ژمارەیەکیان مردوون[١٢٨]. کە لەوانەیە هەر خۆی ئەو نەخۆشییە ئەنفلونزای باڵندە[١٢٩] بێت لەو کاتە بەڵام نەناسراوە. یاخود هەندێك جار نەخۆشی یان پەتاکە لە مرۆڤ سەرهەڵدەدات و دەگوازرێتەوە بۆ ئاژەڵ. هەروەها ئاژەڵانی وەکو چێل و مەڕو بزن و ئەسپیش[١٣٠]. تووشی چەند پەتایەکی جیاواز دەبوون وەکو هاری و (سەگی، دەردە رێوی، الجرب، الصدام[١٣١] و "ئەستوور بوونی سەری ئاژەڵان")، ئینجا هەندێك لەو پەتایانە زۆر بەهێز بوون و ژمارەیەکی زۆریان لە ئاژەڵان لە نێو دەبرد[١٣٢].

ئەوەی جێگای باسە ئەوەیە کە هەردوو جۆری نەخۆشی و پەتای مرۆیی و ئاژەڵی کاریگەریی زۆری هەیە لەسەر دروستکردنی تەنگژەی ئابووری بەهۆی ئەوە بەر لە هەموو شتێك ژمارەیەکی زۆر لە هەردوولا لە نێو دەبات، بە کۆچکردن [١٣٣]. یان مرۆڤ لاوازو بێ هێز دەکات، یاخود دەیکوژێت ئەمەش هەروەکو لە نەزەریەی ئاینی و وەکو ئیسلام و یەهوودی و مەسیحی، و بازرگانیشدا دەردەکەوێ بە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوان واتە دەستی کار دەبێتە هۆی پەکخستن، یان دواخستنی پێشکەوتنی ئابووری لەبەر ئەوەی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان لە رێگایەوە دەتوانرێت دابەشبوونی کار زیاتر بێت، لە هەمان کاتدا زیاتریش (موارد) و کەرەستەی خاو دەقۆسترێتەوە و سوودی لێ دەبینرێت [١٣٤].

لە هەمان کاتدا لەنێوچوونی ئاژەڵان بە هۆی نەخۆشی و پەتاکە بێگومان بە هۆی نزمی ئاستی زانستی پزیشکیی ئەو کاتە ژمارەیەکی زۆریان لێ لەناوچوو، خۆی لە خۆیدا ئاژەڵیش بە تایبەتی مەڕو ماڵات و چێڵ و ئەسپ و ئەوانی تر لە ئاژەڵی ماڵی ڕەگەزێکی هەرە گرنگی ئابووری ئەو کاتەیان پێکدەهێنا بۆیە ئەم دیاردەیە دەبووە هۆی دروستکردنی تەنگژەی ئابووریی گەورە بە نموونە هەروەکو لە ئەنجامی ئەو نەخۆشییەی لە ساڵی ٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز کە ناودەبرا بە برسام هاوکات بوو لەگەڵ گرانی و قاتوقڕی لەگەڵ لەناوبردنی جووتیارێکی زۆر ژمارەیەکی گەورەشی لەمەڕو ماڵات لە نێوبرد[١٣٥]. بەتایبەتیش نابێت ئەوەشمان لە بیر بچێت سەرەڕای ئەوەی کە بەشێکی گرنگی هۆکارەکانی بەرهەمهێنانی کەرتی کشتوکاڵیش لەو کاتەدا پشتی بە ئاژەڵی وەکو ئەسپ[١٣٦] و گا و ئێستر... هی تر دەبەست بۆیە ئەمە وەك ساڵی ٧٤٩ك/ ١٣٤٨ز، یاخود لە ساڵی ٧٦٤ك/ ١٣٦٢ز ڕوویدا بووە هۆی پەکخستنی بەشێکی زۆری کێڵگە کشتوکاڵییەکان[١٣٧].

هەروەها هەندێك جار ئاژەڵەکان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ دەبوونە هۆکاری سەرهەڵدانی کێشەی ئابووری ئەویش بە هێرشکردنە سەر کێڵگەی کشتوکاڵی لە لایەن بەرازی زۆر، یان هێرشکردنە سەر مرۆڤ و کوشتنی لە لایەن ئاژەڵی وەکو سەگ و گورگی هەلگری نەخۆشی و پەتادار هەروەکو ئەوەی لە ساڵی٥٨٩ ك/١١٩٣ز لە شاری دونەیسەر ڕوویدا کە بووە هۆی کوشتنی ژمارەیەك لە خەڵك و دروستکردنی ترس و بیم لە دڵی خەڵکێکی زۆردا[١٣٨]. یان هاربوونی سەگەکان لە

ساڵی ٥١٨ك/ ١١٢٤ز لە چەند شارێك كە زیانی بە چەندین مرۆڤ و گیانلەبەر گەیاند[١٣٩]. یاخود بە هۆی خواردنی گۆشتی ئاژەڵی نەخۆش و تووشبوونی خەڵكێكی زۆر بە هۆیەوە[١٤٠]. یان ئەوەی كە گورگ بەسەر ڕانەمەڕی دادەدا و مەڕێكی زۆری دەخنكاند.

## چوارەم: بەفر و تەزرە و سەهۆڵبەندان:

لێرەدا ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە كە ئەم جۆرەی كەشوهەوای كوردستان تا چەند كاریگەری لە سەر دروستكردنی تەنگژەی ئابووریدا هەبوو لەو ماوەیەدا كە جێی باسە، یاخود تا چ ڕادەیەك ڕێخۆشكەر بووە لە هێنانە ئارای ئەم بارودۆخەدا.

گومانی تێدا نییە لەو ماوەیەدا چەندین شەپۆلی هەوای سارد و بەفر، و تەزرەی كاریگەر ڕوویان لە ناوچە كوردییەكان كردووە، و زیانی زۆریان بە مرۆڤ و كشتوكاڵ و ئاژەڵداری و تەنانەت ئاژەڵی كێوی و باڵندەكانیش[١٤١] گەیاندووە[١٤٢] سەرەتا ئەگەر لە مرۆڤەوە دەست پێ بكرێت كە سەرچاوەی سەرەكی بەدەستهێنانی بەرهەمە، ئەوا زیانی زۆری تووش هاتووە بەم هۆیەوە جا بە نەخۆشی بێت یان زیانی جەستەیی لە كاتی بەركەوتنی تەزرەی گەورەی[١٤٣] وەكو ئەوەی لە ساڵی ٧٥٥ك/١٣٥٥ ز لە ناوچەی موسڵ و نوسەیبین باری، كە قەبارەكەی نزیكەی قەبارەی هێلكەی مریشك دەبوو[١٤٤]. یاخود ئەوەبێت كە لەبەر نزمبوونەوەی پلەی گەرما ، زیاتر لە ڕێژەی دیاریكراوی خۆی ، كە تووشی نەخۆشی جۆراوجۆر لە (ئەنفلۆنزا و تەشەنجات و شان و مل ڕەق بوون) دەبوویەوە[١٤٥].

تەنانەت گەلێك جار بارودۆخ دەگەیشت بەڕادەیەك ئەو هۆكارو كەلوپەلانەی بۆ دەرمان و چارەسەریش بەكاردەهێنران لە كار دەكەوتن یان لە ناو دەچوون بە هۆی سەرماو سەهۆڵبەندانەوە، و نەدەتوانرا سوودیان لێ ببینرێ، لەوانەش وەك سووتان و وشكبوونی گژوگیای سروشتی كە بۆ دەرمان و چارەسەری بەكاردەهێنرا یان ڕێگا گیران بۆ گەیشتن پێی، یاخود لەكاركەوتنی هەندێ هۆكاری تر كە بۆ چارەسەری بەكاردەهێنرا لەمانەش گەرماوی ئاوی گەیارەیە[١٤٦] كە

دەکەوێتە نزیك شاری موسڵ بۆ چارەسەری زۆر لە نەخۆشییەکان بەکاردەهێنرا و بە درێژایی مێژوو ئاوێکی کبریتی گەرمی هەبوو، بەڵام دەبینین لەساڵی ٦٢٣ك/١٢٢٦ز بەهۆی سەرماو سۆڵ و شەختەی زۆر دەیبەستن[١٤٧]، و ناتوانرێت بۆ ماوەیەك سوودی لێ ببینرێت.

لایەنێکی دیکەی گرنگی ئابووری ئەو سەردەمە کە کشتوکاڵە بەهەردوو بواری شینایی و ئاژەڵداری، وە هەر نەهامەتی و کەموکوریەکیش لە بەرهەمەکەیدا هۆکارێکە بۆ سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری و پەیدابوونی مەترسی لەسەر ژیانی رۆژانەی مرۆڤ، بە تایبەتیش لە کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی وەك کۆمەڵگەی کوردستان لە سەدەی شەش و حەوت و هەشتی کۆچی/ بەرامبەر دوازدە و سێزدە و چواردەی زاینیدا.

وەکو ئاماژەی بۆ کرا هەرچەندە کاریگەریی نەرێنی ئاووهەوا لەسەر بارودۆخی ئابووری زیاتر خۆی لە وشکە ساڵیدا دەبینییەوە، بەڵام هەندێك جار سەختیی ئاوو هەوا و سەرما و سۆڵ بارینی تەزرە و بەفریش کاریگەری خراپیان دەبوو. بەو پێیەی بارینی تەزرە و دروستبوونی شەختە و ساردیەکەیان دەغڵودان و ڕەز و باغ و تەنانەت سامانی ئاژەڵیش لەناو دەبرد. ئینجا ئەم کاریگەرییە دەکرێت بە دوو جۆر لێك بدەینەوە، یەکەمیان ڕاستەوخۆ: کە لە کێڵگە کشتوکاڵییەکان و ئاژەڵەکان دەدات و زیانیان پێ دەگەیەنن هەروەکو ئەو تەزرەیەی لەساڵی ٥١٤ك/ ١١٢٠ز لە شاری ماردین باری زۆربەی کشتوکاڵ و مەڕو ماڵاتەکەی لە نێو برد[١٤٨]. یاخود ئەو رووداوەی کە لە ساڵی ٦٢٣ك یان ٦٢٤ ك لە ناوچەکانی موسڵ تەزرەیەك باری کێشەکەی یەك ڕەتڵ دەبوو بە وتەی (ذهبي) کە زۆربەی کشتوکاڵ بە تایبەتی گوڵی داری رەزەکان وەك گوڵی بادەم و قەیسی و هەڵووژە و بەهێ و هی تر... [١٤٩] لەناوبرد وەك (الغساني) باس دەکات لەبەر ئەوە بووە چونکە ناسك بوون[١٥٠]، وە ماڵاتەکانیشی لە ناوبرد[١٥١] و برسیەتی بڵاوکردەوە هەروەها لە ساڵی ٧٥٥ك/١٣٥٥ز تەزرەیەکی زۆر و قەبارە گەورە لە ناوچەکانی موسڵ و نوسەیبین باری زۆر لە کێڵگەی کشتوکاڵی و ئاژەڵانی لە نێو برد[١٥٢]، یاخود ئەو تەزرەیەی کە لە ساڵی ٨٠٩ك/ ١٤٠٦-١٤٠٧ ز لە هەمان ناوچە باری بووە هۆی لەناوبردنی کشتوکاڵ و سامانێکی زۆری ئاژەڵی برسییەتی و

گرانییـەکی زۆریشـی نایـەوە[153] سـەرەڕای ئەمـە لـە سـاڵی ٥٥٧ك/١١١٠ز بـەهۆی سەختیی سەرمای زستان ژمارەیەکی زۆر لە مـاڵات و ئـاژەڵ و باڵنـدەی کێـوی لـە زۆربەی جیهان لەناوچوون[154]. بە هەمان شێوە لە سـاڵی ٧٧٨ك/١٣٧٦ز سـەرماو سۆل بە هۆی بەفربارینێکی زۆرەوە لە شاری ئامەد زیـانێکی ئـەوتۆی بـە ئـاژەڵی کێوی و باڵندەکان گەیاند، کە دەسەڵاتداری ناوچەکە هاتە وەڵام و بڕیاری تایبەتی بۆ دەرکردن ، بە ئەزیەت نەدان و راونەکردنیان یان رێ لێنەگرتنیان[155].

جۆری دووەمیان کە بە شێوەی ناڕاستەوخۆیە بریتییە لەوەی کـە توانـەوەی بەفری زۆری سەر شاخەکان بـە رێـژەی زۆر لـە پـاڵ بارانـدا بەشـداری دەکـات لـە دروستبوونی لافاو[156]، و بەهۆیەوە زیان بە کێڵگەکان دەگەیەنێت بە نموونـە وەك ئەو لافاوەی کە لە رووباری دیجلە هاتە ئـاراوە لـە سـاڵی ٥٠٢ك/١١٠٨ ز و زۆربـەی کشتوکاڵی لە نێوبرد[157]، یان ئـەو لافـاوەی لـە سـاڵی ٥٦٩ك/١١٧٣ز لـە رووبـاری فوراتدا روویدا[158].

یاخود زیـانێکی تـری ناڕاسـتەوخۆی بریتییـە لـەوەی کـە بـە هـۆی سـەرماو شـەختە و سـەهۆڵبەندانەوە، چـەند جارێـك روویـداوە، هــەموو ئـاوی رووبـارو جۆگـەکانی بەشـێك لـە ناوچـە کوردییـەکان بـۆ ماوەیـەکی زۆر بەسـتوویەتی، و نـەتوانراوە بـۆ کشـتوکاڵ و ئاژەڵـداریش بـەکار بهێنرێـت، هــەروەك لــە سـاڵی ٧٦٣ك/١٣٦١ز روویدا کە ئاوی رووباری فـورات و هـەموو جۆگـە و ئاوەکـانی تـری ناوچەکە ببەستێ و تەنانەت وەك مێژوونووسان ئاماژەی بۆ دەکەن توانراوە وەکو وشـکایی لەســەری هاتوچـۆ بکرێـت، و بـۆ مـاوەی چـل رۆژیـش بـەم جـۆرە ماوەتـەوە[159] دوواتـر دوبارەبوونـەوەی دوای ١٥ پـازدە سـاڵی تـر بـە هـەمان رووداو[160]. بێگومان ئەم ماوەیـەش زۆرە بـۆ کشـتوکاڵ بێـت یـان ئاژەڵـداری، بـە تایبەتیش ئەم رووداوە ئەگەر بەسـەر رووبـارێکی بـە خـوڕ و ڕۆیشـتوو بێـت، ئـەوا دەبێت سەهۆڵبەندانێکی زۆر کاریگەر بێت و لەوانەیە ئاژەڵێکی زۆریشی کوشـتبێت و کێڵگەیەکی زۆریشی لەناوبردبێت بە تایبەتی ڕەز و باخەکان[161].

هەروەها لە رووی بازرگانی و هاتوچۆوە دیسان کە ئەویش بەشێکی ئـابووری کوردسـتان یـان ناوچـەکانی دەوروبـەری پێـك دەهێنـا، بـە تایبـەتی رێگـا نێوخۆیەکانی نێوان شارە کوردییەکان یان ئەو رێگا هەرێمی و جیهانییانەی کە بە

ناوچەکە تێدەپەڕین[١٦٢]، زیانی گەورە بە جوولەی بازرگانی دەکەوت بە هۆی هەڵکردنی زریانی بەفرینی و کەوتنی بەفرێکی زۆر لەسەر ڕێگاکان کە بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو پەیوەندییانەی دەپچڕاند کە لە نێوان ناوچە نێوخۆیی یان دەرەکییەکاندا هەبوو جا بازرگانی بێت یان جۆری تر[١٦٣]. بە نموونە ڕووداوی لەو شێوەیە بارینی بەفرێکی زۆرە چەند جارێك لە نێوان شاری حلوان و بەغدا کە بەتەواوی بۆ ماوەیەکی درێژ ڕێگاکەی دادەخست[١٦٤].

بە شێوەیەکی گشتی پەکخستنی چالاکی ڕۆژانەی خەڵك لە پیشەگەر و جووتیار و بازرگان و بوارەکانی تری ژیان ، یان لە کارکەوتنی کەرتی ئابووری بەهۆی ئەم هۆکارانەوە کە بەفر و تەزرە و سەهۆڵبەندانە[١٦٥]، بە یەکەوە گومانی تێدانییە تەنگژەی ئابووری بە دوای خۆیدا دەهێنا.

### پێنجەم: لافاو و بای بەهێز:

لافاو هەروەکو لە سەرەتادا باسکرا بەهۆی چەند هۆکارێکەوە ڕوودەدات کە ئەویش بارانی زۆر و توانەوەی خێرای بەفری سەر چیا و دۆڵەکانە، بە مەرجێك ئەگەر ڕووبار یان زێ هەبێت[١٦٦] گومانی تێدا نییە لەم ناوچەیەش کە کوردستانە کاریگەرترینیان هەردوو ڕووباری دیجلە و فوراتە.

ئینجا ئەمە خۆی لەخۆیدا کاتێك زیادەی ئاوەکەی لێواری کەنارەکانی ڕووبارەکان دەبەزێنێ دەبێتە لافاو یاخود هەندێك جاریش لە ئەنجامی داباریبنێکی زۆری بارانی بە خوڕ و بەسەر قەدپاڵی چیا و گردەکانەوە سێڵاو (سیل)ێکی زۆر دادەبەزێتە ناوچە نزمەکانی بەتایبەتی وڵاتی کوردستان خاکەکەی خەسڵەتی بەرز و نزمی تێدایە[١٦٧]، بۆیە ژمارەیەك لەم جۆرە دیاردانە بەخۆیەوە دەبینێت[١٦٨]. تەنانەت هەر ئەو بەرزی و نزمییەی خاکەکەی و بەرزی لەسەر ئاستی ڕووی دەریاوە و بەبەراورد بە ناوچەکانی خوارووی کوردستان، وەك عێراق زۆربەی کات بۆتە هۆی مەترسی بۆی بە تایبەتی لە کاتی بارانی زۆر و توانەوەی بەفرو تێکەڵبوونی بە دیجلە و فورات ڕاستەوخۆ لە بەغداو ناوچەکانی تری عێراق کە دەکەونە سەر کەناری دیجلە و فورات ژێر لافاو کەوتوون، هەروەکو ئەو بارانە زۆرەی کە لەساڵی ٥٥٨ك/١١٦٢ز لە دیاربەکر و جەزیرە باری، بووە هۆی هەڵسانی

لافاو لە بەغدا و زیانی زۆری بەشارەکە گەیاند[١٦٩]. ئەمانەش گومانی تێدانییە کۆمەڵێك لە زەرەرو زیانیان لە ناوچە کوردییەکان دروست کردووە بە تایبەتیش لەو سەردەمەدا بەنداوێکی ئەوتۆ نەبوو بەرگری لە نارێکی و لەشارەکان بکات لە لافاو، لە رووی مرۆییەوە زۆر زیانیان بەرکەوتووە لە مردن و لە خنکان[١٧٠]، یان کۆچکردن بە تایبەتیش ئەو خەڵکانەی لە نزیك کەنار رووبارەکانی دیجلەو فورات دەژین[١٧١]، ئەمە جگە لە زیانێکی زۆری خانوو و شوێنی نیشتەجێبوون کە بەو هۆیەوە تووشی دارِمان دەبوون. وەك ئەوەی لە ساڵی ٥٦٩ك/١١٧٣ز لە شاری موسڵ روویدا چەندین خانوو رووخان لە شارەکە[١٧٢]. یاخود بازارِو دووکان و شوێنی بازرگانی، وەکو ئەوەی لە شاری هەولێر لە ساڵی ٦٤٦ك/١٢٤٨ز روویدا کە ژمارەیەکی زۆر لە دووکان و بازارِ و شوێنی بازرگانی ژێر ئاوکەوتن لە ئەنجامی بارانی زۆر، تەنانەت زۆر لە دامودەزگا کۆمەڵایەتییەکان و قەڵاش بێ زیان نەبوون لەم کاتەدا [١٧٣]. بە هەمان شێوە هەرلە ساڵی ٦٥٣ك/١٢٥٥ز هەمان بارودۆخ دووبارە بۆوە رێگاو بانەکان بە تەواوی پەکیان کەوت بەهۆی زۆریی ئاوەکە و پرِبوونی دەشت و بەستەکان لە ئاوی بارانەکە[١٧٤]. بە هەمان شێوە لە ناوچەی (سلامیە)ی سەر بە موسڵ لە ئەنجامی سێلاوێك چەندین دووکان و مرۆڤ و ئاژەڵ لەناوچوون و لە هەمان کاتدا لە جەزیرەی ئیبنو عومەر ئاستی ئاو گەیشتە شوورەی شارەکە[١٧٥].

هەروەها قەڵا و شوورەی شارەکە بەشێکی تری زیان لێکەوتووانی ئەم دیاردەیە بوون بە نموونە ئەو سێلاوەی لە ساڵی ٥١١ك/١١١٧ز لە هەولێرو شەنگار روویدا سەرەرِای تێکدانی کێڵگەیەکی زۆری کشتوکاڵی لە شەنگار شوورەکەی رووخاوە بەو هۆیەوە[١٧٦]. لە هەمان کاتدا بەشی پێشەوەی شوورەی هەولێریش هەر بەو هۆیەوە رووخا، وە چەند زەوی و خانوویەکی دارِماندووە[١٧٧]. واتا ئەگەر بێتو رێرەوی سێلاوەکە سەبارەت بە هەولێر دیاری بکەین ئەوا دەبێت لەبەشی باشووری هەولێردا هاتبێت لەبەر ئەوەی هەم ئەم ناوچەیە نشێو و نزمایییە خاکەکەی بە تایبەتی ئەو ناوچەیەی کە پێ دەڵێن باخی گڵکەند هەروەها لەبەر ئەوەش وەك بەگوتەی توێژەرێك دەردەکەوێت شوورەی شارەکە لەو ناوچەیە بووە[١٧٨]. بێگومان ئەمەش چەندین خەرجیی ئابووری و دارایی دەویست

بۆ بنیادنانەوە یاخود ئەو لافاوەی کە لە ساڵی ٥٦٦ك/ ١١٧٠ز بووە هۆی رووخانی بەشێکی ناوچەکانی موسڵ و کۆچ پێکردنی بەشێکی زۆری خەڵکەکەشی[١٧٩]. بە هەمان شێوە دووبارەبوونەوەی لە ساڵی ٥٦٩ك/١١٧٣ز [١٨٠].

هەر لە بواری ئابووریدا لافاو چەندین زیانی کشتوکاڵی لێدەکەوێتەوە لە ئەنجامی ژێرئاو خستنی کێڵگەکان و بێستان و رەز و باخەکان[١٨١]، وە هەروەها زەوییە کشتوکاڵییەکان دەگۆڕێت بۆ زەلکاو، و زەوی کاول بوو، وەکو چۆن لە ساڵی ٧١٦ك/ ١٣١٦ز ئەو سیل یان سێلاوەی لە شاری حمص روویدا بەهۆیەوە و کوردێکی زۆری دانیشتووی ئەو وڵاتە لەناوچوون بە خۆیان و مەڕ و ماڵاتیان و خانووەکانیان [١٨٢]. و چەندین زیانی لێکەوتەوە. تەنانەت زۆر جاریش ژمارەیەکی زۆر لە مەڕو ماڵات لە نێوچوون بەو هۆیەوە، یاخود لە هەمان کاتدا پاشماوەی لافاوەکەشی زۆرجاری وا هەبوو لە ئەنجامی مانەوەی ئاوەکە و بۆگەنبوون و کۆبوونەوەی مێشومەگەز لێیەوە بۆتە هۆکار لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کاریگەری وەکو گرانەتا و مەلاریا و تیفۆد...، وەك ئەو نەخۆشییە مەترسیدارەی لە ساڵی ٥٥٩ك/١١٦٣ز بەو هۆیەوە بڵاو بۆوە لە ناوچەکانی باکور یان (کرکر) لەسەر کەناری فورات خەڵکێکی زۆر بەو هۆیەوە لە نێوچوون و مردن[١٨٣].

ئینجا ئەمانە هەمووی بەیەکەوە دەبووە هۆی دارمانی ژێرخانی ئابووریی کوردستان، برسیەتی و بەرزبوونەوە لە نرخی کەلوپەلی خۆراك و قاتوقڕی بە دوای خۆیدا دەهێنا، لە ئەنجامیشدا تەنگژەی ئابووری دروست دەبوو، وەك دیارە لە یەکێك لە رووداوەکانی لە ناوچەکانی موسڵ و جەزیرە و ئەرمینیا و سوریاو فەلەستین لە ئەنجامی ئەو بارانە زۆرەی لە ناوچەکان دەبارێت، و کێڵگە کشتوکاڵییەکان لەناو دەبات ، بۆیە ئەوەی روویدا بریتی بوو لە برسیەتی و قاتوقڕیەکی گەورە و خەڵك ئازاری زۆریان بینی و ژمارەیەکی زۆریش لەنێوچوون[١٨٤]. یان وەك ئەو لافاوەی لە ساڵی ٥٠٢ك/١١٠٨ز گرانییەکی زۆری نایەوە[١٨٥].

هەروەها بە هۆی هەڵکەوتەیی و کاریگەربوونی کوردستان بە تۆپەڵە هەواییەکانی دەریای ناوەڕاست و کەنداو. کۆمەڵێك نەهامەتی بۆ خەڵکەکەی دروست کردووە لە بوونی بای بەهێز و کاریگەر، یان زیانبەخش، و ترسێنەر و

جۆراوجۆر، وە گەلێك جاریش خۆڵ و باران و هەورە تریشقەی رەشی لە گەڵدا بووە. ئینجا ئەمەش خۆی لە خۆیدا کۆمەڵێك لە نەهامەتی وەکو پەکخستنی کاروبار و بازاڕەکان، کاولکردنی کێڵگە کشتوکاڵییەکان، زیان گەیاندن بەجووتیاران، یان هەڵکەندن و تێکشکاندنی داری رەز و باخەکان، و بەرهەمەکانیان بەنموونە هەروەك ئەو بایە بەهێزەی لە ساڵی ٥٢٤ك/ ١١٢٩ز و بە هەورە تریشقەی لە شاری موسڵ هەڵیکرد، بووە هۆی سووتاندنی ژمارەیەك ماڵ و خانوو[١٨٦]. ئەمەو جگە لە زیانی ئاژەڵداری کە وەك ئەو بایە بەهێزەی لەساڵی ٧١٧ك/١٣١٧ز هەڵیکرد بووە هۆی لەنێوبردنی مەڕو ماڵاتێکی زۆر[١٨٧].

سەرەڕای ئەمانە ئەو بایە بەهێزانە بەچەند جۆرو شێوازێکی زیانبەخشین هەڵیان دەکرد، لەمانە لە شێوەی بای گەرمی ژەهراوی کە لە سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ کراوە وەکو ئەوەی کە لە ساڵی ٧٧٥ك/١٣٧٣ز هەڵیکردە سەر شاری شەنگار بە هۆی گەرمی و ژەهراوییەکەیەوە (کە لەوانەیە هەر گەرمییەکەی بێت) چەندین بەرهەمی ڕەز و باخەکانی سووتاند و لەنێوبرد سەرەڕای کوشتنی خەڵکێکی زۆر[١٨٨]. کە لە کوردەواریدا دەڵێن گڕە لێی داوە بۆ کشتوکاڵیش دەڵێن: شارا لێی داوە.

جۆرێکی تری بریتی بوو لە بای سوور یان خۆڵاوی ، ئەویش جگە لەوەی زیانێکی زۆری بە تەندروستی مرۆڤ و باڵندە و ئاژەڵان دەگەیاند لە هەمان کاتدا کشتوکاڵی دەسووتاند. یان وشك دەکرد، وەکو ئەوەی لە ساڵی ٦٧٤ك/ ١٢٧٦ز گێژەڵووکەیەکی خۆڵاوی بەسەر هەولێر و دەوروبەری هەڵیکرد بووە هۆی کەمبوونەوەی بینین و ترس و بیمی خەڵك و چوونە دەرەوەیان لە شار، و بە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتاییهاتنی ژیانی دونیا لێکیاندایەوە، بەڵام دوای ئەوە لە دوای نوێژی نیوەڕۆ دەستی پێکرد لەکاتی نوێژی شێوان کۆتایی هات[١٨٩].

جۆری سێیەمیان بای رەش بوو کە لەوە دەچێت لەگەڵ هەورە تریشقە بوو بێت و بەری خۆری بە تەواوی گرتبێ و تاریکی داهێنابێت بۆیە بەم جۆرە باسکراوە، هەروەها لەبەر هێنانی برووسك و هەورە تریشقە لەگەڵ خۆی سەرەڕای هەندێك زیانی وەك سووتاندن و تێکشکاندن ترس و بیمێکی زۆری لە دڵی خەڵکەکەی دروست دەکرد بەهۆی کەمیی هۆشیاری و زیاتر زاڵبوونی بیری

ئەفسانەیی هەروەك (الدواداري) باسی لێوە دەکات لە ساڵی ٥٧٣ك/ ١١٧٧ز بایەکی رەش لە وڵاتی قفجاق هەڵیکردووە و گەیشتۆتە تفلیس و پاشان هەمەدان و ئەسفەهان و کرمان خانوویەکی زۆری رووخاندوە و چێل و مەڕ و ئەسپێکی زۆری کوشتووە [١٩٠] ئەمە لەبەر ئەوەیە کە وەکو لە ئاینی ئیسلامدا باسکراوە لەناوچوونی جیهان بەهۆی باوە دەبێ ، یان لە ساڵی ٥٧٥ك/١١٧٩ز لە جەزیرە و عێراق بایەکی رەشی هەڵیکرد و دنیای تاریك کرد [١٩١]، تەنانەت بە ڕادەیەك لە پێشبینی ئەستێرە ناسانیش بۆ تێکچوونی جیهان و لەناوچوونی ژیان لە ساڵی ٥٨٢ك/١١٨٦ز هەر با کراوەتە هۆکارێك بۆ ئەو لەنێوچوونە [١٩٢].

تێبینی دەکرێت کە ئەو کارەساتانەی بەهۆی باوە کەوتوونەتەوە لەناکاو بوون، واتا با کاریگەریی درێژخایەنی نەبووە بەڵکو خێرایی و لەناکاوی و گەرمی و خۆڵاوییەکەی مەترسی هێنەر بووە لەگەڵ ئەمانەشدا بەچەند سیفاتێکی تری وەکو گەرمی یان ساردیش ئەو بایانە لە سەرچاوەکان جیا کراونەتەوە و ناویان هاتووە. بەم شێوەیە وەك دەبینرێت هەردوو دیاردەی سروشتیی لافاو، و بای بەهێز، هۆکاری کاریگەرن لە تێکدانی باری ئابووری کوردستان و چەندین مەرگەسات و هەڕەشەیان دروست کردووە، کە لە کۆتاییدا تەنگژەی ئابووریی تەواوی لێکەوتۆتەوە.

## دەرئەنجام

بە لێکۆڵینەوە لە کارەسات و نەهامەتییەکان و دوای تاوتوێکردنی سەرچاوەکان و شرۆڤەکردنی ئەو ڕووداو و پێشهاتە جۆراوجۆرانە کە لە بەرئەنجامیان کەوتوونەتەوە توێژەریان بە چەند ئەنجامێك گەیاند، لەمانە وەك:

کارەساتی سروشتی ئەو گۆڕانکارییەیە کە لە سیستەمی باوی گەردوون ڕوودەدات و دەبێتە هۆی زیانی گیانیی زۆر گەورە، مرۆڤیش هەرچەندی توانا و وزە بەخت بکات لەو پێناوەدا ناتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت و سنوور بۆ کاریگەرییەکانی دابنێت، ئینجا بومەلەرزە بێت یان وشکەساڵی و نەبارینی باران، یان بارانی بەلێزمە و بەخوڕ و سێڵاو یان لافاو، یاخود دابەزینی پلەی گەرما بەدەر لە ڕێژەی باوی خۆی، و کەوتنەوەی سەرما و سەهۆڵبەندان، و بارینی تەزرە و بەفری زۆر، یان ئافاتی کشتوکاڵی و نەخۆشی و پەتا و چەندینی تر، کە دەبوونە هۆی ئەزیەت و ئازاری زۆر، بە گوێرەی درێژیی ماوەکەی و بەردەوامبوونی.

ناوچە کوردنشینەکان لە ماوەی توێژینەوەدا کە سەدەی (٦-٨ك/١٢-١٤ز)یە بەرەو ڕووی ژمارەیەکی زۆر لە تەنگژەی ئابووری بۆتەوە کە جۆر و هۆکارەکانی جیاواز بوون لە یەکتری لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو ناوچانە بە فراوانی و دەوڵەمەندی ناسراون. بەڵام هۆکاری سروشتی ڕۆڵێکی دیاری هەبوو لە دروستکردنی ئەم بارودۆخانەدا، لەگەڵ ئەوەی کە هەر هۆکارێك کاریگەریی جیاوازی هەبوو بە گوێرەی مەترسی و قەبارەی زیانەکانی.

وشکەساڵی و نەبارینی باران زۆرترین ئەو هۆکارە سروشتییانە بوو کە کاریگەری لەسەر دانیشتوانی کوردستان هەبوو، لەبەر پشتبەستوویی کشتوکاڵ بە شێوەیەکی سەرەکی بە باران، و وابەستەیی ژیان و گوزەران بە کشتوکاڵ، بە سیفەتی ئەوەی پیشەی یەکەم و سەرەکی زۆربەی دانیشتوان و سەرچاوەی سەرەکی بەدەستهێنانی قووتی سکیان بوو لەبەر ئەوە ئەو ساڵانەی کە وشکەتییان تێدا ڕوودەدات کاریگەری زۆری لەسەر گوزەرانی خەڵکەکە دەبوو، بەتایبەتی ئەگەر ئەم بارودۆخە چەند ساڵێك بە دوایەکدا دووبارە ببایەوە.

هەروەها سێڵاو و لافاو و هێرشی کللۆ و بومەلەرزەش زیانی گەورەیان لە ئابووری دەدا لە ڕێگەی ئەو زەرەر و زیانانەی لە گیانەکان و کاولکاریی موڵکە

گشـــتی و تایبەتییـــەکانیان دەدا لـــە پـــرد و ئـــاودێری و مزگـــەوت و زەوییـــە کشتوکاڵییەکان و خانووی هاوڵاتیان و شوێنەکانی تر.

بەشـــێوەیەکی گشـــتی کارەســـات و نەهامەتییـــەکانی کـــە بەســـەر ناوچـــە کوردییەکاندا دەهات هەم بە ڕاستەوخۆ کاریـان دەکـردە سـەر ژیـانی ئـابووری لـە کشـتوکاڵ و ئاژەڵـداری و پیشـەگەری لـە ڕێگـەی لەشکرکێشـی و بومەلـەرزە و بـەفربارینی زۆر و لافـاو یـان هێرشـی کللـۆ، هـەم بـە شـێوازی ناڕاسـتەوخۆش کاریگەرییان هەبوو، ئەویش لە دوای بڵاوبوونەوەی پـەتا و نەخۆشـی و، یـان هـەر مردنی ژمارەیەکی زۆری مرۆڤەکانەوە کـە دەسـتی کـاری زۆر لەناودەچـوو دیسـان زیانی ئابووری زۆر لە ناوچە کوردییەکان دەکەوت.

واتـە بـە گشـتییەکەی هەریـەك لـە هۆکـارە کارەسـاتبارەکان دیـاردە و دەرئەنجامێکی دیاری هەیە، کە دیارترینیان بریتییە لە برسـیەتی و بڵاوبوونـەوەی هەژاری و نەداری لە نێوان خەڵك، کە لە هەندێ بواریش دەبێتە هۆی کۆچ و مردنی دانیشتوان بە ژمارەی زۆر لە ئەنجامی کوژران یان لە برسان و لەبەر نەخۆشی.

ســەرەڕای ئەمانــە زۆر کــات دووبارەبوونــەوەی بەســەرهاتی نەهامــەتی و کارەساتەکان بە کورددا بەهۆی گونجاوی ناوچـەکانیان بـۆ ئـەم دیاردانـە هەسـتی خۆپاراسـتنی لـەلادا دروسـت کـردووە ئـەویش چ بـە ئامادەسـازی بێـت بـەر لـە ڕوودانیـان، هـەروەکو بەرهـەمهێنانی زۆر و وشـککردنەوە و دروسـتکردنی کۆگـا و خەزنکردنی بێت بەتایبەتی ئەو خۆراکانەی کە خەزن دەکرێن وەك گەنم و جـۆ...، یان بە گـەڕان بـە دوای چارەسـەری لـە دوای ڕوودانـی کارەسـاتەکان. وەکـو ئـەو هەوڵانەی لە کاتی هاتنی هێرشی کللۆ بۆ کێڵگەکانیان دەیانـدا لـە لێـدانی تـەپڵ و بڵاوکردنەوەی دووکەڵ و ڕاسپاردنی منداڵان بە ڕاوکردنیان....

## پەراوێزەكان:

[(١)] عماد عمر خلف الله احمد: الازمة الاقتصادية المعاصرة، الاسباب والتداعيات والعلاج (نظرة تأصيلية)، ص٣٠.. www.ansar – alsunna.net

[(٢)] عطاء بن خليل ابو الرشتة: الازمات الاقتصادية واقعها ومعالجتها من وجهة نظر الاسلام، ص٢،www.alsaha.com

[(٣)] بڕوانــە: محمد حمزة محمد صلاح: الكوارث الطبيعية في بلاد الشام ومصر (٤٩١–٩٢٣هـ/١٠٩٧–١٥١٧م)، رسالة ماجستير، الجامعة الاسلامية، كلية الاداب، (غزة: ٢٠٠٩)، ص٢٥.

[(٤)] باتريك: الكوارث الطبيعية، ت: توفيق علي منصور، المجلس الاعلى للثقافة، (القاهرة: ٢٠٠٣)، مج٢. ص ص٤٧–٤٨

[(٥)] صورة الارض، مطبعة بريل، ط٢، (ليدن: ١٩٣٩م). ص٢٠٢.

[(٦)] المسالك والممالك، تحقيق: محمد جابر عبدالعال الحسيني، دار العلم، (القاهرة: ١٩٦١م)، ص٢٠٠ ؛ ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٤.

[(٧)] ابن حوقل: صورة الارض، ص١٩١؛ياقوت الحموي: معجم البلدان، دار صادر للطباعة والنشر، ط٨، (بيروت: ٢٠١٠م)،ج٥،ص١٥٠.

[(٨)] نزهة الممالك والمملوك في مختصر سيرة من ولى مصر من الملوك، تحقيق: إ.د.عمر عبدالسلام التدمري، المكتبة العصرية للطباعة والنشر، (صيدا– بيروت: ٢٠٠٣م).،ص٢٢٣.

[(٩)] صورة الارض، ص٢٠٣.

[(١٠)] رحلة ابن جبير، (بيروت: د.ت)، ص٢١٧.

[(١١)] معجم البلدان، ج، ص: ١٣، ٧٢، ٤٣، ١٣٨، ١٩٦ ؛ ج٣، ص١٧٣ – ج٤، ص: ٣٨٠، ٤٧١.

[(١٢)] احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، مطبعة بريل، ط٢، (ليدن: ١٩٠٦م)،ص١٢٩.

[(١٣)] اثار البلاد واخبار العباد، دار صادر، ط٣، (بيروت: ٢٠١١م)،اص٢٦٠.

[(١٤)] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: حكيم احمد مام بكر: الكورد وبلادهم عند البلادانيين والرحالة المسلمين، دار الزمان للطباعة والنشر والتوزيع، (دمشق: ٢٠٠٩).، ص ص٢٣٠–٢٣١.

[(١٥)] هادي رشيد الجاوشلي: المظاهر الاقتصادية في تراث منطقة كردستان، معمل ومطبعة الجاحظ، (بغداد: ١٩٨٧) ص٢٤–٢٥.

[(١٦)] احسن التقاسيم، ص١٤٠.

[(١٧)] مسالك الممالك، ص ص ٧٢–٧٣.

[(١٨)] هادي رشيد الجاوشلي: المظاهر الاقتصادية في تراث منطقة كردستان، ص ص٣٥–٣٧.

(١٩) بڕوانە: محمد جواد العبوسي: محاضرات في مشكلات التقدم الاقتصادي في العراق، المطبعة الكمالية، (عابدين: ١٩٥٨).

(٢٠) بڕوانە: ابن الجوزي: المنتظم في تواريخ الملوك والأمم، تحقيق: د.سهيل زكار، دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع، (بيروت: ١٩٩٥م)، ج١٠، ص٥٥٥؛ عبدالعزيز الدوري: تاريخ العراق الاقتصادي في القرن الرابع الهجري، ط٤، ( بيروت: ١٩٩٩)، ص٧٥.

(٢١) المقريزى: اغاثة الامة بكشف الغمة، مطبعة دار الكتب والوثائق القومية، ط٣، (القاهرة: ٢٠٠٢م) ص٤١.

(٢٢) بڕوانە: عبدالله غفور: جوگرافیای کوردستان، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، چ٦، (هەولێر: ٢٠١٢)، ص٢٦٨.

(٢٣) بڕوانە: عبدالله غفور: جوگرافیای کوردستان، ص٢٦٨.

(٢٤) المنتظم: ج١٠، ص٥٥٥.

(٢٥) بڕوانە: محمد حمزة محمد صلاح: الكوارث الطبيعة في بلاد الشام و مصر، ص٢١.

(٢٦) الكامل في التاريخ، دار صادر، (بيروت: ٢٠٠٩)،ج١٢،ص٢٠٩؛ ابن المستوفي: تاريخ اربل، تحقيق: بشار عواد معروف–صلاح محمد جراز، (تونس:٢٠١٣)، ق٥،ص٢١٤.

(٢٧) بڕوانە: الاصطخري، المسالك والممالك، ص٧٤؛ المقدسي: احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٤١.

(٢٨) ابن الجوزي: المنتظم، ج١٠، ص٣٦١.

(٢٩) ابن الجوزي: المنتظم، ج١٠، ص ص٣٢٠–٣٢١–٣٦١.

(٣٠) الدواداري، الدر الفاخر في سيرة الملك الناصر، تحقيق: هانس روبرت رويمر، المعهد الالماني للاثار، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، (القاهرة: ١٩٦٠م) ج٩، ص١٠٨.

(٣١) غامس خضير حسن الدوري: الكوارث الطبيعية واثارها في العراق حتى نهاية الدولة العباسية، اطروحة دكتوراه، جامعة بغداد–كلية الآداب، (بغداد: ١٩٩٦)، ص٨٣.

(٣٢) بڕوانە: السرياني: تاريخ مارميخائي السرياني، ت: مار غريغوريوس صليبا شمعون، دار ماردين، (حلب: ١٩٩٦م). ص٣٢٦؛ الرهاوي، تاريخ متي الرهاوي، ت: د.محمود محمد الرويضي–عبدالرحيم مصطفى، مؤسسة حمادة للدراسات الجامعية والنشر والتوزيع، (عمان–الاردن: ٢٠١٢م)، ص١٠٤.

(٣٣) ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج١٠، ص٢٩١.

(٣٤) ابن المستوفي: تاريخ اربل، ق٥،ص٢١٤؛ ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج١١، ص٢١٨؛ ابو شامة: الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٢م)، ج٣، ص١٢.

(٣٥) هەریەك مەكوك بریتی بوو لە(١٤,٦)كغم گەنم.ڤالتر هنتس: المكاييل والاوزان الاسلامية ومايعادلها فى النظام المتري، ت:كامل العسلي، الجامعة الاردنية، (عمان:١٩٧٠)،ص٧٨.

(٣٦) ابن المستوفي: تاريخ اربل، ق٥،ص٢١٤.

(٣٧) جعفر حسين خصباك: تاريخ العراق في العهد المغول الايلخانيين، مطبعة العاني، (بغداد:١٩٦٨)، ص٢٢٥.

(٣٨) بڕوانە: النويري: نهاية الارب في فنون الادب، تحقيق: نجيب مصطفى فواز–حكمت كشلي فواز، منشورات محمد علي بيضون، دار الكتب العلمية، (بيروت: د.ت). ج٣٢، ص ص٢٢٤–٢٢٦ ؛ البرزالي: المقتفي على كتاب الروضتين المعروف بتاريخ البرزالي، تحقيق: عمر عبدالسلام التدمري، المكتبة العصرية (صيدا–بيروت: ٢٠٠٦م).، ج٢، ق٢، ص ص٣٠٣–٣٠٤؛ حاجى خليفة: تقويم التواريخ (سالشمار ووقايع مهم جهان از آغاز افرينش تا سال ١٠٨٥هـ.ق)، چ٢، (تهران: ١٣٨٤).،ص١٢٩.

(٣٩) هەر ڕتڵێك بریتییە لە ( ٨١٢,٥ غم). فالتر هنتس: المكاييل والاوزان، ص٣٠.

(٤٠) حبة: يان (٠,٠٦٥ غم). فالتر هنتس: المكاييل والاوزان، ص٢٦.

(٤١) الكامل في التاريخ، ج١٢، ص٢٣٢.

(٤٢) هەر یەك قیرات بریتییە لە ( ١/٢ )ی مسقاڵێك، فالتر هنتس: المكاييل و الاوزان، ص٤٤.

(٤٣) ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج١٢، ص٢٣٢؛ الغساني: العسجد المسبوك وجوهر المحكوك في طبقات الخلفاء والملوك، تحقيق: شاكر محمود عبدالمنعم،دار البيان، (بغداد: ١٩٧٥م).، ص٤٢٩.

(٤٤) ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج١٢، ص٢٣٦.

(٤٥) بڕوانە: ابن القلانسي: ذيل تاريخ دمشق، تحقيق: آمد روز، مطبعة الاباء اليسوعيين، (بيروت: ١٩٠٨م)، ص٢١٢ ؛ ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج١١، ص٢١٨ ؛ ابن كثير: البداية والنهاية، تحقيق: عماد زكي البارودي– خيري سعيد، دار الكتب المصرية، (القاهرة: ٢٠٠٨م)،ج٨، ص٤٢٤؛ جعفر حسين خصباك: العراق في عهد المغول الايلخانيين، ص٢٢٦.

(٤٦) المجهول: تاريخ الرهاوي،، ت: الاب البير أبونا، مطبعة شفيق، (بغداد: ١٩٨٦م)،ص٢١٤–٢١٥؛ ابن المستوفي: تاريخ اربل المسمى نباهة البلد الخامل بمن ورد عليه من الاماثل، تحقيق: سامي بن السيد الخماس الصقار، ( بغداد: ١٩٨٠)، ق١ ، ص٥١؛ ابن الشعار: قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان، تحقيق: كامل سلمان الجبورى، (بيروت:٢٠٠٥)، مج١،ج١، ص٣٤٢؛ ابن حبيب، تذكرة النبيه في ايام المنصور وبنيه، تحقيق: د. محمد محمدامين، (القاهرة: ١٩٨٢)، ج٣، ص١٩.

(٤٧) جعفر حسين خصباك: العراق في عهد المغول الايلخانيين، ص٢٢٦.

[٤٨] **بڕوانە:** محمد جواد العبوسي: محاضرات في مشكلات التقدم الاقتصادي في العراق ؛ شاكر خصباك: الاكراد، ص٢٣٢.

[٤٩] شاكر خصباك: الاكراد، ص٢٦٩.

[٥٠] مها سعيد حميد: الكوارث والاوبئة في الموصل خلال العصر العباسي، دراسات موصلية، العدد (٣٣)، (الموصل: ٢٠١١).، ص٧.

[٥١] احمد اسماعيل عبدالله الجبوري: الكوارث الطبيعية وانعكاساتها على الحياة الاجتماعية في ديالى في العصور الاسلامية، مجلة ديالى، عدد (٢٦)، (ديالى: ٢٠٠٧)، ص٩.

[٥٢] غامس خضير الدوري: الكوارث الطبيعية في العراق، ص٢٥٧.

[٥٣] سروە: دوای ئەوەی کللۆ بەسەر زەوی گەرایەکانی هەڵدێن واتە دەشکێن و بۆ ماوەی یەك مانگ دەمێننەوە، لەو ماوەیەدا بەو ناوە ناودەبرێت. بڕوانە: الدینوري: ابو حنیفة: كتاب البنات، تحقیق: برنهارد لیفي، (بیروت: ١٩٧٤)، ج٣، ص٥٣.

[٥٤] الدینوري: البنات، ج٣، ص٥٣.

[٥٥] الدینوري: البنات، ج٣، ص٥٣.

[٥٦] الدمیري: حیاة الحیوان الكبرى، ط٢،(بیروت: ٢٠١٠)، ج١، ص٢٧٣.

[٥٧] الدمیري: حیاة الحیوان الكبرى، ج١، ص ص٢٧٣–٢٧٤.

[٥٨] م حمد حمزة محمد صلاح: الكوارث الطبیعیة في بلاد الشام ومصر، ص ص٢٢–٢٣.

[٥٩] الدینوري: النبات، ج٣، ص٦٤.

[٦٠] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: الدمیري: حیاة الحیوان الكبرى، ج١، ص ص ٢٧٢–٢٧٧.

[٦١] المقریزي: السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقیق: محمد عبدالقادر عطا، منشورات محمد علي بیضون، دار الكتب العلمیة، (بیروت: ١٩٩٧م)، ج١، ص٣٣٥.

[٦٢] بڕوانە: ابن الاثیر: الكامل في التاریخ، ج١٢، ص٢٠٦ ؛ المقریزي: السلوك، ج٣، ص٣٧٩.

[٦٣] الدواداري: الدرة الزكیة في اخبار الدولة الفاطمیة، ج٦، ص٤٩١.

[٦٤] یاخود یەكێك لە مێژوونووسان بە ساڵی ٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز دیاری دەكات. ابن كثیر: البدایة والنهایة، ج٨، ص٥٨٣.

[٦٥] ابن الاثیر: الكامل في التاریخ، ج١٢، ص ص٢٠٦، ٢٠٩؛ ابن المستوفي: تاریخ اربل، ق٥،ص٢١٤ ؛ الغساني: العسجد المسبوك، ص ص٣٩٥، ٤٠٠.

[٦٦] مجهول: تاریخ الرهاوي، ص٢٥٣.

[٦٧] النویري: نهایة الارب، ج٣٢، ص٢٢٤–٢٢٦.

[٦٨] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: النویری: نهایة الارب، ج٣٢ ،ص ص٤٢٣–٤٢٥؛ البرزالي: المقتفي، ج٢، ص ص٣٠٣–٣٠٤ ؛ الذهبي: ذیل تاریخ الاسلام ووفیات المشاهیر والاعلام،

تحقيق: عمر عبدالسلام التدمري، دار الكتاب العربي، (بيروت: ٢٠٠٤م)، ص١٦٠–١٦١.

(٦٩) بڕوانە: القزويني: نزهة القلوب، ص ص١٥٦–١٥٧ ؛ نورى عبدالحميد العاني: العراق في العهد الجلائيري ((٧٣٨–٨١٤ه/ ١٣٣٧–١٤١١م))، (بغداد: ١٩٨٦)، ص ص٢٢٣–٢٢٤ ؛ موسوعة موصل الحضارية، جامعة الموصل: ١٩٩٢)، ج٢، ص٢٥٦.

(٧٠) القزويني: نزهة القلوب، ص١٥٦.

(٧١) القزويني: نزهة القلوب، چاپخانه الهادي، (ايران: ١٣٨١). ص١٥٩؛ جعفر حسين خصباك: العراق في عهد المغول الايلخانيين، ص٩٨.

(٧٢) **بڕوانە:** العظيمي: تاريخ العظيمي –أو– تاريخ حلب، تحقيق: ابراهيم زعرور، (دمشق: ١٩٨٤م)، ص٣٦٩ ؛ مجهول: تاريخ الرهاوي، ص٢٥٦ ؛ الذهبي: تاريخ الاسلام، ص١٦٠–١٦١.

(٧٣) کە لەوانەیە مەبەستی ناوچە کوردییەکان بێت.

(٧٤) ابن حبيب: تذكرة النبيه، ج٣، ص٩٣؛ الحلبي: المنتقى من درة الاسلاك، ص٢٢٦.

(٧٥) ابن حبيب: تذكرة النبيه، ج٣، ص٩٣؛ الحلبي: المنتقى من درة الاسلاك، ص٢٢٦.

(٧٦) بڕوانە: تاريخ مار ميخائيل السرياني، ص٢٠٨–٢٠٩–٢١١ ؛ ابن العبري: تاريخ الزمان، دار الزمان، ط٢، (بيروت: ٢٠٠٥م) ص١٤٤.

(٧٧) المجهول: تاريخ الرهاوي: ص٢٥٣.

(٧٨) غرارة: يەك غرارە بەرامبەر بە ٢٠٤,٥ کغم گەنم لەو سەردەمەدا. فالتر هنتس: المكاييل والاوزان، ص٦٤.

(٧٩) عقد الجمان في تاريخ اهل الزمان، تحقيق: د.محمد محمدامين، الهيئة المصرية العامة للكتاب، (القاهرة: ١٩٨٨م).ص١٣ ؛ احمد محمد الاوتاني: دمشق في العصر الايوبي، ( دمشق: ٢٠٠٧)، ص٢٣٧.

(٨٠) ابن الشعار: قلائد الجمان، مج٤، ج٥، ص ص٢٩٣–٢٩٤.

(٨١) ابن الشعار: قلائد الجمان، مج٤، ج٥، ص٢٩٤.

(٨٢) ابن حوقل: صورة الارض، ص٢١٤.

(٨٣) ابن حوقل: صورة الارض، ص٢١٤.

(٨٤) ڕۆژبەیانی: مدن كردية قديمة تاريخها–جغرافيتها–رجالها–علمائها–أدبائها داقوق بندنجين مندلي–دينور–خانقين–عقرة، مطبعة هەوال، (السليمانية: ١٩٩٩)، ص ص٦٠–٦١.

(٨٥) ابن الاثير: الكامل، ج١٢، ص٢٢٩ ؛ الغساني: العسجد المسبوك، ص٤٢٤ ؛ الذهبي: تاريخ الاسلام، حوداث (٦٢١–٦٣٠ ه)، ص١٧.

(٨٦) الذهبي: تاريخ الاسلام، حوداث (٥٢١–٥٣٠ ه)، ص٢٥.

(87) البرزالي: المقتفى: ح٢، ق٢، ص ص٣٠٣-٣٠٤.

(88) بڕوانە: البغدادي: الافادة والاعتبار في الامور المشاهدة والحوادث المعاينة بارض مصر، تحقيق: محمد على محسن عيسى، ( بغداد: ١٩٨٧)، ص ص١٦٢-١٦٨.

(89) ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، مطابع كوستاتسوما وشركاه، (القاهرة: د.ت)، ج١٠، ص١٩٦.

(90) مهند نافع خطاب المختار: الازمات الاقتصادية في العراق، اطروحة دكتوراه، جامعة الموصل ـ كلية الاداب، ( الموصل): ٢٠٠٨)، ص٥٨.

(91) محمد محمد المفتي: تاريخ الاوبئة، (بنغازي: ٢٠٠٥)، ص١٧. لە سەردەمی نوێدا دەبینرێن ئەم نیشانانە لەسەر زۆر لە نەخۆشییە گەورەو مەترسیدارەکان جێبەجێ دەبێت، وەك ئیلتهاباتی گەروو و لەوزەتێن و سییەکان و تایەکان وەکو تیفۆ و سکچوونی کەڵەشێری و چەندینی تر...

(92) بڕوانە: ابن حجر العسقلاني: بذل الماعون في فضل الطاعون، تحقيق: احمد عصام عبدالقادر الكاتب، (الرياض:د.ت)، ص٢٦١-٢٧١؛ السيوطي: مارواه الواعون في اخبار طاعون، مخطوطة، موقع شبكة الالوكة ؛ www.alukah.net. ؛ د. محمد محمد المفتي: تاريخ الاوبئة، ص١٧

(93) زانایانی کۆن جیاوازییان لە نێوان ئەو تاعوون- پەتایانەی تووشی کۆمەڵگە دەبوو کردووە، بەوەی تاعوون بە پەتا دادەنێن لەبەر ئەوەی وای بۆ دەچن کە پەتا فراوان و گشتگیرترە، لەبەر ئەوەی تاعوون جۆرێکە لە جۆرەکانی پەتا. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر جار لە سەرچاوە مێژووییەکان بە ژمارەیەك لە نەخۆشییەکان دەڵێن تاعوون. بڕوانە: ابن حجر العسقلاني: بذل الماعون في فضل الطاعون، ص ص١٠٢-١٠٨ ؛ السيوطي: ماروا‌ه الواعون في اخبار طاعون، ص١٠؛ غامس خضير الدورى: الكوارث الطبيعية في العراق، ص٢٠٣.

(94) مقدمة ابن خلدون، (بيروت:١٩٩٩)، ص ص٣٠٢-٣٠٣.

(95) بڕوانە: ئازاد محمدامین نەقشبەندی: ئاووهەوای لۆکاڵی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، (هەولێر: ٢٠١٠) ص ص١٤٧-١٦٥.

(96) احلام حسن - نغم عدنان أحمد: المظاهر الاقتصادية والاجتماعية للازمات الاقتصادية في الاندلس من الفتح حتى سقوط غرناطة، مجلة التربية والعلم، مج١٩، عدد(١)، (د.م: ٢٠١٢)، ص١٨-١٩.

(97) الكتبي: عيون التواريخ، تحقيق: فيصل السامر ونبيلة عبدالمنعم داود، ( العراق:١٩٨٠)، ج٢٠، ص٢٣٤.

[98] المقريـزي: السـلوك، ج٤، ص٨١–٨٣ ؛ ابـن تغـري بـردى: النجـوم الزاهـرة، ج١٠، ص ص١٩٧–١٩٨.

[99] ابـن الجـزري: تـاريخ ابـن الجـزري، تحقيـق: عمـر عبدالسـلام التـدمري، المكتبـة العصـرية، (صيدا–بيروت: ٢٠٠٦م)،ج٥، ص١٢٣.

[100] بڕوانە: المغربي: النجوم الزاهرة في حلي حضرة القاهرة، تحقيـق: حسـين نصـار، دار الكتـب المصرية، ط٢، (القاهرة: ٢٠٠٠م)،ص٢٦٣ ؛ الـذهبي: تـاريخ الاسـلام، حـوادث:٥٣١–٥٤٠هـ)، ص١٩٩.

[101] ابن العبري: تاريخ الزمان، ص ص٢٢٨–٢٣٠ ؛ الغساني: العسجد المسبوك، ص٢٤٤.

[102] ابن الفرات: تاريخ ابن الفرات، دار الطباعة الحديثة، (البصرة: ١٩٦٩م)، مج٤، ج٢، ص٢٠٦.

[103] المسالك والممالك، ص٧٦.

[104]المسالك والممالك، ص٧٦.

[105] ابـن الاثير:الكامـل، ج١٢، ص ص٨٢–٨٣؛ ابـن الفـرات: تـاريخ ابـن الفـرات، مـج٤، ج٢، ص٢٠٦؛ ابـن العـبري: تـاريخ الزمـان، ص٢٢٨–٢٣٠– ٢٣٣؛ الغسـاني: العسـجد المسـبوك، ص٢٤٤.

[106] الاصطخري: المسالك والممالك، ص٧٦.

[107]معجم البلدان: ج٢، ص٢٩١

[108] ابن حوقل: صـورة الارض، ص٢٠٢ ؛ القـزويني: اثـار الـبلاد اخبـار العبـاد، ص٤٦١ ؛ ابـن الجوزي: المنتظم، ج١٠، ص٥٤٣.

[109] المجهول: تاريخ الرهاوي: ص١٨٧.

[110] بڕوانە: فرهاد حاجى عبوش: الكـرد في مؤلفـات المقريـزى التاريخيـة، مطبعـة سـبيريز، (دهوك–اربيل: ٢٠١٠)، ص ص٢٤٧–٢٤٩.

[111] سەرسام: وشەیەکی فارسییە، (سەر) واتە: سەر، وە( سـام) واتـە: وەرەم - نەخۆشـی - واتـە: دیاردەکـانی ئـەو نەخۆشـییە وەرەمـی سـەرە.یان واسـەر، ئەسپەك،سـەروخولێ، نەخۆشییەکی مێشکە زیپکە لە سەروتوێڵ دەردەخـا و نـەخۆش وەك شـێتی لێ دێ. هـەژیر عەبدوڵلاّ پوور: فەرهەنگی هەژیر (فارسـی–کـوردی)، (هـەولێر:٢٠٠٨)، ج٢،ل٧٤٩ ؛ سـوادی عبد محمد: الاحوال الاجتماعية والاقتصادية في بلاد الجزيـرة الفراتيـة (خـلال القـرن السـادس الهجري الثاني عشر الميلادي)، طباعة ونشـر دار الشـؤون الثقافيـة العلميـة، (بغـداد: ١٩٨٩)، ص١٢٦.

[112] ابن الاثير: الكامل، ج١١، ص٢١٨ ؛ ابو شامة: الروضتين، ج٣، ص١٣.

[113] بڕوانە: ابن العبري: تاريخ الزمان، ص٣٤٣.

(١١٤) جعفر حسين خصباك: العراق في عهد المغول الايلخانيين، ص٢٠٩.

(١١٥) حاجى خليفة: تقويم التواريخ، ص١٢٧.

(١١٦) **بڕوانە**: ابن الاثير: الكامل، ج١١، ص٢٩.

(١١٧) جعفر حسين خصباك: العراق في عهد المغول الايلخانيين، ص٢١٠.

(١١٨) ابن الاثير: الكامل، ج١١، ص١٧٢ ؛ موسوعة موصل الحضارية، ج٢، ص١٩٧.

(١١٩) سبط ابن الجوزى: مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، مطبعة دائرة المعارف العثمانية، (حيدر آباد الدكن: ١٩٥١–١٩٥٢)، مج٨، ق١، ص٢١٤؛ ابن تغري بردى: النجوم الزاهرة، ج٥، ص٣٠٣.

(١٢٠) ابن تغري بردى: النجوم الزاهرة، ج٩، ص ص ٢٣٦–٢٣٧.

(١٢١) العمري: مسالك الابصار في ممالك الامصار، تحقيق: مهدي النجم، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٧١م)، حوادث سنة (١٦١–٥٤٠هـ).ج٢٦، ص ص٦٦–٦٧ ؛ موسوعة موصل الحضارية، ج٢، ص١٩٧.

(١٢٢) ابن الجوزى: المنتظم، ج١٠، ص٤٢٦.

(١٢٣) البرسام: وشەیەکی فارسییە و لە دوو بڕگە پێکهاتووە، کە (البر) واتە: سینگ، و (سام) واتە: وەرەم، بەیەکەوە واتە وەرەمی سینگ، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سوادي عبد محمد: الاحوال الاجتماعية والاقتصادية في الجزيرة الفراتية، ص١٣١، **پەراوێزی (٢٥)**.

(١٢٤) الغساني: العسجد المسبوك، ص٦٠٧.

(١٢٥) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سوادى عبد محمد: الاحوال الاجتماعية والاقتصادية في بلاد الجزيرة الفراتية، ص ص١٢٥–١٣٣.

(١٢٦) الدر المطلوب في اخبار ملوك بني ايوب، ج٧، ص١٢١.

(١٢٧) بڕوانە: المقريزي: السلوك، ج٢، ص٨١ ؛ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ج١٠، ص ١٩٦؛ ابن اياس: جواهر السلوك في امر الخلفاء والملوك، تحقيق: د. محمد زينهم، ( القاهرة: ٢٠٠٦)، ص١٩٢ ؛ قاسم عبدة قاسم: النيل والمجتمع المصري في عصر سلاطين المماليك، دار المعارف، (القاهرة: ١٩٧٨)،ص٦٥.

(١٢٨) بڕوانە: السرياني: تاريخ مار ميخائيل السرياني، ٢٢٣.

(١٢٩) هەوکردنێکی ڤایرۆسییە و تایبەتە بەباڵندەکان بەنزیکبوونەوەی مرۆڤەوە لەوکاتەدا لێیان بۆی دەگوازرێتەوە، ڤایرۆسەکەشی دوو جۆرە بەناوی أ–N1 H5 ب–N9 H7.
WWW.Who.int

(١٣٠) ابن حبيب: تذكرة النبيه في ايام المنصور وبنيه، ج١، ص٢٥٦ ؛ النويري: نهاية الارب، مج٣٢–ج٣٢، ص٥٤.

[١٣١] (الصدام): پەتایەكە تووشی سەری ولاغ و ئەسپ دەبێت، یان وشتر كە ورگی پڕ لە ئاو دەبێت، و بە بەردەوامیش تینوویەتی تا چەند رۆژێكی پێدەچێت و دەمرێت یان چاك دەبێتەوە. ابن منظور: لسان العرب ( مادة صدام).

[١٣٢] غامس خضير الدوري: الكوارث الطبيعية في العراق، ص٢٥٣.

[١٣٣] المقريزي: السلوك، ج٤،، ص٨١ ؛ ابن تغرى بردي: النجوم الزاهرة، ج١٠، ص ١٩٦.

[١٣٤] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: یونس حمادي علي: مبادىء علم الديمغرافية (( دراسة السكان))، ( الموصل:١٩٨٥)، ص ص٤٧–٤٩؛ احمد محمد الاوتاني: دمشق في العصر الايوبى، ص٢٣٩.

[١٣٥] ابن نظيف الحموي: تاريخ المنصوري تلخيص الكشف والبيان في حوادث الزمان، تحقيق: د.أبوالعيد ودود، مطبعة الحجاز، (دمشق: ١٩٨٠م).، ص١١٤.

[١٣٦] ابن حبيب: تذكرة النبيه، ج١، ص٢٥٧.

[١٣٧] بڕوانە: ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ج١٠، ص ١٩٨ – ج١١، ص٢٦.

[١٣٨] الدواداري: الدر المطلوب في اخبار ملوك بني ايوب، ج٧، ص١٢١.

[١٣٩] السرياني: تاريخ مار ميخائيل السرياني، ص٢٠٤.

[١٤٠] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٨، ص٣٩٧.

[١٤١] السرياني: تاريخ مار ميخائيل السرياني، ص٢١١.

[١٤٢] ياسين العمري: زبدة الاثار، ص٥٢ ؛ غامس خضير الدوري: الكوارث الطبيعية في العراق، ص ص١٤٧–١٥٧؛ جاسم محمد حسن العدول: الكوارث والظواهر الطبيعية في الموصل من خلال مؤلفات المؤرخ الموصلي ياسين بن خيرالله الخطيب العمري، ص١١.

[١٤٣] السرياني: تاريخ مار ميخائيل السرياني، ص٣١٢ ؛ غامس خضير الدوري: الكوارث الطبيعية في العراق، ص١٥٧.

[١٤٤] ياسين العمري: زبدة الاثار، ص ص٥٢–٥٤.

[١٤٥] بڕوانە: غامس خضير الدوري: الكوارث الطبيعية في العراق، ص١٤٨.

[١٤٦] گەرماوی گەیارە: گەرماوێكە دەكەوێتە نزیك موسڵ و، ئاوێكی كبریتی كانزایی هەیە خەڵك خۆیان تێدا دەشۆرد بە نیازی چارەسەری نەخۆشی. الشابشتي: الديارات، تحقيق: كوركيس عواد، (بيروت:١٩٨٦م)، ص ص٣٠٢–٣٠٣؛ شيخ الربوة: نخبة الدهر في عجائب البر والبحر، ص١١٩ ؛ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٤، ص٤١٩.

[١٤٧] ابن الاثير:الكامل، ج١٢، ص٢٢٩ ؛ الذهبي: تاريخ الاسلام، حوادث (٦٢١–٦٣٠)، ص١٧.

[١٤٨] ابن القلانسي: ذيل تاريخ دمشق، ص٣٠٣.

[١٤٩] ابن الاثير:الكامل، ج١٢، ص٢٣٢؛ تاريخ الاسلام،ص١٧.

(١٥٠) الغساني: العسجد المسبوك، ص٤٢٩.

(١٥١) ابـن الاثـير: الكامـل، ج١٢، ص٢٢٩ ؛ الـذهبي: تـاريخ الاسـلام، حـوادث(٦٢١–٦٣٠هـ)، ص١٧.

(١٥٢) ياسين العمري: زبدة الاثار، ص٥٢.

(١٥٣) ياسين العمري: زبدة الاثار، ص٥٤ ؛ جاسم محمد العدول، الكوارث والظواهر الطبيعيـة مـن خلال كتابات العمري، ص١١.

(١٥٤) متي الرهاوي: تاريخ الرهاوي، ص١٦٤.

(١٥٥) بڕوانە: السرياني: تاريخ مارميخائيل السرياني، ص ص٢١١–٢١٢.

(١٥٦) الدواداري: الدر الفاخر في سيرة الملك الناصر، ج٩، ص١٠٨.

(١٥٧) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٨، ص٢٨٩.

(١٥٨) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٨، ص٢٩٧.

(١٥٩) السـرياني: تـاريخ مـار ميخائيـل السـرياني، ص١٧٤؛ ابـن حبيـب: تـذكرة النبيـه، ج٣، ص٢٤٨.

(١٦٠) السرياني: تاريخ مار ميخائيل السرياني، ص٢١١.

(١٦١) موسوعة موصل الحضارية، ج٢، ص١٩٤.

(١٦٢) الغساني: العسجد المسبوك، ص٤٤١ ؛ سوادي عبد محمد، ص ص٣٠٣–٣٠٨.

(١٦٣) بڕوانە: السرياني: تاريخ مارميخائيل السرياني، ص٣١٢.

(١٦٤) بڕوانە: الراوندي: راحة الصدور و آية السرور في تاريخ الدولـة السـلجوقية، ت: ابـراهيم امـين الشواربي–وآخرون، مجلس الاعلى للثقافة، (القاهرة: ٢٠٠٥م)، ص٣٢٨.

(١٦٥) بڕوانە: السرياني: تاريخ مار ميخائيل السرياني، ص٣١٢.

(١٦٦) الشيخ الربوة: نخبة الدهر في عجائب البر والبحر، ص ص٩٦–٩٧.

(١٦٧) سوادي عبد محمد: الاحوال الاجتماعية والاقتصادية في بلاد الجزيـرة الفراتيـة، ص ص٣٩–٤١.

(١٦٨) بڕوانە: العظيمـي: تـاريخ العظيمـي، ص٣٦٨ ؛ المجهـول: اخبـار سـلاجقة الـروم (مختصـر سلجوقنامة)، ت: محمد السعيد جمال الدين، المركز القومي للترجمة، (القـاهرة: ٢٠٠٧م)، ص ص٢٧٦ –٢٧٧؛ المقدسي: ايقاظ الغافل بسيرة الملك العادل نورالدين الشـهيد، تحقيـق: عمـر عبدالسلام التدمري، المكتبة العصرية، (بيروت: ٢٠٠٦م)، ص٧٦.

(١٦٩) بڕوانە: احمد سوسـة: فيضـانات بغـداد في التاريخ،(بغـداد: د.ت).، ج١–٢؛ احمـد عيسـى: تاريخ البيمارستانات في الاسلام، (دمشق:١٩٣٩)، ص١٩١ ؛ قاضي احمد تتوى: تاريخ ألفي، ج٥، ص٣٢٩٤. بە هەمان شێوە لە ساڵەکانی ٥٦٩ك/٦٤٦ ٦٥٣ك، هەمان ڕووداو دووبـارە و

سێباره ڕوودەدات. بڕوانە: ابن الجوزي: المنتظم، ج١٠، ص٥١٧؛ ابن الفوطي: الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في المائة السابعة، تحقيق: مصطفى جواد، المكتبة العربية، (بغداد: ١٩٣٢م)، ص٢٣٠–٢٧٧.

(١٧٠) اليافعي: مرآة الجنان وعبرة اليقظان في معرفة مايعتبر من حوادث الزمان، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٧م).، ج٣،ص ١٥٢–١٥٣ ؛ الذهبي: تاريخ الاسلام، حوادث (( ٦٤١– ٦٥٠ ه))، ص٤٦.

(١٧١) بڕوانە: النويري: نهاية الارب، ج٢٧، ص٨٦.

(١٧٢) ابن الجوزي: المنتظم، ج١٠، ص٥١٧.

(١٧٣) ابن الفوطي: الحوادث الجامعة، ص٢٧٣ ؛ الغساني: العسجد المسبوك، ص٥٦٤.

(١٧٤) ابن الفوطي: الحوادث الجامعة، ص٢٢٩ ؛ الغساني: العسجد المسبوك، ص٦٠٨.

(١٧٥) ابن الجزري: المختار من تاريخ الجزري، ص٢١٨.

(١٧٦) اليافعي: مرآة الجنان،ج٣، ص ص١٥٢–١٥٣ ؛ المقدسي ايقاظ الغافل، ص٧٦.

(١٧٧) العظيمي: تاريخ العظيمي، ص٣٨٦.

(١٧٨) بڕوانە: محسن محمد حسين: هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگیدا، و.عوسمان علی قادر، چاپخانەی حاجی هاشم، (هەولێر: ٢٠١٠). ص ص٢٣٨–٢٤٦.

(١٧٩) ابن الفرات: تاريخ ابن الفرات، مج٤، ج١، ص ١١١–١١٢.

(١٨٠) الذهبي: دول الاسلام،، تحقيق: حسن اسماعيل مروة، دار صادر، ط٢، (بيروت: ٢٠٠٦م)،ج٢، ص٧٤.

(١٨١) موسوعة موصل الحضارية: ج٢، ص١٩٤.

(١٨٢) بڕوانە: النويري: نهاية الارب، ج٣٢، ص١٧٨ ؛ ابن حبيب: تذكرة النبيه، ج٢، ص٧٤.

(١٨٣) المجهول: تاريخ الرهاوي، ص١٨٧.

(١٨٤) السرياني: تاريخ مار ميخائيل السرياني، ص٣٣٦.

(١٨٥) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٨، ص٢٨٩.

(١٨٦) ابن العبري: تاريخ الزمان، ص١٤٣.

(١٨٧) بڕوانە: الدواداري: الدر الفاخر في سيرة الملك الناصر، ج٩، ص٢٩١ ؛ المقريزي: السلوك، ج٢، ص٥١٥.

(١٨٨) ابن قاضي شهبة: تاريخ ابن قاضي شهبة، تحقيق: عدنان درويش، (دمشق: ١٩٩٤م)،مج٣، –ج٢، ص٤٣٧ ؛ ابن حجر العسقلاني: انباء الغمر بأبناء العمر، دار الكتب العلمية، ط٢، (بيروت: ١٩٨٦م)ج١، ص٨٠ ؛ ابن اياس: بدائع الزهور في وقائع الدهور، ج١، ص١٣٣.

(189) ابن العبري: تاريخ الزمان، ص٣٣٣؛ علي عادل: اربيل في الفترة (٦٣٠-٨٧٤هـ/١٢٣٣-١٤٦٩م)-دراسة سياسية حضارية، اطروحة دكتوراه، جامعة صلاح الدين-كلية الآداب، (أربيل: ٢٠٠٦)، ص٢٣١.

(190) الدواداري: الدر المطلوب في اخبار ملوك بني ايوب، ج٧، ص٦٣.

(191) الغساني: العسجد المسبوك، ص١٧٦.

(192) بڕوانە: الاصفهاني: سنا البرق الشامي (مختصر البرق الشامي في سيرة السلطان صلاح الدين)، تحقيق: رمضان ششن، (استانبول: ٢٠٠٤م).، ص ص٣٥٨-٣٥٩؛ اليافعي: مرآة الجنان، ج٣، ص٣٢١.

## ملخص البحث

ان هـذا البحـث يتنـاول الكـوارث الطبيعيـة مـن حيـث تأثيرهـا علـى الازمـات الأقتصادية التى اصـابت كردسـتان خـلال القـرون ٦-٨ هجريـة/١٢-١٤ميلاديـة. إذ كانت الازمات الاقتصادية نتيجة لعوامل طبيعية في بعض ألأحيان وعوامل بشرية فـى أحيان اخرى. اما العوامل الطبيعية وهي موضوعة البحث فتمثلت فى الجفـاف وغـزو الحشرات الضارة وخاصة الجراد، وكذلك تفشى الامراض والاوبئة التي كانـت تـؤثر في عملية الانتاج سلبا.وكانت تساقط الثلوج والبرد والصقيع تؤدي بالمنتوجات الزراعية في بعض الاحيان كما كانت الفيضان والرياح القويـة تـؤدي الى نتـائج سـلبية مماثلـة ايضا.

## Abstract

This research tackles the effect of natural calamities on the economic crises that befell on Kurdistan during the Sixth to Eighth Centuries A.H /12 to 14 centuries A.D. This research assumes that the economic crises are the result of natural causes and/or human causes in some other cases. The natural causes include aridity, harmful infestation, specially rats, the incidents of diseases and plagues that affect the production negatively. Snowing, hail, frost, floods, and strong winds also devastated the agricultural products.

# ڕەوشی تەندروستی و خزمەتگوزاریی گشتی لە لیوای سلێمانی لە نێوان سالآنی (١٩٢١-١٩٥٨)

حسێن ئیسماعیل عەزیز

قوتابی دکتۆرا

(بەشی مێژوو — کۆلیژی ئەدەبیات — زانکۆی سەلاحەددین)

## پێشەکی

ژیانی کۆمەلآیەتی پاشخانی مێژوویی هەیە و دەرهاویشتەی ڕابردووە، بەلآم بەشێوەیەکی گشتی ئەم لێکۆڵینەوەیە سەردەمی پاشایەتی لە خۆ گرتووە، سەرباری ئەوەی لە نێوان سالآنی (١٩٢١—١٩٢٥) لیوای سلێمانی لە دەرەوەی ڕکێفی دەسەلآتی پاشایەتی بووە. تەنانەت ناوچەی پشدەر تاکو سالّی (١٩٣٨) بارودۆخی تایبەتی هەبووە. حکومەتی ناوەند دەسەلآتی بەسەردا نەبووە، بەلآم بەگشتی لێکۆڵینەوەکە لە نێوان سالآنی (١٩٢١—١٩٥٨) ڕەوشی تەندروستی و خزمەتگوزاریی گشتی ئەم لیوایەی شەنوکەو کردووە، هەرچەندە لیوای سلێمانی بە یەکێك لەو (١٤) لیوایەی عێراق لە سالّی (١٩٢٢) دیاری کرا، هاوزەمان لەسەردەمی پاشایەتیدا لە ڕووی خزمەتگوزارییەوە خەڵکی شاری سلێمانی هەوڵیان داوە شارەکە بەرەوپێش ببەن، بەلآم یەکێك بووە لەو لیوایانەی کە کەمترین پشکی خزمەتگوزاری بەرکەوتووە، سەرباری ئەوەی زۆرینەی ڕەهای دانیشتوانەکەی کورد بوونە کەمینەکانی وەکو جوو و مەسیحی تێدا ژیاوە، بە بەراورد بە لیواکانی تری عێراق لە زۆر ڕووەوە پەراوێز خراوە، سەرەڕای ئەمەش لەبەر ئەوەی سەنتەری لیواکە شارێکی زیندوو بووە، بۆیە هەمیشە ڕەوتی گەشەکردنی ڕوو لە پێشکەوتن بووە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە ئاوڕدانەوەیەکی مێژووییە لە دۆخی خزمەتگوزاریی ئەو لیوایە لە ڕووی خزمەتگوزاریی گشتی و تەندروستییەوە، دابەشی سەر دوو تەوەر بووە، هەر تەوەرێك چەند باسێکی لە خۆ گرتووە. تەوەری یەکەم باسەکانی

(باری تەندروستی و نەخۆشخانە و تیمارگەکان) دەکات، کە ئاوڕدانەوەیە لە دۆخی باری تەندروستی و ژمارەی نەخۆشخانە و نۆژدار و ڕێژەی نەخۆشی .

تەوەری دووەمیش باسەکانی خزمەتگوزاریی شارەوانی و پاك و خاوێنی لەگەڵ کارگێڕیی خۆجێیەتیدا خستووەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە .

هیوادارم بەم توێژینەوەیە توانیبێتم لایەنێکی مێژوویی سەبارەت بە بابەتی کۆمەڵایەتی لە لیوای سلێمانی سەردەمی پاشایەتیدا بخەمە ڕوو.

## تەوەری یەکەم: ڕەوشی تەندروستی :

### أ- باری تەندروستی:

بەشێکی زۆری دانیشتوانی لیواکە لە ڕووی بیر و باوەڕی میللییەوە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانیان باوەڕیان بە پیر و شێخ و سەید و مەلا و نوشتە و قسن و مەزاری نزرگە هەبووە، لێرە و لەوێ هەندێك کەسیش باوەڕیان وابووە کە نەخۆشی دەردێکی خوایە و خوا خۆی دەرد و نەخۆشی دەدات خۆشی دەرمان دەنێرێت، بۆیە سەردانی حەکیم و نۆژدار و شێخ و نزرگەیان نەکردووە[1]. لەگەڵ ئەمانەشدا میللەتی کورد هەر لە دێرزەمانەوە بایەخی بە دەواودەرمان و نۆژداری داوە[2]، هەندێ کەس لە شارەکاندا جۆرە شارەزایەکیان لە بواری پزیشکی میللیدا هەبووە، خەڵکی بە مەبەستی چارەسەرکردن سەردانیان کردووە، ئەمەش لە ئەنجامی مومارەسە و ئەزموونەوە سەرچاوەی گرتووە، یاخود لە باوك و کەسوکاریانەوە فێربوون، هەروەها سەرەتا دەلاکەکان منداڵانی کوڕیان خەتەنە کردووە و برین و سووتاویان تیمار و چارەسەر کردووە. لە لایەکی دیکەوە پیاوە ئاینییەکانیش ڕۆڵێکی باڵایان هەبووە، ئەوانەش بە دوعا و نوشتە یان بە دەرمانی ئەو کاتە چارەسەریان بۆ نەخۆشەکان داناوە. لە هەر گەڕەکێك چەند ژنێك شارەزاییان لە مامانیدا هەبووە، ئەم جۆرە پزیشکە میللییە هەتا پاش ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی و هاتنی بریتانییەکان لە ساڵی (١٩١٨) بۆ ناوچەکە و سەردەمی پاشایەتی بەردەوام بووە، لە سەردەمی عوسمانیدا دامودەزگایەکی تەندروستی لەم ناوچەیەدا نەبووە، هەندێ جار پزیشکی سەربازی هاتوون

بەشێوەی گەڕۆك، ئەوەش تایبەت بە بەشی سەربازی ئەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی بووە[٣].

بۆ پێشگرتن لەو هەموو بەناو حەکیم و عەیادە لاکۆلانانە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) هۆشداری داوەتە ئەو کەسانەی ئەو پیشەیان هەبووە، کە پێویستە تاقیکردنەوە لە لای پزیشك ئەنجام بدەن و مۆڵەتی فەرمی وەربگرن، ئاماژەی بەوەش کردووە کە ئەوەی سەرپێچی بکات. مۆڵەتی کارکردنی نەبێت سزا دەدرێت، لە هەزار ڕوپیە[٤] یاخود لە شەش مانگ بەندکردن زیاتر نەبێت، تەنانەت ئەگەر پیاو یان ژن بێت هەمان سزا دەدرێت[٥]، هەر لە سەردەمی بریتانییەکاندا باس لەوە کراوە کەس بۆی نەبووە کاری نۆژداری و دانسازی و مامانی بکات، تاکو ڕەزامەندی فەرمی کارکردنی پیشەیی (ممارسة المهنة)ی نەبێت[٦]. دەسەڵاتدارانی بریتانیش ئاوڕی تەواویان لەم بوارە نەداوەتەوە، تەنها ئەوە نەبێت کاتێك دوای جەنگی یەکەمی جیهانی مێجەر نوئیل[٧] گەیشتە سلێمانی یەکێك لە هاوەڵەکانی دکتۆر بوو، لەگەڵ هاتنیاندا کەوتوونەتە کۆکردنەوەی ئەو جەڕاح و حەکیمانەی کە بەکاری پزیشکییەوە خەریك بوون و خەڵکیان چارەسەر کردووە، ڕەوانەی بەغدا کراون لە ژێر چاودێری دکتۆرە بریتانییەکاندا تاقیکردنەوەیان بۆ کراوە و مۆڵەتی فەرمییان پێدراوە[٨].

ئیدی تاکو ناوەڕاستی سەدەی بیست ژمارەیەکی زۆر حەکیم و جەڕاح لەناو شاری سلێمانیدا ڕۆڵی پزیشکیان بینیوە، هەر وەکو ئەوانەی پێش خۆیان بەخۆڕایی یاخود بە پارە نەخۆشیان چارەسەر کردووە، لەوانە: (حەمە نادر، عەزەی حەکیم ئیبراهیم، بەکری میسری، قادر کوردە، تۆفیق عەنتەر، سەید خەلیل، سەید خدر، ڕەشەی خەجەلاو، ساڵح بانەیی، شێخ لەتیف شێخ عەبدولکەریم (شێخ لەتیفی دانسان)، حسێن قازاوی، کەریم بەگی جەڕاح، فەرەج داروغایی، ئەحمەد ئاغای چاوبڕ، وەستا عەلی عارفی دەلاك، مەلا عەزیز، محەمەدی جەڕاح، مەلا ئەحمەد سنجەری، فوئاد زەکەریا، سەعید سەلمون، مەحموود شەوکەت سەعید)، هەروەها حەکیمی ژنانیش هەبوون کە ڕۆڵی بەرچاویان لەو بوارەدا گێڕاوە وەکو (فەرخەخان) کە خێزانی عەزەی حەکیم بووە، هەروەها (خەجێ شلیش) و خورشیدە عەلی سامئاغایی خێزانی حاجی کەریمی

شمقار بووە، ئەمانە لەماڵەکانی خۆیاندا نەخۆشیان چارەسەر کردووە، پاش ئەوەی کە شاری سلێمانی لە سەرەتای ساڵەکانی سییەکانی سەدەی بیستدا بەرەو قەرەباڵغی چووە، ئەو حەکیمانە دەرمانی گژوگیای زیاتریان ویستووە، چونکە ڕێژە و ژمارەی نەخۆشییەکان ڕووی لە زیادبوون بووە، لە کۆتایی سییەکاندا تاکوتەرا دووکانی ڕووەك و گیا پزیشکییانە لە سلێمانی مابووەوە، لە لایەکی دیکەوە دروستکردنی نەخۆشخانە و هاتنی پزیشك کاری ئەوانی بەرەو کۆتایی بردووە[9].

هەڵبەتە دەرمانی میللی هەر لەخۆیەوە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی کوێرانە بەکار نەهێنراون، بەڵکو لە ئاکامی ئەزموون و تاقیکاری بەدەست هێنراوە[10]. لە کوردستاندا زۆر چەشنە ڕووەك و گژوگیای جۆراو جۆری دەرمان بە خۆڕسکی ڕواوە، کە مرۆڤ بە ژیری و کارامەیی خۆی بۆ دابینکردنی گوزەرانی ژیانی خۆیان، یاخود بۆ دروستکردنی دەرمان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان کەڵکی لێوەرگرتووە[11]. لەو سەردەمانەدا ئەو جۆرە ڕووەکانە بە زۆری لە ناوچەکانی دەوروپشتی سلێمانی و شوێنەکانی دیکەی کوردستان و هەندێکی لە بەغدا و ئێرانەوە هێنراون[12]. هەروەها چەندین جۆر دەرمانیان لە کەرەستە خاوەکان دروست کردووە، کە لە گژوگیای بەروبوومی ڕووەك و بەروبوومی ئاژەڵ و باڵندەکان کە هەریەکەیان چارەسەری جۆرە نەخۆشییەکیان پێکردوون، گرنگترین ئەو کەرەستە خاوانە ئەمانە بوون، (بنێشتە تاڵ، هەنگوین، کاکڵە گوێز، گوێزی فەریکە، گەڵای گوێز، توو، قەزوان، ڕازیانە، بەڕەزا، بەرزەڵنگ، گوڵەباخ، گوڵە فەقێ، گوڵەحاجیانە، بەنەوشە، گیا سۆپا، گەڵا تووڕك، گەڵا مێوی کشمیش، گەڵا هەنجیر، ئاوی نەعناع، ئاوی کەرەوز، پیازی پیشاو، گێلاخە، گەبڵە، سەیاران، تەماتەی گەرمکراو، ئاوی تەماتەی کاڵ، شەڵەمە، ڕۆن گەرچك، گۆزروان، ترشە سماق، مێخەك، گوڵە هێرۆ، گەزەنی، کووزەڵە، پونگە، پەڵپینە، ماست، شیری کاڵ، گۆشتی ژیژك، گۆشتی ڕێوی، نۆك، ڕەشکە، شمڵی، شویت، شاتووی وشککراو، تووترك، توێکڵی هەنار، گوڵاو، گوڵنار، تەڕینە، گەڵا بی، تووتن، ڕیشاڵی گەنمە شامی، بەهێ، هەرمێ، سێو، هەروەها حەوت دەرمانە لەمانە مازووی شین و گوڵنار و خوێ و مێخەك و سمڵ و گوڵە هەرتەل.. هتد دروست دەکرێت[13].

ئەو کەسانەی بەهۆی ڕووداوەکانەوە ئەندامێکی لەشیان (شکاوە) براوەتە لای شارەزایانی ئەو بوارە، ئەوانیش دوای پشکنین چەند کەرەستەیەکیان بەکارهێناوە بۆ چارەسەری جۆری شکستەکە وەك: (ئاوی شلەتێن، سابوون، مشەمای هێلکە، تەختە داری تاشراوی بەئەندازەیەکی ڕێکوپێك، پێستە و چەرم، دووگ، خورما و ڕۆن، مۆم، نیوە نمەك....هتد)، دوای شتن و شێلان و ڕاکێشان و تەقاندن و ڕێککردنەوەی ئەندامە شکاوەکە، بەو کەرەستە سەرەتاییانە چارەسەریان کردووە. ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشییەکانی (پێست، گەڕی، کەچەڵی، دومەڵ، سکچوون، زیپکە، ڕشانەوە، میز گیران، هەناوییەکان، هەوکردن، فشاری خوێن، ڕۆماتیزم، باداری، شەکرە، ئازاری گورچیلە، نەخۆشییەکانی ژنان، لاوازییە سێکسییەکان، هەلأمەت، دان ئێشە، سەرئێشە، تەنگە نەفەسی، بالووکە، بوون، یاخود مار و دووپشك پێوەی دابوون،...هتد) ببوون، براونەتە لای شارەزایانی ئەو نەخۆشییانەی کە بەحەکیم و دانساز ناسراون[١٤]، بەشێك لەو چارەسەرانە دواکەوتوو و ناتەندروست بوونە، لە گوندەکاندا کاتێك کەسێك ددانی ژانی هەبووایە چووەتە لای نالبەندەکان، چونکە ئەوانە گازی بزمار کێشانەوەیان هەبووە، بە شێوەیەکی نادروست ددانەکەی دەرهێناوە یان بەنێکی دەبەستە ددانیەوە سەرێکی پەتەکەی بە شیشی پەنجەرەیەکەوە قایم کردووە، ددانەکەی کێشاوەتەوە. یان مامانەکان بە چەقۆیەکی کول و قەڵەمبڕێکی ژەنگاوی ناوکی منداڵیان بڕیوە، دواتر کۆرپەکە دەمرد دەیانگوت شەوە بردوویەتیەوە بۆ ئەو مەبەستەش شەوە کار لە منداڵەکان نەکات وەکو نەریتێك لە کاتی لەدایکبوونی منداڵێك حەوت شەو و حەوت ڕۆژ ئیشکی منداڵەکانیان گرتووە[١٥] یاخود بۆ چارەسەرکردنی باداری (ڕۆماتیزم) گۆشتی ڕێوی یاخود گۆشتی ژووژوو (ژیژك)یان کوڵاندووە و دەرخواردی نەخۆشەکەیان داوە[١٦].

لە قەزاکانی لیواکەدا لەو جۆرە حەکیم و جەڕاح و مامان و دەرمانسازانە هەبوون، بۆ نموونە لە شاری هەڵەبجەدا دەرمانخانەکان (دەرمانی کوردی) ئەمانە بوون: ١ – وەستا سادق ٢– سەعدی فەرەج سلێمان ٣–خورشیدە شێخ ئەمین ٤– ڕەعنا عەباس[١٧].

لــە نــاو خــەڵکی هــەورامان و لــە ســەردەمە جیاوازەکانــدا کەســانێك بــۆ چارەسەرکردنی هەندێك نەخۆشی بەشێوەیەکی پزیشکی میللـی شـارەزا و کارامـە بوون، وەك: (چاککردنەوەی شکان و لە جێ چوونی دەست و قاچ و لەجێ چوونی کلـۆك و شـان) ئـەم جـۆرە کەسـانە بـە زمـانی خـەڵکی ناوچـەکە (جـەڕاح)یان پێوتراوە[18].

لە ناوچەی پێنجوێن بنکـەی تەندروسـتی و پزیشـك و دەرمـانی پێشـکەوتوو نـەبوو، بـەڵام (حـەکیم و جـەڕاح)و دەرمـانی کـوردەواری و کەسـانی ئەزموونـدار هــەبوون و چارەســەری زۆربــەی نــەخۆش و برینــدارەکانیان کــردووە، بەدەرمانــە کوردەوارییەکانی وەکـو جۆرەکـانی ڕووەك بـۆ جـۆرە نەخۆشـییەکان وەکـو سـەر ئێشە و سك ئێشە و برینداری و گرتنەوەی شوێنی شـکاو بـە هـۆی شـارەزاکانەوە چارەسەر کراون[19].

نەخۆشــییەکانی وەك: لــەرزوتا (مــەلاریا)، گرانــەتا (ســێوەڕۆ)، ســیل، سوورێژە، تاعوون، بەچەوازی، چاویەشە (گلاراو)، ئاوڵە (ئاوڵە و زلزڵە)، کەچەڵی، شلی، ئاوبەن، گەزاز(شەوەگرتنی منـاڵ)، نـاوك کـەوتن (سـك ئێشـە)، سـەرکەوتن (سەرئێشە) کە نەخۆشی بەربڵاو بوون، هەندێکیان بوونەتە هـۆی مردنـی منـداڵ و گەورە. وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد نوشتە و جادوو، لەرزبرین بە دۆعـا و پـەڕۆ و دەزوو. گڵکۆ و مەزاری مردووەکانیـان کـە هەریەکـەیان بـە بۆچـوونی ئـەو کاتـە چارەسەری نەخۆشییەکیان لە ئەستۆی خۆیان گرتبوو[20].

لەو سەردەمەدا خەڵکی بە هەموو جۆرە نەخۆشییەك وەك لـەرزوتا و ئاوڵـە و کــەم خــوێنی گرفتــار بــوون[21]. دامودەزگاکــانی حکومــەت بایــەخیان بــە چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییانەی کە بەربڵاو بوون داوە، هەر بۆیـە لـە ڕۆژنامـەی (پێشکەوتن) بانگەوازی بۆ خەڵکی شار بڵاوکردووەتـەوە بـۆ ئـەوەی منداڵـەکانیان سەردانی نەخۆشخانە بکەن، تاکو دژ بە نەخۆشی ئاوڵە دەرزییـان لێبـدەن[22]، لـە ناوچەی رانیە و پشدەر پەتایەکی بەربڵاو لە ساڵی (١٩٢٢) بـڵاو بـووەوە، ئەمـەش بووەتە هۆکاری مردنی هەندێك کەس، چونکە لـەو ناوچـەیە نەخۆشـخانە نـەبووە، بۆیـە لـە شـاری سـلێمانی هەڵمـەتی کوتـان لـە نەخۆشـخانەی سـلێمانی دەسـتی پێکــردووە و لــە ڕۆژنامــەی (پێشــکەوتن) ئاگــاداری بــۆ ئــەو مەبەســتە بــڵاو

کردووەتەوە[٢٣]. تەنانەت "ڕشانەوە زۆر پەرەی سەند و بڵاو بووەوە، شارەزووری پێیان ئەوت (چاوەقووڵە)، لە ترسی ئەوە تووشی نەخۆشییەکە نەبێت کەس نەیوێراوە بچێ یاسینی نەخۆش بخوێنێت یاخود سەردانی بکات، ئەوەی تووشی ئەو نەخۆشییە ببوایە بەهیوا نەبوو، شەو بگاتە سبەی یان بەڕۆژ بگاتە ئێوارە"[٢٤]. خەڵکی کەمتر هوشیاری تەندروستییان هەبووە، تەنانەت تا ساڵانی کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیش خەڵك خۆی لە ئاوی نێو حەوزی مزگەوتەکان هەڵکێشاوە، بەمەش دەیان نەخۆشی و پەتای دیکە بڵاو بووەتەوە[٢٥]. لە بەرنەبوونی دکتۆری پسپۆڕ بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە تەنانەت ئەو ڕۆژگارە ژنە قەرەج بە کۆڵانەکاندا دەسووڕانەوە دەرمانیان بەخەڵك دەدا، لەم بارەیەوە ژیان لە ساڵی (١٩٣٣)دا، دەڵێت: "هیچ خاکێك بەقەد خاکی ئێمە جێی نەخۆشی نییە، خاکەکە خۆی لایەکی گەرمە و لایەکی ساردە، مێشوولە و هورك و کێچ و مێرووی زیانبەخش کە نەخۆشییان پێوەیە ژیانیان لە خەڵك تاڵ کردبوو، " ئەمانە فاکتەری تەشەنەکردنی جۆرەها نەخۆشی و پەتا بوون[٢٦]. سەرباری ئەوەش حکومەتی ناوەندی هێندە بەتەنگ ڕەوشی گوزەرانی دانیشتوانی شارەکەوە نەبووە، فەرمانگەی تەندروستی و شارەوانی سلێمانی کەمتەرخەمییان زۆر هەبووە، تەنانەت تا ساڵانی (١٩٣٧) ئینجا دەرمانی مەلاریای بەناو شاردا ڕشتووە، لەلایەکی دیکەوە هیچ چارەسەرێکی بۆ مێروویەکی زیانبەخشی وەکو (کێچ) بەدەستەوە نەبووە، کە تا ساڵانی پەنجاکان لە سلێمانی پرزەی لە خەڵك بڕیبوو. مرۆڤ شەو تا بەیانی لە حەژمەتا خەوی لێ نەکەوتووە[٢٧]. لە هەندێك شوێنی لیواکە و بەتایبەت لە شارەزووردا[٢٨]لەبەر کێچ و دووپشك مرۆڤ خۆی پێنەدەگیرا، خەڵکی لە بەر کێچ لە وەرزی بەهاردا خانووەکانیان چۆڵ کردووە و لە ڕەشماڵدا ژیاون[٢٩].

ڕۆژنامەی (ژیان) باس لە گوزەرانی ناو بەندیخانەکانی سلێمانی دەکات کە هیچ مەرجێکی تەندروستی تێدا نەبووە، لە هەمان کاتدا کاری سوخرە و پاککردنەوەی بەندیخانەکانیان بە بەندییەکان کردووە، هیچ خزمەتگوزارییەکی تەندروستییان بۆ فەراهەم نەکراوە[٣٠].

هەروەك لەم خشتەی لای خوارەوە ئاماری تووشبووان لە هەندێك سالآنی (١٩٤٥–١٩٥٢) دەخەینە روو کە گەواهیدەرە بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە سنووری لیواکەدا:

**خشتەی ژمارە (٤)**

**(ژمارەی تووشبووان بە نەخۆشی مەلاریا و تەراخوما لە نێوان سالآنی ١٩٤٥–١٩٥٢)**[٣١]

| | سالٚ | ١٩٤٥ | ١٩٤٦ | ١٩٤٧ | ١٩٤٨ | ١٩٤٩ | ١٩٥٠ | ١٩٥١ | ١٩٥٢ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| لیوای سلێمانی | تووشبووانی نەخۆشی مەلاریا | ١١٧٥٦ | ٢٦٥٩٨ | ١٩١٠١ | ٧٢٢٤ | ٢٢٦٨٨ | ٣٥٠٦٧ | ١٧٦٢٤ | ٢٣١٢٠ |
| | تووشبووانی نەخۆشی تەراخوما | ٢٠٣٣١ | ٢٧٠٦٨ | ٢٥١٥٦ | ٢٣٧٤٠ | ١٤٧٩٩ | ١٤٥٥٦ | ١٧٤٣٧ | ١٧٧٨٦ |

وەکو لەو خشتەی سەرەوە دەردەکەوێت هەندێك لە ساڵەکان نەخۆشی و پەتای مەلاریا و تەراخوما لە هەڵکشان و داکشاندا بووە، ئەمەش ئەو راستییە دەخاتە روو، کە حکومەت بایەخی بە لایەنی تەندروستی نەداوە و چارەسەریی بنەڕەتی نەکردووە، خەڵکیش کەمتر هۆشیارییان لەمەڕ تەندروستی هەبووە.

**ب- نەخۆشخانە و تیمارگەکان:**

لیوای سلێمانی بەراورد بە شارەکانی دیکەی عێراق لە لایەن حکومەتەوە کەمتر بایەخ بە لایەنی تەندروستی دراوە، رێژەی خزمەتگوزاری تەندروستی و پزیشك و خەستەخانە و دەرمانخانەی لە هەموو لیواکانی تری عێراق کەمتر بووە[٣٢].

پزیشك لە دێهاتەکاندا نەبووە، ئەگەر (برین پێچ)ێك، لە سەنتەری ناحیەدا هەبووایە بە دکتۆر بانگ کراوە و خەڵکەکە سەردانیان کردووە، ئەویش دەرمانی پێداون، بە هۆی ئاووهەوای پاکی لادێ و جووڵان و ئیشکردنەوە، خەڵکی لادێ لە چاو دانیشتوانی شاردا لەشساغتر بوونە، دەرمانی ئەو سەردەمەی بنکە

تەندروستییەکان بریتی بوون لە حەپی کنیکی (سەلفاتە یاخود سلپاتە)یان پێگوتووە، زۆر تاڵ بووە، ئەمە دژی لەرزوتا (مەلاریا) بوو، کە ئەو کاتە نەخۆشییەکی تەشەنەنەکردوو بوو، بۆ پاککردنەوەی برین ئەسپرتۆ و تانتریۆد (مەحلوولی یۆد) بەکار هێنراون[٣٣].

شارێکی گەورەی وەکو سلێمانی لە ساڵی (١٩٢٨) تەنها دکتۆرێکی تایبەتی هەبووە، لە توانای کەم کەسدا بووە بتوانێت بۆ چارەسەرکردن سەردانی عەیادەکەی بکات، لەکاتێکدا بۆ تەنها دەرزی لێدانێك (٢) ڕوپیەیان وەرگرتووە، جگە لە پارەی پشکنین و دەرمان و پێداویستییەکانی تری چارەسەر، ئەو دکتۆرانەش کە عیادەیان داناوە ئەوا خۆیان بە پسپۆری دەیان نەخۆشی لەقەڵەم داوە، ئەمە لایەنێکی بەرچاوی ئەو ڕیکلامەیە کە ڕۆژنامەی (ژیان) بۆ (دکتۆر میرزا ئەمیر) ناوێکی کردووە، کە ڕەنگە بە ڕەچەڵەك ئێرانی بێت، تێیدا ئەڵێت: "هەموو جۆرە نەخۆشییەك چارەسەر دەکات، داخلی، نسائی، منالێ، جلدیە، مجاری بول، نەخۆشی چاو، دەرهێنانی بەردی گورچیلە و مایەسیری عیلاج دەکات بەبێ عەمەلیاتی جەراحیە ئەمە فرسەتێکی گەورەیە و لەدەست خۆتانی مەدەن"[٣٤]، ئەگەر تەماشای تەبەڵەی ڕۆژ بەڕۆژی نەخۆشخانەکە بکەین. ڕۆژی ٣٠٠ تا ٤٠٠ نەخۆش چارەسەر کراوە، ئەمەش لەماوەی ٣ کاتژمێردا ئەو کەسانە هەر ئەوەندەی بەر دەکەوی لێی بپرسی ناوت چییە، لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە لەسایەی ئەو ڕەوشەدا شتێك نەبووە ناوی خزمەتگوزاریی تەندروستی بێت و سوودی بۆ هەموویان هەبێت[٣٥]. لە بەڵگەنامەیەکی هەواڵگری بەریتانی بەشی عێراق بە ژمارە (F.O370-671) لە (١٠-٤-١٩٣٩) کە لەئەنجامی باش چارەسەرنەکردنی نەخۆشەکان بووەتە هۆی مردنی نەخۆشێك و سکاڵا لەدژی دکتۆر (مالیك) لە دادگای سلێمانی تۆمار کراوە[٣٦]. بەڵام سەیر لەوەدایە وێڕای دەیان داواکاری و نووسین و سکاڵا هەست بەهیچ ئاوڕدانەوەیەك لەلایەن حکومەتی عێراقەوە نەکراوە، ئەگەر نا چۆن دەکرێت تا ساڵانی (١٩٤٢) تەنانەت یەك دکتۆری چاو لە سلێمانیدا نەبێت[٣٧]، لە ساڵی (١٩٤٤) لەڕووی خزمەتگوزاریی تەندروستییەوە بۆ هەر (١٧) هەزار کەس تەنها یەك دکتۆر هەبووە، سلێمانی بەدرێژایی ساڵانی سییەکان تاکوتەرا دکتۆری لەلایەن میرییەوە بۆ ڕەوانە کراوە،

هیچ کات تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیش ژمارەیان لە یەك کاتدا لە (٢) دکتۆر تێپەڕ نەبوون، کە زۆریان زمانی کوردییان نەزانیوە، خەڵکی سوودی باشیان لێ نەبینیون[٣٨]. تاکو ساڵی (١٩٤٨) لە سنووری لیوای سلێمانیدا تەنها شەش پزیشك و بیست و حەوت برین پێچ هەبووە[٣٩]. لە راستیدا بەراورد بە رێژەی دانیشتوان ئەو ژمارە کەمە نەیتوانیوە بۆشایی خزمەتگوزاریی تەندروستی پڕ بکاتەوە.

تەنانەت کەمیی کارمەندی تەندروستی بە شێوەیەك بووە، رۆژنامەی (ژیان) لە یەکێك لە ژمارەکانیدا رایگەیاندووە کە نەخۆشخانەی مەلەکی پێویستی بە پەرستیارێك هەبووە، خوێندەواری هەبێت و هەندێك زمانی ئینگلیزی بزانێت و بڕی مووچەکەی (٤٠) روپیەی بۆ دەستنیشان کراوە، ئەوەی ئارەزوومەندە سەردانی نەخۆشخانەکە بکات و مەرجیشی ئەوە بووە نەدەبوو تەمەنی لە (٣٠) ساڵ زیاتر بێت[٤٠]. بارودۆخی خراپی رەوشی تەندروستی بە شێوەیەك بوو لە لیوای سلێمانیدا خزابووە ناو گفتوگۆ و داخوازییەکانی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەرانەوە، لە یەکێك لەدانیشتنەکانی ئەنجومەنی نوێنەران باس لەوە کراوە، ساڵی (١٩٤٧) قەزای پشدەر پزیشکی تێدا نەبووە، هەروەها لیوای سلێمانی پێویستی بە نەخۆشخانە هەبووە. کەمتر خەمی حکومەت لە پێشگیریکردنی نەخۆشییە درم و بەربڵاوەکان بوو، لە ساڵی (١٩٤٨) نەخۆشی مەلاریا لە ناوچەی هەڵەبجە تەشەنەی کردووە[٤١].

ئەگەر لە ژمارەی دکتۆر و کارمەندانی تەندروستی بەم شێوەیە کەموکوڕی هەبێت، بێ گومان ئاساییە لە رووی ژمارەی نەخۆشخانەش بارودۆخەکە کارەساتاوی بێ، لە ڕاستیشدا هەر وا بوو، ئەوەتا تا سەرەتای ساڵانی سییەکان هەر یەك خەستەخانە لە سلێمانیدا هەبووە، ئەویش لەخوار سەرا بووە. کە پێشتر قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەری بووە، لە یەکەم جەنگی جیهانییەوە گۆڕاوە و پاشان بە خەستەخانەی خوارەوە ناسراوە[٤٢]. تەنانەت لە ساڵی (١٩٣٤) بناغەی دروستکردنی نەخۆشخانەیەکی گەورە دانراوە کە لە ژووری نەخۆش و فەرمانبەران و دکتۆر و چوار حەمام پێکهاتووە، ئەو خەستەخانەیە بە چیمەنتۆ و

شێلمانی ئاسن دروست کرابوو[٤٣]. ساڵی (١٩٣٦) نەخۆشخانەکە کراوەتەوە، کە (٣٤) قەرەوێڵەی هەبوو، بە نەخۆشخانەی فەیسەڵی یەکەم ناسراوە[٤٤].

ئیتر تاکو ساڵی (١٩٤٤) تەنها دوو نەخۆشخانە لە شاری سلێمانیدا هەبووە[٤٥]، لە ساڵی (١٩٤٥) نەخۆشخانەکانی سنگ (صدری) و پاراستنی ساوایان کراوەتەوە، لە ساڵانی (١٩٥٤–١٩٥٥) نەخۆشخانەکانی چاودێری دایکان و منداڵان و بنکەی تەندروستی چوارباخ کراوەتەوە[٤٦]. تاکو ساڵی (١٩٤٨) شاری سلێمانی جگە لەو دوو نەخۆشخانەیە (٥) بنکەی تەندروستی تێدا هەبووە[٤٧]. لە بەر کەمیی پزیشك نەخۆشخانەکان نەیانتوانیوە بە باشی چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بکەن.

هەرچەندە حکومەت کەمتر بایەخی بە کردنەوەی بنکەی تەندروستی لە ناحیەکاندا داوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵی (١٩٥٥)دا بنکەی تەندروستی لە پێنجوێن و چوارتا و تەوێڵە و هەڵەبجە و قەرەداغ هەبوون[٤٨].

## تەوەری دووەم: خزمەتگوزاریی گشتی:

### أ- شارەوانی و پاکوخاوێنی :

خەڵکی سلێمانی بە تەنگ پاکو خاوێنییەوە بوونە، چونکە ئەم شارە هەر لە دامەزراندنیەوە ناوبانگی بە دروستکردنی سابوون دەرکردبوو، تەنانەت گەڕەکێکی شاری سلێمانی ناوی (سابوونکەران) بووە، بەرهەمی سابوونی شارەکە لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانی رەوانەی شارەکانی دیکەی کوردستان کراوە[٤٩]. دامودەزگا خزمەتگوزارییەکان هەوڵیانداوە پاکوخاوێنی رابگرن، بۆیە داوایان لە خاوەن گەرماوەکان کردووە کە دەرگای عەمبارەکانی ئاو دابخەن و حەمامچییەکان بەرهەڵستی خەڵکی بکەن، رێگا نەدەن بچنە ناو عەمباری حەمامەکانیانەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك کەس قفڵ و دەرگای عەمباری ئاوی حەمامەکانیان شکاندووە، یاخود بە دیواردا سەرکەوتوون و چوونەتە ناو عەمبارەکانەوە کە ئەوەش بۆ تەندروستی گشتی زیانبەخش بووە[٥٠].

لە لایەکی دیکەوە گۆشت فرۆشەکان بە شەو لاکی گۆشتیان لە هۆڵی ساردی حەمامەکاندا هەڵواسیوە، تاکو بۆگەن نەکات، شارەوانی بۆ پاراستنی تەندروستی گشتی ئەم کارە ناتەندروستیانەی قەدەغە کردووە. لەسەر راپۆرتی سامانی ئاژەڵی و لێژنەی تەندروستی بڕیاردراوە هیچ گۆشت فرۆشێك نابێت لە (١٢) کاتژمێر بەولاوە گۆشت بهێڵێتەوە، یاخود بە شەو لە گەرماوەکاندا هەڵیبواسن و هیچ خاوەن گەرماوێك نابێت رێگا بدات، قەسابەکان گۆشت لە گەرماوێکدا هەڵبواسێت[٥١]. لەگەڵ ئەوەشدا حکومەت چاودێری هەندێك لە پیشەوەرانی کردووە، بە تایبەت هەندێ لەو پیشانەی کە پەیوەندییان بە تەندروستییەوە هەبووە بۆ ئەم مەبەستە هەندێك جار رێنمایی تەندروستی پێداون، داوایان لێکراوە سەرپێچی نەکەن، ئەوانەش تایبەت بوون بە پاکوخاوێنی، وەك دەرکردنی رێنمایی بۆ گۆشت فرۆش و ماستاو فرۆش و شەربەت فرۆش و میوەفرۆش و چایخانە و چێشتخانەکان...هتد، بۆ ئەوەی سەری خواردنەکانیان داپۆشن[٥٢].

هاوکات پەشێویی ناو شار جێگای گرنگی پێدان بووە، راستە بازاڕ بە هۆی هاتوچۆی وڵاخ و وڵاخدارەکان و فڕێدانی لاسکی سڵق و تویکڵی هەنار و ئاغزە

جگەرە و گەڵا شێلم و... هتد، بووەتە هۆی ئەوەی کە لە کاتی باران باریندا ئاوێکی زۆر کۆ ببێتەوە و قوڕ و چڵپاوێکی زۆری دروست کردووە، بۆیە شارەوانی هەوڵی خاوێنکردنەوەی ئەو راستە بازاڕەی داوە و دووکاندارەکانی ئاگادار کردووەتەوە چاودێری پاکوخاوێنی بکەن[٥٣]. لە هاویندا بەیانیان و ئێواران کرێکارەکانی شارەوانی بە تەنەکە ئاو پەرژێنی جادەکانیان کردووە، بۆ بەتەنگەوە هاتنی خاوێنیی کووچە و کۆڵانەکانیش بەیانیان زبڵ و خاشاکیان لە ماڵان وەرگرتووە بە باری وڵاخ فڕێیان داوە[٥٤]. هەروەها هەندێك لە شیوەکان سەریان داپۆشراوە، کە پێشتر دیمەنێکی ناشیرینیان هەبووە، کاتێك سەریان داپۆشراوە بووەتە جادەیەك بۆ هاتوچۆ[٥٥]، ماڵەکان بەپێی بڕیاری شارەوانی زێرابیان بۆ خانووەکانیان دروستکردووە، خراونەتە سەر شیوی زێرابە گەورەکان بەمەش مەترسی تەشەنەکردنی نەخۆشی کەم بووەتەوە[٥٦]. لەلایەن شارەوانییەوە چاودێری نرخ و بازاڕ کراوە، هەر کەسێك سکاڵای لە دووکاندارێك هەبوایە ئەو دووکاندارە سزا دراوە، نانەواخانەکان ئەو نانەی کە دروستیان کردووە، نابێت گەنمە شامی و نۆك و جۆ تێکەڵاو نانەکانیان بکەن یاخود لە هەویری فەتیر دروستی بکەن. هەروەها نەوتی سپی لەلایەن ئەنجوومەنی شارەوانییەوە لیتری بە بیست فلس خەمڵێندراوە[٥٧].

دەربارەی خزمەتگوزاریی ئاو سەرەتا هەر گەڕەکێك لە کانی و کارێزەوە ئاویان هێناوە و چەند ماڵێك لە حەوشەکانیاندا بیری ئاویان لێدابوو[٥٨]. سەبارەت بە بارودۆخی خزمەتگوزاریی ئاو لە سلێمانیدا، کارێز هەڵکەندن و ڕاکێشانی ئاوی کارێز بە بۆڕی بۆ ماڵ و مزگەوت و گەرماو و ئاشی گەڕەك کاریگەری لەسەر رەوشی گوزەرانی خەڵکەکە هەبووە[٥٩].

ئاوڕدانەوە لە پرۆژەی ئاو لە ساڵی (١٩٢٩)دا بووە، لە کارێزەکانی (عەزیز ئاغا و حاجی بەگ) ئاویان هێناوە بۆ عەمبارێك کە لەو ساڵەدا دروستکراوە (٦٠) هەزار گالۆن ئاوی گرتووە، لە ساڵی (١٩٣٢) عەمبارێکی دیکەی ئاو دروستکراوە (٨٠) هەزار گالۆن ئاوی گرتووە، بەهۆی فراوانبوونی شار و زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانەکەیەوە، لە ساڵی (١٩٤٩) سوود لە ئاوی سەرچنار وەرگیراوە، ئەوەیش لە ڕێگای ڕاکێشانی ئاو بە بۆڕی بەدرێژایی (٢١) هەزار پێ و چوار ئینج ئەستوور

بووە، دوو عەمباری ئاو لە ئاسن کە هەریەکی (٤٠) هەزار گالۆن ئاوی گرتووە، تاکو ساڵی (١٩٥٦) بەدانانی دوو پەمپی گەورە ڕاکێشانی بە بۆڕی ئاسن کە ئەستووری (١٢) ئینج بووە، دروستکردنی دوو عەمباریش هەریەکەی (١٨٠) هەزار گالۆن ئاوی گرتووە، بۆ شارەکە فەراهەم کراوە[٦٠].

وەك لە ڕۆژنامەی (ژین)دا هاتووە: "... ئاهەنگی کردنەوەی مشروعی ئاوی شار و کۆبوونەوەی ٤٠٠ کەس لە سەرچنار قسەکردنی متصرفی لیوا و وتاری رئیس بلدیە[٦١] و کردنەوەی مشروعەکە و سەیرکردنی کاروباری تانکی ئاوی تازە..."[٦٢]، ئەمەش گەواهیدەری ئەو ڕاستییەیە کە دانیشتوانی شارەکە پەرۆشی باشتربوونی دۆخی کەم ئاوی بوونە، سەرەڕای ئەمەش دیارە دابەشکردنی ئاو بێپلانی و بێبەرنامەی پێوە دیار بووە، بۆیە وتارێك لە ڕۆژنامەی ژین نووسراوە جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە دەبێت حکومەت بزانێت عەمباری ئاو لە کوێ دروست بکات، چۆن سوود لە ئاوی کارێزەکان وەربگرێت[٦٣]، هەروەها دانیشتوانی شار لە هەندێ شوێن گلەیی و گازندەیان هەبووە، لەبەر ئەوەی هێشتا خەڵکی کار دەکەن. بەڵام کارمەندانی شارەوانی ئاو دەگرنەوە، بۆیە داوایانکردووە بەرلەوەی شارەوانی ئاویان لەسەر بگرێتەوە ئاگادار بکرێنەوە[٦٤]، هەروەها لە ساڵی (١٩٤٨) بەهۆی وشکە ساڵی و خراپی خزمەتگوزاریی سلێمانییەوە خەڵکی دووچاری تەنگوچەڵەمەی کەم ئاوی بوونە و ئۆباڵەکەیان خستووەتە سەر فەرمانگەی ئاو و کارەبا[٦٥]. سەرباری ئەوەش دانیشتوانی شار بێباك بوون لە بەهەدەردانی ئاودا، بۆیە لە ڕۆژنامەکاندا بانگەواز کراوە کە باخچەی ماڵەکان بەئاوی کارێزەکان ئاو بدرێن نەك ئاوی پاکی خواردنەوە بۆ ئەو مەبەستە بەکار بهێنن[٦٦].

پرۆژەی ئاو بۆ قەزاکانی تریش فەراهەم کراوە، بۆ نموونە لە قەزای هەڵەبجە لە ساڵی (١٩٢٩) پرۆژەی ئاوی (حوشتر گەڵوو) بە هەرەوەز و بە بڕیاری سەرۆك شارەوانی و بریتانییەکان و لەلایەن خەڵکەوە دروستکراوە و لە سەرچاوەی گوندی (بامۆك)ەوە ڕایان کێشاوە تا مزگەوتی (جامیعە) لەناو شاری هەڵەبجەدا، ئەمەش بووەتە مایەی زیاتر ئاوەدانکردنەوە[٦٧]، بەڵام یەکەم جار لە ساڵی (١٩٣٤) ئاوی بەلووعە بۆ ماڵانی شاری هەڵەبجە ڕاکێشراوە[٦٨].

لەبەر ئـەوەی تـاکو دوای هـاتنی بریتانییـەکان هێشـتا کارەبـا لـە سـلێمانیدا نەبووە، شەوانە بۆ ڕووناککردنەوەی شەقامەکان چرای نەوتیان داگیرساندووە[٦٩]. کاتێك مێجەر (سۆن)[٧٠] حوکمڕانی سلێمانی بوو بڕیاری دابوو ئەگـەر هـەر کەسـێك شەوان لە ماڵ بچووایەتە دەرەوە دەبووایە چرایەکی لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرتایە، لـە دوای ئـــەوەش بـــۆ ڕوونـــاکی شـــەقام و کۆڵانـــەکان لـــەمپایان خســـتووەتە نـــاو جامخانەیەکی شووشەوە هەڵیانواسیوە و چەند کارمەندێکی شارەوانی بۆ تـەرخان کرابـوو، تـاکو نـەوتی تێبکـەن و بلوورەکانیـان خـاوێن بکەنـەوە و بـە ئێـواران دایبگیرسـێنن و بـەیانیان بیکوژێننـەوە، لـە سـاڵی (١٩٢٩) موەلیـدەی کارەبـا (ئەلکتریك) دانراوە، ئەو کاتە کۆڵەکەی (ستوون) گڵۆپی شـەقامەکانی شـار لـە دار بـووە، دوو موەلیـدەی (٥٠) کیلۆواتیـان لـە جـۆری (دی سـی) لـە شـوێن بـاخی پوورەبەگی لە گەڕەکی گوێژە دامەزراند[٧١]، تاکو ساڵی (١٩٣٦) ئەو دوو موەلیدە کاریـــان کـــردووە، یەکـــەمیان بـــە هەڵەبجـــە فرۆشـــراوە و موەلیدەیـــەکی (١٠٠) کیلۆواتیان لە جێگاکەی بەکار هێناوە، لەنێوان (١٩٤١–١٩٥٣) چوار موەلیدەی تر دانرا، بەهەموویان (٥٢٥) کیلۆوات کارەبایـان داوە، ئەمـەش تـاکو سـاڵی (١٩٥٧) بەو شێوەیە بوو، بەڵام لەم ساڵەدا شێوازی کارەبای (ئەی سی) بـەکارهێنراوە[٧٢]. لە ساڵی (١٩٥٥) ژمارەی ئەوانەی لە سلێمانی کارەبایان ڕاکێشاوە (٢٥٤٨) شوێن بووە، کە (٤٢٠) شوێنی فەرمانگـە و دووکـان بـووە، ئـەوانی تـر کـە (٢١٢٨) هێـڵ بووە بۆ ماڵەکان ڕاکێشراون[٧٣]، بۆ ڕووناکی شەقام و کۆڵانەکانی ناو شار لـە هـەر گەڕەکێك ماڵێك بەنۆبە گڵۆپێکی تاکو بەیانی نەکوژاوەتەوە، ناو بازاڕیش شەو بـێ ڕوونـاکی بـووە[٧٤]. ئـەم کارەبایـەی کـە هـەبووە لـە هـەموو شـوێنێك بەتـەواوی ڕێکنەخراوە[٧٥]. هەندێك شوێن کارەبای هـەبووە، هەنـدێك شـوێنیش لێـی بێبـەش بوونە.

ساڵ لە دوای ساڵ خەڵکی خواستی کارەبایـان زۆرتـر بـووە. کارەبـا بـەهۆی ئەوەی کە بە هێزی موەلیدە کاری کردووە، لە مانگی تشرینی یەکەم تـاکو هـاتنی وەرزی گەرما بەڕۆژ کـاری پێنـەکراوە، موەلیـدە لـە نـاو شـاردا بـووە، تەقەتـەقی خـەڵکی هەراسـان کـردووە[٧٦]. وەك لـە ڕۆژنامـەی (ژیـن)دا هـاتووە هـەر بـۆ ئـەم

مەبەستە سەرۆکی شارەوانی لە وتەیەکدا بەڵێنی ئەوەی داوە کە کارەبا بۆ هەموو ماڵێك دەچێت، بەڵام بۆ رێکخستنی کاتی دەوێت[٧٧].

لە دەرەوەی شاری سلێمانیش و بە تایبەت بۆ شاری هەڵەبجە لە پێش هاتنی کارەبا بۆ ئەم شارە (چرای لەمپا)ی کۆڵانەکان هەبووە، کە بەینی هەر دوو چرا (٢٥) مەتر، ستوونێکی دار قایم کرابوو، ئێواران لەگەڵ خۆرئاوابووندا چراکان داگیرسێندراون، بەیانیان لەگەڵ بانگی بەیانیدا کوژێنراوەتەوە، بەڵام کارەبا لە ساڵی (١٩٤٠) هەڵەبجەی رووناك کردووەتەوە[٧٨].

ئەم حزمەتگوزارییانە بە گوندەکان نەگەیشتوون، بەهۆی کەمیی خواردەمەنی و نەبوونی پاك و خاوێنییەوە و نەخوێندەواری و خورافات لە هەندێ دێهاتیشدا بێ ئاوی و کەمیی دەرمان و زۆریی نەخۆشی بارێکی گرانی سەر شانی دانیشتوانەکە بووە[٧٩].

دیارە کەموکوڕی لە خزمەتگوزارییەکانی شارەوانی هەبووە. بۆیە دەبینین داکۆکی رۆژنامەکان لەو سەردەمەدا بریتی بووە لە کۆمەڵێك پێداویستی بۆ لیوای سلێمانی، لەوانە بوونی سەربڕخانەیەك بۆ شارەکە بەپێویستییەکی گرنگی ئەو سەردەم دانراوە، کە بە شێوەیەکی هاوچەرخ لەلایەکی شار دروست بکرێت، بۆ پاککردنەوەی شار رێژەی تیمەکانی پاککەرەوەی ناو شاریش زیاد بکرێن[٨٠]، هەروەها گلەیی لە شارەوانی لیواکە کراوە، هەندێ شەقامی بۆ ئۆتۆمبێل دروستکردووە. بەڵام بەشێوەیەکی رێك و جوان نەبووە، بەڵکو لەسەر رێگە پێچ و پەناکانی کۆن دروستکراوە، شەقامەکانی ناو گەڕەك و کووچە و کۆڵانەکانیش قیرتاو نەکراون، رێگاکانی دەرەوەی شاریش بە تایبەت رێگەی نێوان هەڵەبجە و سلێمانی پڕ لە کەند و چاڵ بووە، شەقامی کەرکوکیش کە بەپێی ئەوەی بەرپرسانی حکومەتی پێیدا تێپەڕیون زۆر گرنگی پێدراوە کەچی سەرباری ئەوەش دوو پێچی گەورەی تێدا بووە[٨١]، جگە لەوەی شەقامەکە لە رووی ئاسایشەوە سەلامەت نەبووە، بەڕۆژ لەبەر جەردە و شەویش لەبەر دز، مرۆڤ نەیتوانیوە بەئاسوودەیی پێیدا بڕوات، لەبارەی زۆری مەترسییەکانی ئەم رێگایە هاتووە"... ام رێ ی کرکوك و سلیمانیە ئەگەر هەلی کۆلن لە هەر بستیکا خوێنی ریبوارێکی لێ

دەردەکەوێ..."[٨٢]. ئەمەش بەڵگەی ئەو راستییەیە کە ئاسایشی هاتوچۆ لە ڕێگاوبانەکەدا دەستەبەر نەبووە.

هەر لەماوەی سالانی جەنگی دووەمی جیهانیدا (١٩٣٩–١٩٤٥)، مێرووی (سن) پەیدا بوو کە ئافاتێك بوو دەغڵ و شینایی بەسەوزی خواردووە، وێڕای کوللە لەناوبردنی ئەم ئافاتە زۆر ستەم بوو، بۆیە بەروبوومی دەغڵودان بەردەوام ڕووی لە کزی کردووە، خەڵك لە بری جام و پەرداخی ئاو خورادنەوە بوتڵی شووشەی لەناو قەدا بڕیوەتەوە و بەکاری هێناوە، هەندێك شت پەیدا بوو پێشتر بە خەیاڵی کەسدا نەهاتووە، وەك پێلاوی جاشکەوش و بنەکەی لاستیکی تایە و سەرەکەی چەرمی (گا) تێگیرا بوو، لەبەر بێ قوماشی گوێنی لەبەر کراوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵوێستی بەشێك لە بازرگانەکانیش یارمەتییەکی باشی بووژانەوەی ئابووری خەڵکی سلێمانییان داوە، ئەویش بەهێنانی گەنم لە ئێرانەوە کە بۆ ماوەیەك گەنمەشامیش دەست نەکەوتووە، نانی بەڕوویان خواردووە[٨٣].

لەگەڵ گرانبوونی نرخی کالا و خواردەمەنییەکان خەڵووز لە سلێمانییەوە ڕەوانەی شارەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق کراوە، لە شارەکەدا بووەتە هۆی گرانبوونی خەڵووز، (ژین) کە ڕۆژنامەی ئەو سەردەمە بوو سەرکۆنەی بازرگانەکانی کردووە، ئەوان لەبەر بەرژەوەندی خۆیان قۆرخکارییان کردووە، گرانیی خەڵووز بەشێوەیەك بوو هەژار و کەم دەرامەت توانای کڕینیان نەبووە، بەهۆی ساردیی زستان و زۆر بارینی بەفرەوە لە سلێمانی هەژاران پێویستییان بە دار و خەڵووز بووە، کە بەشێك لە مندالانی هەژاران لە سەرما ڕەق بوونەتەوە. بۆ باشترکردنی بارودۆخی ئازووقە و ڕێگریکردن لە فرۆشتنی خۆراك و خەڵووز لە سلێمانی بۆ شارەکانی تر لە ساڵی (١٩٤٢) خۆپیشاندانێك سازدرا[٨٤]. بەشێك لە ناڕەزایی دانیشتوان لە هەمبەر گرانی و بێدەرامەتی لەم سەردەمەدا بووە.

بەمەرامی باشترکردنی ڕەوشی گوزەرانی دانیشتوانی لیواکە حکومەت ڕایگەیاند هەر کەس دووپشك بکوژێ و چزووەکەی (کلکەی) بێنی بۆ ناحیەی تانجەرۆ بۆ هەر یەکێك (١٠) فلسی ئەدرێتێ، خەڵکەکە کەوتنە دووپشك کوشتن بە ڕاستی بنبڕیان کرد[٨٥].

لە چلەکانی سەدەی بیستدا لە سنووری تانجەرۆدا بەراز یەکجار زۆر بوو کە زیانی زۆری بەمەرەزە گەیاندووە، ئەمە حکومەتی ناچار کرد چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە، بە خەڵکیان ڕاگەیاندبوو، ئەوی بەرازێك بکوژێ و گوێچکەکانی ببڕێت و بۆ ناوەندی ناحیە بیهێنێت (٢٥٠) فلسی پێدەدرێت. ئیتر دانیشتوانی ناوچەکە کەوتنە بەراز کوشتن، بەو جۆرە بەرازیان لە ناوچەکە قڕ کردووە[٨٦].

**ب- کارگێڕیی خۆجێییەتی:**

هەر لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا چەندین دامودەزگای خزمەتگوزاری لە لیوای سلێمانی دامەزراون لەوانە فەرمانگەکانی (تاپۆ (املاك همایون دائرەسی)، دفتر خاقانی دائرەسی، فەرمانگەی نفوس، فەرمانگەی باج (ویرکو دائرەسی)، شارەوانی، فەرمانگەی دادوەری، دەزگای پۆلیس (الضبطیة)...هتد)[٨٧].

لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە لە سەردەمی حوکمڕانیی بریتانییەکان و سەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودا ئەو دامودەزگایانەی لە کار کەوتبوون دووبارە ڕێکخرانەوە، بەڵام لە سەردەمی حوکمڕانیی عێراقدا چەندین دامەزراوەی دیکە بۆ خزمەتکردنی دانیشتوان دامەزراوە لەوانە:

لە ساڵی (١٩٢٥) یەکەم جار تەلیفۆن لەلایەن حاکمی سیاسی بریتانیاوە هێنرایە شارەوە خەڵکی بە شتێکی نامۆ و سەیر و سەمەرە تەماشایان کردووە، بەکاری شەیتان و جنۆکەیان لە قەڵەمداوە، لە ساڵی (١٩٢٦) دا دەست بەدامەزراندنی تێلەگراف و تەلیفۆن کراوە. تەنها (٢٠) ژمارەیەك بوو لەنێوان کاربەدەستاندا بەکار هاتووە، بەڵام لە ساڵانی سییەکان بووە بە(٥٠) تەلیفۆن کە دەبوایە داوایان لە کۆلۆفیس (بدالە) بکردایە بۆ وەرگرتنی تەلیفۆنی خواستراو، لە ساڵی چلەکاندا ژمارەی بەکارهاتوو (١٠٠) تەلیفۆن بووە[٨٨]. لە رووی پۆستە و گەیاندنەوە هەر تەنها بایەخ بەسەنتەری لیواکە نەدراوە، بەڵکو لە ساڵی (١٩٢٨)دا لە هەڵەبجە و پێنجوێن و چوارتاش دامەزرا، خەتێکی تێل لە سلێمانییەوە بۆ ئەو شارانە ڕاکێشراوە. بە شێوازێکی زۆر شپرزەیی هەتا (١٩٢٩) هاتوچوونی پۆستە کراوە، لە پاش ئەوە ڕووی لە چاکی کردووە، کاتێك ئاسایش سەقامگیر بووە،

تاکو ساڵی (١٩٤٧) هەفتەی جارێك، بەڵام لە دوای ئەو ساڵەوە هەفتەی دووجار پۆستە ڕەوانە کراوە[٨٩].

بەڕێوەبەرایەتی ڕەگەزنامە و باری شارستانی لە سەرەتادا لە دوو فەرمانگە پێکهاتبوو، فەرمانگەی باری شارستانی (نفوس) بەپێی سەرچاوەکان سەرژمێری دانیشتوانی شاری سلێمانی و عێراق بەگشتی بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩٢٧)دا کراوە، کەواتە لەو کاتەوە فەرمانگەی نفوس دامەزراوەتەوە[٩٠].

لە ساڵی (١٩٣٠) چالاکییە کشتوکاڵییەکان لە ناوچەی سلێمانی بەشێوەیەکی فەرمی دەستبەکار بووە، بەناوی فەرمانبەری کشتوکاڵی (مامۆر الزراعة) بۆ یارمەتیدانی جووتیاران و دابینکردنی قڕکەر (مبید)ی مێروو و چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی ڕووەك و دابینکردنی پێداویستیی تری جووتیاران لە ناوچەکەدا. لە ساڵی (١٩٣٩) بەڕێوەبەرایەتییەك بۆ خزمەتکردنی جووتیار و گەشەکردنی کشتوکاڵ بە پێشکەشکردنی ڕێنمایی لەڕێگای فەرمانبەری کشتوکاڵییەکان لە بنکەی بەڕێوەبەرایەتی و لقەکان لە قەزا و ناحیەکان بۆ بەکارهێنانی تۆوی باش و بەکارهێنانی دەرمانی بژار و پەینی کیمیایی و دەرمانی قەڵاچۆکردنی مێروو و ئافاتە کشتوکاڵییەکان و چارەسەرکردنی گیروگرفت و کێشەکانیان دامەزراوە[٩١]. لە ساڵی (١٩٤٥)دا فەرمانگەی ڕێنمایی کشتوکاڵی (دائرة المرشد الزراعي) لە سلێمانی دامەزرا بۆ ڕێنماییکردنی لە بەکارهێنانی ئەو پێداویستیان بەشێوەیەکی دروست و زانستی، لە ساڵی (١٩٥٠) فەرمانگەی لقی کشتوکاڵی سلێمانی (الفرع الزراعي) بۆ گشت چالاکییە کشتوکاڵییەکان لە لیواکەدا دامەزرا[٩٢].

لە ساڵی (١٩٣٥) بانکی کشتوکاڵ و پیشەسازی بۆ یەکەم جار لە بەغدا بەناوی (المصرف الزراعي و الصناعي) دامەزرا، لە ساڵی (١٩٤٠) وەك بانکی پیشەسازی سەربەخۆیی وەرگرت و لە بەشی کشتوکاڵ جودا بووەتەوە، بانکی پیشەسازی هەشت لقی لە پارێزگاکانی عێراقدا هەبووە (موصل، هەولێر، سلێمانی، کەرکوك، حلە، نجف، کەربلا، بەسرە)[٩٣].

لە ساڵی (١٩٣٩) یاسای ئینحساری توتن دەرچوو، کە سەر بە وەزارەتی ئابووری بوو، بەڵام لە ساڵی (١٩٥٢) بەڕێوەبەرایەتی لە لیواکانی (سلێمانی، هەولێر، بەغدا، کەربەلا، بەسرە) کرایەوە، ئەمەش بە مەبەستی دیاریکردنی جۆری

تووتن و هاندانی جووتیاران بۆ چاندنی تووتن بوو، لە کاتی پێگەیشتنی تووتندا، بەڕێوەبەرایەتی ئینحسار لیژنەی ڕەوانەی قەزاکانی (هەڵەبجە، چوارتا، ڕانیە، قەڵادزێ) کردووە[٩٤].

بەپێی یاسای ئینحسار کڕین و خستنە بازاڕی تووتنی بۆ خۆی پاوان کردبوو، ئەو مافەشی بەخۆی دا کە بڕی بەرهەمهێنانی دیاری بکات، پرۆژە کشتوکاڵییەکەی بەکرەجۆ کە لە ساڵی (١٩٣٣) دروستکرا، هەر لە هەمان ساڵدا (شركة الدخان الشرقية) لقێکی کۆمپانیاکەی لە سلێمانی کردەوە[٩٥]. کردنەوەی فەرمانگەی ئینحسار لە سنووری لیوای سلێمانیدا کاریگەری لەسەر زۆربوونی چاندنی تووتن هەبوو[٩٦]. کۆمپانیاکان ڕێگا پێدراو بوون تووتن بکڕن لە تووتنەوانەکان و جووتیاران. بەو مەرجەی ئەو تووتنە هەناردەی دەرەوە بکەن بۆیان نەبوو لەناوخۆ بیفرۆشنەوە[٩٧].

لە ساڵی (١٩٤٤) بەشی پۆلیسی هاتوچۆ لەناو بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی سلێمانی کرایەوە، کۆمیسەرێك سەرپەرشتی ئەو بەشەی کردووە، تاکو کۆتایی دەسەڵاتی پاشایەتی ئەو بەشە سەربەخۆیی وەرنەگرتووە[٩٨].

لە (١٩٤٤/٦/٦) کۆمپانیای باکوور بۆ بازرگانی کشتوکاڵ لە سلێمانی لقێکی کردەوە سەرمایەی (١٠٠) هەزار دیناری خستە بازاڕەوە، جگە لە دابەشکردنی هەزاران تەن جۆ و خواردن و قوماشێکی زۆر دابەشی سەر دانیشتوانی شار کراوە[٩٩].

کردنەوەی بانك لە سنووری لیوای سلێمانیدا بۆ دوای جەنگی دووەمی جیهانی دواکەوت لە ساڵی (١٩٤٥) یەکەم بانك لە شاری سلێمانیدا کراوەتەوە، بەڵام بەهۆی وەرگرتنی زیادە (سوو)وە بازرگان و سەرمایەداران سوودێکی ئەوتۆیان لێ وەرنەگرتووە[١٠٠].

بانکی خانووبەرە سەنتەری گشتی لە بەغدا لە ساڵی (١٩٤٨) دامەزراوە. بانکی خانووبەرەی سلێمانی لە ساڵی (١٩٥٥) دامەزراوە، بەڵام بانکی کشتوکاڵی هەرەوەزی کاروبارەکانی بەڕێوە بردووە، کە تەنها بریتی بوو لە لابردنی ڕەهن (فك الرهن) تا ساڵی (١٩٥٧) کە سەربەخۆیی وەرگرت و لە بانکی کشتوکاڵی جودا بووەتەوە[١٠١].

## ئەنجام

لە ئەنجامی ئەم توێژینەوەیەدا چەند ڕاستییەك دەركەوتوون لەوانە:

١- هەرچەند حكومەتی عێراق لە سەرەتای دروستبوونییەوە توانای مادیی باش نەبووە بۆ ئەوەی خزمەتگوزاریی تەواو پێشكەش بە دانیشتوانی عێراق بكات، لەگەڵ ئەوەشدا كەمتر بایەخی بە ناوچە كوردنشینەكان داوە، هاوكات دانیشتوانی سەنتەری شارەكە پاكوخاوێنییان ڕاگرتووە، بەڵام بەگشتی خەڵكی دەرەوەی شارەكان زۆر گرنگی بە پاكوخاوێنی نەداوە.

٢- نەبوونی دكتۆر و نەخۆشخانە وای كردبوو كۆمەڵێك خەڵك ئەو بۆشاییە پڕبكەنەوە ، بەڵام زۆر جار چارەسەركردنەكانیان بەشێوەی ناتەندروست بووە، بۆ چارەسەركردنی نەخۆش هیچ مەرجێكی تەندروستییان نەبووە.

٣- لە ڕووی خزمەتگوزاری وەك كردنەوەی نەخۆشخانە و بنكەی تەندروستی و چاودێریی تەندروستییەوە هەرچەندە وەكو پێویست نەبووە، بەڵام زیاتر بایەخ بە سەنتەری قەزاكانی لیواكە دراوە، ناحیە و گوندەكان پەراوێز خراون و كەمتر بایەخیان پێدراوە .

٤- بە شێوەیەكی لەسەرخۆ دامودەزگای كارگێڕی و خۆجێیی خزمەتگوزارییەكان دامەزراون و تاكو كۆتایی سەردەمی پاشایەتی وێڕای كەموكوڕییەكان توانیویانە خزمەتگوزاری پێشكەش بە هاوڵاتیان بكەن، لە دەرەوەی ناوەندی شارەكان كەمترین دامودەزگای خزمەتگوزاری تێدا بووە.

٥- هەوڵدانی حكومەت بۆ پێشگیریی ئافات و نەخۆشییە درمەكان ، ئەمەش بە مەرامی زیادبوونی بەرهەم، تاكو خەڵكی لە تەنگ و چەڵەمەی برسێتی و نەبوونی ڕزگاریان بێت.

٦- وەك دەردەكەوێ بریتانییەكان لەگەڵ هاتنیان بۆ ناوچەكە هەوڵیانداوە هەندێك خزمەتگوزاریی تەندروستی و گشتی بۆ هاوڵاتیان فەراهەم بكەن.

**پەراوێزەکان:**

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ تەها ئەحمەد ساڵح (تەها بابان)، سلێمانی، ٢٠١٣/١٢/١٦. لە ساڵی (١٩٣٤) لە شاری سلێمانی لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە شاری سلێمانی تەواو کردووە ، لە ساڵی (١٩٥٨) کۆلیجی حقوقی لە بەغدا تەواو کردووە، دوا پلەی ئەندامی دادگای تەمیزی تاوانەکان بووە، لە ساڵی (٢٠١١) خانەنشین کراوە، ئێستا لە سلێمانی دەژێت.

(٢) موعتەسەم ساڵەیی، دەوا و دەرمانی میللیی کۆنی کۆمەڵگای کوردەواری، ئاسۆی فۆلکلۆر (گۆڤار)، ژ (٤٣) ، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٦٢.

(٣) پارێزگای سلێمانی، ساڵنامەی ١٩٩٨ ی سلێمانی، ل٢٤١.

(٤) روپیە دراوێکی هیندییە، لە سەردەمی داگیرکاری بەریتانیدا بۆ جێگرتنەوەی دراوی دەوڵەتی عوسمانی هێنراوەتە عێراق و تاکو ساڵی ١٩٣٢ بەکار هاتووە، لە سەردەمی دەوڵەتی عێراقیدا بەرانبەر بە (٧٥) فلس بووە، تاکو ساڵانی دواتر ئەو زاراوەیە بەکارهاتووە. كمال مظهر احمد، الطبقة العاملة العراقية (التكوين والبدايات والتحرك)، دار الرشيد للنشر، بغداد ، ١٩٨١، ص٤٨ ، ٧٤.

(٥) پێشکەوتن (ڕۆژنامە)، ژ(١٢)، ساڵ (١)، سلێمانی، ٥ی تەموزی ١٩٢٠، ل٤.

(٦) پێشکەوتن (ڕۆژنامە)، ژ(٥١)، ساڵ (١)، سلێمانی، ١٤ی نیسانی ١٩٢١، ل٤.

(٧) مێجەر نوئێل (E.W.Noel) ناوی تەواوی (ئەدوارد چارلز ولیام نوئێل)ە، یەکێك بوو لە ئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیز، ماوەیەك بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی لە ئێران کاری کردووە و زمانی فارسی و کوردی زانیوە، لە دەورانی یەکەم حکومەتی شێخ مەحمودی حەفید لە (١ی کانوونی دووەمی ١٩١٩) لە سلێمانییەوە ڕووی کردۆتە ڕەواندوز بۆ ئەوەی ئەو ناوچەیە بخاتە ژێر حکومداری شێخ و دوای چەند هەفتەیەکی کەم گەڕایەوە، وەختێکیش ئینگلیز لە هەوڵەکانی دڕدۆنگ بوو، بڕیاری دا نەخشەی سیاسەتی خۆی لە کوردستان بگۆڕێ، بە بڕیاری (ولسن Wilson) جێگری حاکمی گشتی (مێجەر سۆن) خرایە جێگای نوئێل، لە بەهاری (١٩٢٣) جارێکی دیکە نوئێل ڕەوانەی هیندستان کرایەوە، پاش بڕانەوەی جەنگی دووەمی جیهانی گەڕایەوە بۆ بریتانیا و خانەنشین کرا . یاداشتەکانی مێجەر نوئێل لە کوردستان، و: حسێن ئەحمەد جاف و حسێن عوسمان نێرگزە جاڕ، مگبعە أوفسیت حسام، بغداد، ١٩٨٤، ل٧؛ عبدالرقیب یوسف، مێجەر نوئێل سەرنجدانێکی بارودۆخی کورد، و: سدیق ساڵح، چاپخانەی ئوفسێتی سەرکەوتن، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ١٥.

(٨) ئاکۆ عبدالكريم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢/ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٧٣.

(٩) عبدولخالد سابیر، حەکیم باشی و دەرمانگەری کوردەواری لەنێو لاپەڕە دێرینـەکانی شـاری سلێمانیدا، سلێمانی (گۆڤار)، ژ(٣٨)، ساڵی (٤)، سلێمانی، ئەیلوولی ٢٠٠٣، ل ٢٣.

(١٠) موعتەسەم ساڵەیی، س. پ، ل٦٣.

(١١) غـەفور مـیرزا کـەریم، چـەند مەلۆیـەك لـە خـەرمانی نووسـینەکانماندا، (ب.چ)، سـلێمانی، ٢٠٠١، ل ٩٦.

(١٢) عەبدولخالد سابیر، س. پ، ل ٢٤.

(١٣) عـزەت فـەتاح حەمـە صـالح، ژیـانی کۆمەڵایـەتیی هـەورامان، توێژینەوەیـەکی سۆسـیۆ ئەنترۆپۆلۆجیە، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، کۆلێژی زانسـتە مرۆڤایەتییـەکان، ٢٠٠٥، ل٨٨.

(١٤) هـ. س، ل٨٨.

(١٥) جەمال بابـان و ئـەوانی تـر، سـلێمانی شـارە گەشـاوەکەم، ب٣، چ٢، چـاپخانەی ئـاراس، هەولێر، ٢٠١٢، ل ١٧٠–١٧١.

(١٦) موعتەسەم ساڵەیی، س. پ، ل ٦٤.

(١٧) سەیفەدین سەید محەمـەد نانـەوا، هەڵەبجـە و تیشـکێك لەسـەر بنەماڵـەکانی، چـاپخانەی چوارچـرا، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٧٥.

(١٨) ئەیوب ڕۆستەم، هەورامان، بەرگی یەکەم و دووەم، چاپخانەی کۆردۆنیـا، چـاپی سـێیەم، سلێمانی، ٢٠١١، ل ٤١٨.

(١٩) ئەحمەد مەحمود عەلی (مەلا ئەحمەدی کادریان)، ناوچەی پێنجوێن لە ئاوێنەی ڕۆژگـاردا، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٠٩.

(٢٠) مەحمود کەریم ئەحمەد، کورتەیەك لە مێژووی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی سـەراوی سـوبحان ئاغای شارەزوور، چاپخانەی ئەزمر، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٢٢.

(٢١) دڵـسۆز، گومان تا چـاوم بـەزۆر لادێ و لادێیـان نەکـەوتبێ نـەمتوانیوە لـە خۆمـەوە ئـەم چەند قسانە بنووسمەوە، گەلاوێژ (گۆڤار)، ژ(٩–١٠)، ساڵی (٨)، بەغدا، ١٩٤٧، ل٤٧.

(٢٢) پێشکەوتن (ڕۆژنامە)، ژ(٢٨)، ساڵ (١)، سلێمانی، ٤ی نۆڤمبر، ١٩٢٠، ل٤.

(٢٣) پێشکەوتن (ڕۆژنامە) ژ(٩٧)، ساڵ(٢)، سلێمانی، ٢ی ئاداری ١٩٢٢، ل٤.

(٢٤) مەلا محەمەدی چروستانی یاداشتەکانی منداڵی و بەشێکی سەردەمی فەقێیـەتی مامۆسـتا مەلا محەمـەدی چروسـتانی، سـاغکردنەوەی، محەمـەدی مـەلا کـریم، چـاپخانەی حـوادث، بەغداد، ١٩٨٤، ل٣٢.

(٢٥) جەمال بابان، یاداشتەکانم ئەزموونەکانی ژیانم، چاپخانەی ڕوون، سـلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٥١؛ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢–١٩٤٥، ل٤٢– ٤٣.

(٢٦) ژیـان (رۆژنامـە)، ژ(٣٧٠)، سـلێمانی،٢٠ی تـەموزی ١٩٣٣، ل١؛ هـەروەها بڕوانـە: ئـاكۆ عەبدولكەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥/ لێكۆڵینەوەیەكی مێژوویی- سیاسـییە، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٤٢- ٤٣.

(٢٧) سەعید ناكام، بیرەوەرییەكانی سەعید ناكام ، چاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، هـەولێر، ٢٠٠٣، ل٤٢؛ ئاكۆ عەبدولكەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥، ل ٤٣.

(٢٨) شارەزوور: لەعەربەتەوە دەست پێدەكات تـا خورمـاڵ و نزیـك هەڵەبجـە بـەولاترەوە بـۆ ناحیەی وارماوا، واتا بەشێكی زۆر لـە ناحیـەی تانجـەرۆ (عەربـەت)، گشـت ناحیـەی سـەید سادق كە شارەزووری پێی ئەڵێن و بەشی دەشتایەكەی ناحیەی خورماڵ بەشێك لە ناحیەی وارماوا ئەگرێتەوە. ج. بابان، ئەم ناوانە لە چییەوە هاتوون ؟، ڕۆژی نوێ (گۆڤار)، ژ (٦)، ساڵی (٢)، بەغدا، ئەیلولی ١٩٦١، ل ٣٥.

(٢٩) محەمەد رەسووڵ هاوار، بیرەوەری، ئا : سدیق ساڵح، چاپخانەی شڤان، سـلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٧٨.

(٣٠) ژیان (رۆژنامە)، ژ(١٠٩)، ساڵی (٢)، سلێمانی، ١٢ی نیسانی ١٩٢٨، ل ١.

(٣١) الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، مجموعة الاحصـائية السـنوية العامة لسنة ١٩٥٠، مطبعة الحكومـة، بغـداد، ١٩٥٢، ص ٥٥ -٥٦ ؛ الحكومـة العراقيـة، وزارة الاقتصاد، الـدائرة الرئيسـية للاحصـاء، المجموعـة الأحصـائية السـنوية العامـة لسـنة ١٩٥٢، مطبعة الزهراء، بغداد، ١٩٥٤، ص ص ٨٨-٨٩ .

(٣٢) شاكرخصباك، العراق الشمالي، مگبعه شفيق، بغداد، ١٩٧٣، ص٢٦٦.

(٣٣) جەمال بابان، یاداشتەكانم، ل ٥٨.

(٣٤) ژیـــان (رۆژنامـــە)، ژ (١٠٩)، ســـاڵی (٢)، ســـلێمانی، ١٢ نیســـانی ١٩٢٨، ل١؛ ئـــاكۆ عەبدولكەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥، ل٤٢- ٤٣.

(٣٥) ژیان(رۆژنامە)، ژ(٣٧٠)، سلێمانی،٢٠ی تـەموزی ١٩٣٣، ل١؛ ئـاكۆ عەبدولكـەریم شـوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥، ل ٤٢.

(٣٦) بڕوانە دەقی بەڵگەكە لە: عثمان علـي، الكـورد في الوثـائق البريطانيـة، مؤسسـة موكريـاني للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠٨، ص٣١٦.

(٣٧) ژین (رۆژنامە)، ژ (٦٥٨)، سلێمانی، ١٩ی شوباتی١٩٤٢، ل٣.

(٣٨) ئاكۆ عەبدولكەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥، ل٤٠-٤١.

(٣٩) علاء الدين سجادي، قضايا الصحة في السليمانية، نزار (مجلة)، ع(١٤)، السـنة (١)، بغـداد، ٢٢ تشرين الاول ١٩٤٨، ص٨.

(٤٠) ژ(٩٧)، ساڵی (٢)، ١٧ی كانونی دووەم ١٩٢٨، ل٤.

(٤١) سالار عبدالكريم فندي الدوسكي، دور نواب السليمانية في المجلس النيـابي العراقـي ١٩٤٥–١٩٥٨، مطبعة خاني، دهوك، ٢٠٠٨، ص ص١٦٩، ١٧٠.

(٤٢) عبدالرقيب يوسف – سديق ساڵح، لە بەڵگەنامەكانی حكومەتی شـێخ مـەحمود تۆمـارێكی شارەوانی سلێمانی ١٩٢٣–١٩٢٤، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٢٥.

(٤٣) حوزنی موكریانی، شاری سلێمانی لـە سـاڵی (١٩٣٤) دا، پێداچـوونەوەی: د. كوردسـتانی موكریانی، ڕۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، ژ(١٢٠)، بەغدا، كانونی یەكـەمی ١٩٨٨، ل٣٣؛ جـەمال بابـان، سـلێمانی شـارە گەشـاوەكەم، ب٢، دەزگـای ڕۆشـنبیری و بڵاوكردنـەوەی كـوردی، بغداد، ١٩٩٨، ل١٥٠.

(٤٤) جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەكەم، ب٣، ل١٧٤.

(٤٥) ئاكۆ عەبدولكەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢–١٩٤٥، ل٤٠–٤١.

(٤٦) جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەكەم، ب٣، ل١٧٤.

(٤٧) نزار (گۆڤار)، ژ(١٤)، ساڵی (١)، بەغدا، تشرینی یەكەمی ١٩٤٨، ل١٧.

(٤٨) جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەكەم، ب٣، ل١٧٤.

(٤٩) كەمال مەزهەر ئەحمەد، كوردی سلێمانی و بەغداد لەنێوان هـەردوو جـەنگی جیهانیـدا، و: پەیڤین، پەیڤین (گۆڤار)، ژ(٩)، سلێمانی، تەموزی ٢٠٠٠، ل٢٠٨.

(٥٠) نەوشیروان مستەفا ئەمین، ژیان بەتەمەنترین ڕۆژنامەی كوردی ١٩٢٦–١٩٣٨، چـاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٣٥٤–٣٥٥.

(٥١) هـ. س، ل٣٥٤–٣٥٥.

(٥٢) ژیان(ڕۆژنامـە) ، ژ(٣٨٢)، سـلێمانی، ٢ی تشـرینی دووەمـی ١٩٣٣ ، ل٤؛ ژیان(ڕۆژنامـە)، ژ(٣٩٥)، سلێمانی،٣ی ئاداری ١٩٣٤، ل٢.

(٥٣) پێشكەوتن (ڕۆژنامە)، ژ(٣٨)، ساڵ(١)، سلێمانی، ١٣ی كانونی دووەمی ١٩٢١، ل٢.

(٥٤) جەمال بابان، سـلێمانی شـارە گەشـاوەكەم، ب٤، چـاپ و پەخشـی سـەردەم، سـلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢٠٧؛ حوزنی موكریانی، س. پ، ل٣٦.

(٥٥) ژیان (ڕۆژنامە)، ژ(٧٨)، سلێمانی، ١٨ی ئاب ١٩٢٧، ل٢.

(٥٦) كەریم زەند، تۆماری تەمەن (٦)، چاپەمەنی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١١٣.

(٥٧) نەوشیروان مستەفا ئەمین، س . پ، ل ٣٥٦.

(٥٨) مام برایم، بـەبیرەوەری مـن، سـلێمانی (گۆڤـار)، بڵاوكـراوەی شـارەوانی سـلێمانی، ژ(٢) ئابی ١٩٦٨، ل ١٤.

(٥٩) ئەكرەمی ساڵحی ڕەشە، شاری سلێمانی، پێداچوونەوە و پێشـەكی د. عیـزەدین مسـتەفا ڕەسوڵ، ب١، چ٣، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ٢٠١١ ، ل١٤٤.

(٦٠) عمـر رمـزی، پـرۆژەی ئـاوی سـلێمانی، سـلێمانی (گۆڤـار) ژ(٣)، سـلێمانی، ئـابی ١٩٦٨، ل٢٢–٢٣.

(٦١) فایق هوشیار لە (١٩٥٤/٨/٢٠– ١٩٥٦/٨/٥) سەرۆکی شارەوانی بووە.

(٦٢) ژین (رۆژنامە)، ژ (١٣٠٢)، سلێمانی،٣٠ حوزەیرانی ، ١٩٥٦، ل٢.

(٦٣) ژین (رۆژنامە)، ژ (١٣١٠)، سلێمانی، ٢٩ ی ئابی ١٩٥٦، ل١.

(٦٤) ژین (رۆژنامە)، ژ (١٣١٢)، سلێمانی، ١٢ی ئەیلولی ١٩٥٦، ل١.

(٦٥) نزار (گۆڤار)، ژ(١٤)، ساڵی (١)، بەغدا، تشرینی یەکەم ١٩٤٨، ل١٨.

(٦٦) ژین (رۆژنامە)، ژ (٨٧٨)، سلێمانی، ١٠ی ئابی ١٩٤٧، ل ٢.

(٦٧) حەکیم مەلا ساڵح، هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا، ب١، چاپخانەی چوارچرا، چ١، سلێمانی، ٢٠١١، ل٣١.

(٦٨) سەیفەدین سەید محەمەد نانەوا، س. پ، ل٥٣.

(٦٩) نەوشیروان مستەفا ئەمین، س . پ، ل ٣٥٣.

(٧٠) سۆن (Ely Banister Soane) ئەفسەری بریتانی بوو. بۆ گواستنەوەی هـەواڵی کوردسـتان بـۆ سـەرکردە بریتانییـەکان بـەجل و بـەرگی ئێرانییـەوە بـە نـاوی (مـیرزا غـولام حوسـێن شیرازی)یەوە هاتووەتە کوردستان، لە ساڵی (١٩١٧) لە شاری مەندەلی بووەتـە ئەفسـەر و دواتر گواستراوەتەوە بۆ سـلێمانی. لـە دیـارترین نووسـراوەکانی ( To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise) لە ساڵی (١٩٢٣) بە نەخۆشی (سل) مردووە. بڕوانە: ارنلـد. تـی. ویلسون، بلاد ما بین النهرین بـین ولائـین، ت: فـؤاد جمیـل، ج٢، گ٢، دار الشـؤون الپقافیـە العامە، بغداد، ١٩٩٢، ص ٣١٥.

(٧١) جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٤، ل ٢٢٢.

(٧٢) عمر رمزی، چۆن پرۆژەی کارەبا لە سلێمانی دامەزرا، سلێمانی (گۆڤار)، ژ(٢)، سـلێمانی، ئابی ١٩٦٨، ل١١–١٢.

(٧٣) جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم،ب٤، ل٢٢١، ٢٢٢.

(٧٤) علاو الدین سجادی، لە سلێمانی بەهەڵەبجەوە، گەلاوێـژ (گۆڤـار) ، ژ(٩–١٠)، سـاڵی (٨)، بەغدا، ١٩٤٧، ل٧٣.

(٧٥) ژین(رۆژنامە)، ژ (١٣١٢)،سلێمانی، ١٢ی ئەیلولی ١٩٥٦، ل٢.

(٧٦) بڕوانە: نزار (گۆڤار)، ژ(١٤)، ساڵی (١)، بەغدا، تشرینی یەکەم ١٩٤٨، ل١٩.

(٧٧) ژ(١٣٢٢)،٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٥٦، ل٣.

(٧٨) سەیفەدین سەید محەمەد نانەوا، س. پ، ل٥٣.

(٧٩) دڵـسۆز، س. پ، ل٤٣.

(٨٠) نزار (گۆڤار)، ژ(١٤)، ساڵی (١) بەغدا، ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٨، ل ١٩.
(٨١) ژین (ڕۆژنامە)، ژ (٩٠٢)، سلێمانی، ١٢ی کانونی دووەم ١٩٤٨، ل٣؛ علاو الـدین سـجادی، لە سلێمانی بەهەڵەبجەوە، ل٧٣.
(٨٢) ژین (ڕۆژنامە)، ژ (٩٧٧)، سلێمانی، ١٨ی ئابی ١٩٤٩، ل١.
(٨٣) هێرش عبدالله حمه کـریم، سـلێمانی لـە جـەنگی جیهـانی دووەمـدا ١٩٣٩– ١٩٤٥، هـەزار مێرد (گۆڤار)، ژ(١٥)، ساڵی (٤)، سلێمانی، ئاداری ٢٠٠٠، ل ١٩٢.
(٨٤) ژین (ڕۆژنامـە)، ژ(٦٥٢)، سـلێمانی، ٨ ی کـانونی دووەم ١٩٤١، ل١ ؛ ئـاکۆ عەبدولکـەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢– ١٩٤٥، ل١١٣.
(٨٥) جەمال بابان، یاداشتەکانم، ل ٣٦.
(٨٦) س، پ، ل ٣٩.
(٨٧) عبدالفتاح علـي بوتـاني، دراسـات ومباحـث في التـاريخ الكـورد والعـراق المعاصـر، مطبعـة حاجي هاشم، اربيل، ٢٠٠٧، ص٦٤–٦٥.
(٨٨) حەمە تەها یاسین، دامەزراندنی تەلەفۆن و قۆناغەکانی لە ساڵانی ١٩٢٥ وە تاکو ئێسـتا، سلێمانی (گۆڤار)، ژ(٩٧) ، سلێمانی، تشرینی دووەمی ٢٠٠٨، ل٣٥.
(٨٩) جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٢، ل١٥٠؛ حوزنی موکریانی، س. پ، ل٣٦.
(٩٠) پارێزگای سلێمانی، ساڵنامەی سلێمانی ١٩٩٩، ل٢١٣.
(٩١) پارێزگای سلێمانی ، ساڵنامەی ١٩٩٨ ی سلێمانی، ل٢٦٨.
(٩٢) پارێزگای سلێمانی، ساڵنامەی سلێمانی ١٩٩٩، ل٢٩٩.
(٩٣) هـ. س، ل٢٥٢.
(٩٤) جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٤، ل٢٢٥.
(٩٥) ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢–١٩٤٥، ل٢٢.
(٩٦) غەفور میرزا کەریم، شارەزوور لە بازنەی دوو چەرخدا، ڕۆشنبیری نوێ (گۆڤـار)، ژ(١١٧)، بەغدا، ئاداری ١٩٨٨، ل١٨١.
(٩٧) عەلی ناجی عطار، گیروگرفتی توتن، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٥٩، ل٤.
(٩٨) جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٤، ل٢٠٢.
(٩٩) هێرش عەبدوڵلا حەمەکەریم، س. پ، ل ١٩٢.
(١٠٠) بەختیار سەعید مەحمود، لیوای سلێمانی ١٩٢١–١٩٥٨، لێکۆڵینەوەیەکـە لـە بـارودۆخی ئابووری، نامەی دکتۆرا، زانکۆی کۆیە، کۆلیژی زانستە مرۆییەکان، ٢٠١٢، ل ٢١٢.
(١٠١) پارێزگای سلێمانی، ساڵنامەی ١٩٩٩ی سلێمانی، ل٢٥٥.

## سەرچاوەکان:

### ١- چاپکراوە حکومییەکان:

- الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، مجموعة الأحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٠ مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٢.
- الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، المجموعة الأحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٢، مطبعة الزهراء، بغداد، ١٩٥٤.

### ٢- کتێبی بەڵگەنامەیی:

- عبدالرقيب يوسف - سديق ساڵح، لە بەڵگەنامەکانی حکومەتی شێخ مەحمود تۆمارێکی شارەوانی سلێمانی ١٩٢٣-١٩٢٤، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- عثمان علي، الكورد في الوثائق البريطانية، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠٨.

### ٣- ڕۆژنامەکان:

پێشکەوتن (ڕۆژنامە)، ژ(١٢)، ساڵ (١)، سلێمانی، ٥ی تەموزی ١٩٢٠.
ژ(٥١)، ساڵ(١)، ١٤ی نیسانی ١٩٢١.
ژ(٢٨)، ساڵ(١)، ٤ی نۆڤمبر٤،١٩٢٠.
ژ(٩٧)، ساڵ(٢)، ٢ی ئاداری ١٩٢٢.
ژ(٣٨)، ساڵ(١)، ١٣ی کانونی دووەمی ١٩٢١.
ژیان (ڕۆژنامە)، ژ(٧٨)، ١٨ی ئاب ١٩٢٧.
ژ(٣٨٢)، ٢ی تشرینی دووەمی ١٩٣٣ .
ژ(٣٩٥)،٣ی ئاداری ١٩٣٤.
ژین (ڕۆژنامە)، ژ(٩٧)، ساڵی (٢)، سلێمانی، ١٧ی کانونی دووەم ١٩٢٨.
ژ(١٠٩)، ساڵی (٢)،١٢ی نیسانی ١٩٢٨.
ژ(٣٧٠)، ٢٠ی تەموزی ١٩٣٣.
ژ(٦٥٢)، ٨ی کانونی دووەم ١٩٤١ .
ژ(٦٥٨)، ١٩ی شوباتی١٩٤٢.
ژ(٨٧٨)، ١٠ی ئابی ١٩٤٧.
ژ(٩٠٢)، ١٢ی کانونی دووەم ١٩٤٨.
ژ(٩٧٧)، ١٨ی ئابی ١٩٤٩
ژ(١٣٠٢)، ٣٠ حوزەیرانی ، ١٩٥٦.

ژ(١٣١٠)، ٢٩ی ئابی ١٩٥٦.
ژ(١٣١٢)، ١٢ی ئەیلولی ١٩٥٦.
ژ(١٣٢٢)، ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٥٦.

**٤- یاداشت:**

- جەمال بابان، یاداشتەکانم، ئەزموونەکانی ژیانم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- سەعید ناکام، بیرەوەرییەکانی سەعید ناکام ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣.
- محەمەد ڕەسووڵ هاوار، بیرەوەری، ئا : سدیق ساڵح، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- یاداشتەکانی مەیجەر نوئێل لە کوردستان، و: حسین احمد جاف و حسین عوسمان نێرگزەجاڕی، مطبعة أوفسيت حسام، بغداد، ١٩٨٤.

**٥- نامەی زانکۆیی:**

- عزەت فتاح حمە صالح، ژیانی کۆمەڵایەتی هەورامان، توێژینەوەیەکی سۆسیۆ ئەنترۆپۆلۆجیە، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، ٢٠٠٥.

**٦- کتێب:**

**أ- بەزمانی کوردی:**

- ئاکۆ عبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- ..................، شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥/ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی- سیاسییە، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- ئەحمەد مەحمود عەلی (مەلا ئەحمەدی کادریان)، ناوچەی پێنجوێن لە ئاوێنەی ڕۆژگاردا، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە، شاری سلێمانی، پێداچوونەوە و پێشەکی د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، بەرگی یەکەم، چاپی سێیەم، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ٢٠١١.
- ئەیوب ڕۆستەم، هەورامان، بەرگی یەکەم و دووەم، چاپخانەی کۆردۆنیا، چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠١١.

– جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەرگی دووەم، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بغداد، ١٩٩٨.
– ..............، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەرگی چوارەم، چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
– جەمال بابان و ئەوانی تر، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٣، چ٢، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٢.
– حەکیم مەلا ساڵح، هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا، بەرگی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١١.
– سەیفەدین سەید محمد نانەوا، هەڵەبجە و تیشکێك لەسەر بنەماڵەکانی، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٠.
– عبدالرقیب یوسف، مێجەر نوئێل سەرنجدانێکی بارودۆخی کورد، و: سدیق ساڵح، چاپخانەی ئوفسێتی سەرکەوتن، سلیمانی، ٢٠٠١.
– غەفور میرزا کەریم، چەند مەلۆیەك لە خەرمانی نووسینەکانماندا، (ب.چ)، سلێمانی، ٢٠٠١.
– کەریم زەند، تۆماری تەمەن (٦)، چاپەمەنی روون، سلێمانی، ٢٠٠٧.
– مەلا محمدی چروستانی یاداشتەکانی مندالی و بەشێکی سەردەمی فەقێیەتی مامۆستا مەلا محمدی چروستانی، ساغکردنەوەی، محمد مەلا کریم، چاپخانەی حوادث، بەغداد، ١٩٨٤.
– مەحمود کەریم ئەحمەد، کورتەیەك لە مێژووی ئابووری و کۆمەڵایەتی سەراوی سوبحان ئاغای شارەزوور، چاپخانەی ئەزمڕ، سلێمانی، ٢٠٠١.
– نەوشیروان مستەفا ئەمین، ژیان بەتەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی ١٩٢٦–١٩٣٨، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٢.

**ب– بەزمانی عەرەبی:**

– ارنلد. تي. ويلسون، بلاد ما بين النهرين بين ولائين، ت: فؤاد جميل، ج٢، ط٢، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٢.
– سالار عبدالكريم فندي الدوسكي، دور نواب السليمانية في المجلس النيابي العراقي ١٩٤٥– ١٩٥٨، مطبعة خاني، دهوك، ٢٠٠٨.
– شاكرخصباك، العراق الشمالي، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٣.

– عبدالفتاح علي بوتاني، دراسات ومباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر، مطبعة حاجي هاشم، اربيل، ٢٠٠٧.
– كمال مظهر احمد، الطبقة العاملة العراقية (التكوين والبدايات والتحرك)، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨١.

**٧– گۆڤار:**

**أ– بەزمانی کوردی:**

– پارێزگای سلێمانی ، ساڵنامەی ١٩٩٨ ی سلێمانی.
– پارێزگای سلێمانی، ساڵنامەی سلێمانی ١٩٩٩.
– ج. بابان، ئەم ناوانە لەچییەوە هاتوون ؟، ڕۆژی نوێ (گۆڤار)، ژ (٦)، ساڵی (٢)، بەغدا، ئەیلولی ١٩٦١.
– حەمە تەها یاسین، دامەزراندنی تەلەفۆن و قۆناغەکانی لە ساڵانی ١٩٢٥ وە تاکو ئێستا، سلێمانی (گۆڤار)، ژ(٩٧) ، سلێمانی، تشرینی دووەمی ٢٠٠٨.
– حوزنی موکریانی، شاری سلێمانی لە ساڵی (١٩٣٤) دا، پێداچوونەوەی: د. کوردستانی موکریانی، ڕۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، ژ(١٢٠)، بەغدا، کانونی یەکەمی ١٩٨٨.
– دڵسۆز، گومان تا چاوم بەزۆر لادێ و لادێیان نەکەوتبێ نەمتوانیوە لە خۆمەوە ئەم چەند قسانە بنووسمەوە، گەلاوێژ(گۆڤار)، ژ(٩–١٠)، ساڵی (٨)، بەغدا، ١٩٤٧.
– عبدالخالد سابیر، حەکیم باشی و دەرمانگەری کوردەواری لەنێو لاپەڕە دێرینەکانی شاری سلێمانیدا، سلێمانی (گۆڤار)، ژ(٣٨)، ساڵی (٤)، سلێمانی، ئەیلوولی ٢٠٠٣.
– علاء الدین سجادی، لە سلێمانی بەهەڵەبجەوە، گەلاوێژ (گۆڤار) ، ژ(٩–١٠)، ساڵی (٨)، بەغدا، ١٩٤٧.
– عمر رمزی، پرۆژەی ئاوی سلێمانی، سلێمانی (گۆڤار) ژ(٣)، سلێمانی، ئابی ١٩٦٨.
– ..............، چۆن پرۆژەی کارەبا لە سلێمانی دامەزرا، سلێمانی (گۆڤار)، ژ(٢)، سلێمانی، ئابی ١٩٦٨.
– کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردی سلێمانی و بەغداد لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا، و: پەیڤین، پەیڤین (گۆڤار)، ژ(٩)، سلێمانی، تەموزی ٢٠٠٠.
– مام برایم، بەبیرەوەری من، سلێمانی (گۆڤار)، بڵاوکراوەی شارەوانی سلێمانی، ژ(٢)، سلێمانی، ئابی ١٩٦٨.

- موعتەسەم ساڵەیی، دەوا و دەرمانی میللیی کۆنی کۆمەڵگای کوردەواری، ئاسۆی فۆلکلۆر (گۆڤار)، ژ (٤٣) ، هەولێر، ٢٠٠٩.
- نزار (گۆڤار)، ژ(١٤)، ساڵی (١)، بەغدا، تشرینی یەکەم ١٩٤٨.
- هێرش عەبدوڵلا حەمەکەریم، سلێمانی لە جەنگی جیهانی دووەمدا ١٩٣٩- ١٩٤٥، هەزار مێرد (گۆڤار)، ژ(١٥)، ساڵی چوارەم، سلێمانی، ئاداری ٢٠٠٠.

**ب- بەزمانی عەرەبی:**

- علاء الدين سجادي، قضايا الصحة في السليمانية، نزار (مجلة)، ع (١٤)، السنة (١)، بغداد، ٢٢ تشرين الاول ١٩٤٨.

**٨- چاوپێکەوتن :**

- تەها ئەحمەد ساڵح (تەها بابان)، سلێمانی، ٢٠١٣/١٢/١٦.

## ملخص البحث

**الحالة الصحية والخدمية العامة للواء السليمانية مابين أعوام ( ١٩٢١- ١٩٥٨)**

ان للحياة الاجتماعية خلفية تاريخية ونتيجة للفترة الزمنية التي مرت بها ، ويهدف البحث الى تحليل ودراسة الحالة الصحية والخدمية العامة للواء السليمانية في العهد الملكي مابين أعوام ( ١٩٢١– ١٩٥٨م) ، ولابد من الاشارة الى ان لواء السليمانية في السنوات (١٩٢١–١٩٢٥) كانت خارج سلطة الدولة الملكية العراقية، حتى ان ناحية (بشدر) التابعة للواء ظل خارج سيطرة الحكومة العراقية لغاية سنة (١٩٣٨) وتحت ظروف خاصة .

وعالجت البحث الحياة الاجتماعية للواء في السنوات ( ١٩٢١– ١٩٥٨) ونود الاشارة هنا ان لواء السليمانية كانت من ضمن (١٤) الالوية العراقية التي كانت موجودة قبل سنة (١٩٢٢) وبقيت على حالها في فترة السلطة الملكية العراقية .

وجاهدت اهالي اللواء الى اصلاح الاحوال الخدمية للواء بجد ونشاط ، لكن هذا اللواء ضمن الالوية الكوردية التي اهملت بشكل رئيسي في جميع مرافق الحياة العامة ومنها الجانب الاجتماعي والخدمي من قبل السلطة الملكية العراقية آنذاك ولم يحصل الا على قدر ضئيل من الخدمات اذا ما قيست بالالوية الاخرى، ويرجع سبب ذلك الى ان معظم سكنة هذا اللواء هم من الكورد علاوة الى ان مركز اللواء كانت مدينة حيوية في الجد والنشاط وكانت تتقدم بسرعة هائلة في جميع المجالات .

وعالج البحث من الناحية التاريخية الخدمات العامة والخدمات الصحية في اللواء، وقسم البحث الى المقدمة و مبحثين وخاتمة ، تناول المبحث الأول (الحالة الصحية والمستشفيات ، ومراكز الاسعافات الاولية) وتم الاشارة الى الحالة الصحية لسكنة اللواء وعدد الاطباء وعدد المستشفيات ونسبة الامراض فيها.

وتناول المبحث الثاني (الخدمات البلدية ، والنظافة ، والادارة المحلية) .

وفي الختام آمل قد وفقت في تقديم صورة عن واقع الحياة الخدمية والصحية للواء .

# Abstract

GENERAL SERVICE AND HEALTH CONDITIONS
IN SLEMANY DISTRICT IN THE YEARS
(1921-1958)

Social life has a historical background and it is the product of the past. But this paper generally involves the kingdom period although Slemani district, in the years (1921-1925), was out of the kingdom control. Even the district of Pishdar had its own special conditions until 1938, and the central government had no control of it. Thus, the present paper can be taken as a general survey of the social life of this district in the years (1921-1958). Despite the fact that Slemani district was regarded as one of the fourteen Iraqi governments in (1922), it received the least service despite the effort of its people to develop their city and despite the majority of its population who were Kurds. Besides, as compared to the other Iraqi governments, this district was neglected form different aspects. Since the centre of this city was active, it was always in a state of constant development.

This research can be considered a historical review of the service conditions of Slemani district especially in view of general service and health condition. The study is divided into two sections; each section subsumes several topics. Section one dwells on topics like (health conditions, hospitals, surgery centers). It sheds light on health condition, number of hospitals, and percentage of sickness. Section two deals with the municipality services, sanitary conditions and residential management in the district.

Eventually, I do hope, via this paper, that I have been able to show a historical part of Slemani district, from the social aspect, at the kingdom period.

# خەسڵەتە سەرەکییەکانی کەسایەتیی تاکی کورد لە روانگەی مامۆستایانی زانکۆوە

**پ.ی .د .ئازاد عەلی ئیسماعیل**
زانکۆی کۆیە

**م .میران محەمەد صالح**
زانکۆی سۆران

**کورتە:**

کەسایەتی یەکێکە لەو بابەتە گرنگانە کە دەروونزانی بە کۆمەڵناسی و مرۆڤناسییەوە دەبەستێتەوە و یەکێکە لە بابەتە هاوبەشەکانی نێوان ئەم سێ زانستە، هەرچەندە دەروونزانی لەسەر ئاستی تاکەکەسی، لە کەسایەتی دەکۆڵێتەوە لە کاتێکدا کۆمەڵناسی لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی لەم بابەتە دەکۆڵێتەوە.

گومانی تێدا نییە کورد لە ڕووی مێژووییەوە تا ڕادەیەك لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر کراوە، بەڵام لە ڕووی دەروونی - کۆمەڵایەتی زۆر کەمتر لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە.

ئامانجی ئەم توێژینەوە زانینی خەسڵەتە سەرەکییەکانی کەسایەتیی تاکی کوردە لە ڕوانگەی مامۆستایانی زانکۆ لە هەرێمی کوردستاندا و ئایا خەسڵەتە سەرەکییەکانی کەسایەتیی کورد بە بۆچوونی مامۆستایانی زانکۆ دەگۆڕێت بە گۆڕانی، تەمەن، ڕەگەز ، پسپۆری، بڕوانامە ، شوێنی وەرگرتنی بڕوانامە؟

١٦٢ مامۆستا لە زانکۆکانی سەلاحەدین و سلێمانی و کۆیە و ڕاپەڕین و سۆران بەشدارییان کردووە لە وەڵامدانەوەی فۆرمی ڕاپرسیی توێژینەوە، کە ٨٥ خەسڵەتی کەسایەتی گرتەخۆی. تەمەنی ئەندامانی سامپڵی توێژینەوە، دەکەوێتە نێوان 24 تا 61 ساڵ، و ناوەندی تەمەن بریتی بوو لە 38 ساڵ (بە لادانی پێوەری 8.43).

ئەو خەسڵەتانەی کە ڕێژەی زیاتر لە ٧٥ % لە بەشداربووان پێیان وابوو کە بەردەوام یان زۆربەی جار لەسەر کەسایەتی کوردی جێبەجێ دەبێت، ئەمانە بوون : ڕێز لە مێوان دەگرێت (91.4% ) کاتی لا گرنگ نییە (90%)، دەیەوێت بە زووترین کات زۆرترین سەرمایە کۆبکاتەوە (87.1%) ، خۆشباوەڕە (85.2%)، خۆی واپیشان دەدات کە هەموو شت دەزانێت (82.7%)، شانازی بە شەرەف دەکات (82.1% )، هەمیشە هەست دەکات کە قوربانییە (80.2%)، بێ قەناعەتە (79.7%)، حەز لە قسە و قسەلۆك دەکات (78.4%)، حەزی لە منداڵی زۆرە (77.8%)، متمانەی بە کەسی بێگانە هەیە (77.2%)، خێرایە لە بڕیاردان (76.6%)، خۆبەکەمزانە بەرامبەر بێگانە (75.9% ).

هەروەها ئەنجامی توێژینەوەکە ئاماژە بەوە دەکات، کە هەندێ لەم خەسڵەتانە دەگۆڕێن بەپێی گۆڕاوەکانی تەمەن، ڕەگەز، پسپۆڕی، بڕوانامە و شوێنی وەرگرتنی.

## پێشەکی:

کەسایەتی یەکێك لەو بابەتە گرنگانە، کە دەروونزانی بە کۆمەڵناسی و مرۆڤناسی دەبەستێتەوە و یەکێکە لە بابەتە هاوبەشەکانی نێوان ئەم سێ زانستە، هەرچەندە دەروونزانی لەسەر ئاستی تاکەکەسی لە کەسایەتی دەکۆڵێتەوە، لە کاتێکدا کۆمەڵناسی لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی لەم بابەتە دەکۆڵێتەوە .

لە سییەکانی سەدەی ڕابردوودا، توێژەران لە بواری کولتوور و کەسایەتی، بە تایبەتی (بێنەدیکیت ومید)، هەوڵیاندا بونیادی کۆمەڵایەتی و شێوازی پەروەردەکردنی منداڵ و ڕێگا کولتوورییەکانی ژیان ببەستنەوە بە کەسایەتیی نەتەوەیی نموونەیی (Modal National Character) و شێوازە تایبەتییەکانی بەدەرکەوتنی نەخۆشییە دەروونییەکان لە نێو گرووپەکاندا .(Kirmyar, 2007)

بە بۆچوونی (کلاکهۆن و ماورەر) (Kluckhohn & Mowrer- 1944) گشت بیردۆزە زانستییەکان پێویستە ڕەچاوی لێکچوون و جیاوازییەکان بکەن. بیردۆزی کەسایەتیش پێویستە بە شێوەیەکی یەکسان و تایبەتمەندی هەر یەکێك لە کەسایەتی و ڕاستییە تێبینیکراوەکانی جۆرەکانی کەسایەتی ڕوون بکاتەوە. هێڵکارییەکی چەمکئامێز پێویستە شوێنی گونجاو بۆ پێنج گشتاندن بکاتەوە:

**یەکەم :** گشت ئادەمیزاد خاوەن چەند خەسڵەتیکی دیاریکراون، کە بەهای کۆمەڵایەتی هەیە، یان خاوەن چەند خەسڵەتێکی کەسایەتیی هاوبەشن. ئەمانە خەسڵەتی یان پێکهاتەی گشتین و بەرهەمی دیاریکەرە گشتییەکانن.

**دووەم :** ئەندامانی هەر کۆمەڵگایەك لەگەڵ یەکتردا هاوبەشن لە زۆر لە خەسڵەتەکانی کەسایەتی. ئەو خەسڵەتانە پێیان دەگوترێ خەسڵەتە یان پێکهاتە هاوبەشەکان و بەرهەمی دیاریکراوە هاوبەشەکانن.

**سێیەم :** لە ناو یەك کۆمەڵگادا، ڕەفتاری هەندێ کۆمەڵە، یان جۆرێك لە کەسەکان، جۆرێك لە جێگیری تیادا هەیە. بەهای ورووژانی کۆمەڵایەتی ئەو کەسانەی کە هەمان ڕۆڵ دەبینن، کە خەسڵەتی هاوبەشی هەیە. ئەمە پێی دەگوترێت پێکهاتەی ڕۆڵ، کە بەرهەمی دیاریکەرەکانی ڕۆڵن.

**چوارەم:** ئەندامانی هەر کۆمەڵگایەك، ئەگەرچی هەمان ڕۆڵ دەبینن، لە یەکتر جیاوازن لە ڕووی بەهای ورووژاندنی کۆمەڵایەتی. ئەم خەسڵەتانە کە تا رادەیەك تایبەتن پێیان دەڵێن خاسیەتە یان پێکهاتە تایبەتییەکان، کە بەرهەمی دیاریکەرە تایبەتییەکانن.

**پێنجەم:** هەندێ لە لەیەکچوونەکان، بێجگە لەوانەی کە لە نێوان گشت مرۆڤەکان هەن، تێبینی دەکرێن لە بەهای ورووژێنەری کۆمەڵایەتی تاکەکان لە کۆمەڵگای جیاوازدا، ئەگەرچی بەدیارکەوتنی کەسایەتی لەم جۆرە کۆمەڵگایەدا زۆر جیاواز بێت. هۆی ئەو لەیەکچوونانە ئەوەیە کە دیاریکەرە تایبەتییەکان پشت بە کۆمەڵگا نابەستن، بۆیە پێویست بە ناوێکی دیاریکراو یان ڕوونکردنەوەیەك ناکات، بۆ ئەم جۆرە لەیەکچوونانەدا. (لا ٢-٣)

## گرنگی و گرفتی توێژینەوە :

هەرچەندە کورد لە ڕووی مێژووییەوە تا ڕادەیەك لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، بەڵام لە ڕووی دەروونی ـ کۆمەڵایەتی زۆر کەمتر لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. گۆڤاری سەنتەری برایەتی تەوەرێکی تایبەت کرد بۆ کەسایەتی کوردی، بەڵام زیاتر وتاری تیادا بڵاوکراوە، نەك توێژینەوەی زانستیی مەیدانی، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە زۆربەی وتارەکان مۆرکی سیاسییان پێوە دیار بوو نەك

زانستی. بۆ نموونـە ئـازاد نەقشـبەندی (٢٠٠٢) سـاویلکەیی و دڵپـاکی، بـە سـیمای سەرەکی تاکی کورد دەزانێت، هەروەها ئاماژە بـۆ چـەند سـیمایەکی تـر دەکـات، وەك: چاوتێری، ئازایەتی، ڕێزگرتن. ئاماژەش بەوە دەدات کە ئاکاری نەتـەوەیی لە هەڵوێست و هەڵسوکەوتی کەسایەتی کوردی بەدی ناکرێ، بەڵام باس لە هەندێ خەسـڵەتی خراپـی ئـەم کەسـایەتییە دەکـات و بـەم شـێوەیە وەسـفی دەکـا: "کەسایەتی تاکی کوردی پڕ لە کـەموکوڕی، لاوازی، بـێ هەڵوێسـتی، هەلپەرسـتی، دووڕوویی، زوو لەخۆگۆڕان، بێگانەپەرستی و خۆبەزلزانین بەرامبەر خەڵکی هەژار و هاوزمان... ئەمڕۆ لای تاکی کورد بەرژەوەندییە گشتی و نەتەوایەتییەکان دەکرێنە قوربانیی بەرژەوەندییە تایبەتییە ناڕەواکان "(لا ٢٢٩).

گرنگیی ئەم توێژینەوەیە لەوەدایە کە ڕا و بۆچوونی مامۆسـتایانی زانکۆکـان وەردەگرێت سەبارەت بە خەسڵەت و سیما سەرەکییەکانی کەسایەتی کوردی.

شایەنی باسە لێکۆڵینەوە دەربارەی کەسایەتیی هەر میللەتێك لـە میللـەتان، گرنگییـەکی تایبـەتی و بەرچـاوی هەیـە لـە بـواری کۆمەڵناسـی و دەروونزانـی و مرۆڤناسیدا، بەڵام کاتێك توێژینەوە لەسەر کەسایەتی میللەتێك کە بە دەگمەن بـە شێوەیەکی زانستی تۆکمە، لێکۆڵینەوەی لەسەر کرابێـت، وەك کـورد، گرنگییـەکی زیاتر بەم جـۆرە توێژینەوەیـە دەدات. وێـڕای کـەمی یـان دەگمـەنی لێکۆڵینـەوەی زانسـتی لەسـەر کـورد، مێـژووی پـڕ کارەسـات و مەینـەتی ئـەو میللەتـە، کـە بـە دەگمەن میللـەتێك لـە مێـژووی هاوچـەرخدا پێیـدا تێپـەڕیوە، هەڵبەتـە کاریگـەری ڕیشەیی لەسەر کەسایەتی ئەم میللەتە جێهێشتووە، گرنگی ئەم جۆرە توێژینـەوە زیاتر دەکات.

خـاڵێکی تـر گرنگـی زیـاتر بـەم بابەتـە دەدات، ئەنـدامانی سـامپڵی توێژینەوەکەیـە. ئـەم توێژینەوەیـە لەسـەر توێـژێك ئەنجامـدراوە، کـە لـە ڕووی خوێندەواری و ڕۆشنبیریدا، چاوەڕوان دەکرێت کـە لـە بـەرزترین ئاسـتی زانسـتیدا بن، بە حوکمی ئەوەی بەرزترین بڕوانامەی زانستییان بەدەسـتهێناوە و لـە یـەکێك لە باڵاترین دامودەزگاکانی خوێندنی باڵا کار دەکەن، مەبەست زانکۆکانـە، کـە بـە مەڵبەندی زانست و زانیاری دادەنرێن و چاوەڕوان دەکرێ دەرچووانی ئەم دەزگایە ببنە سەرکردەی دواڕۆژ لە گشت بوارەکاندا.

- **توێژینەوەكانی پێشوو:**

زۆربەی هەرە زۆری ئەو توێژینەوانەی لەسەر كەسایەتیی كورد كراون، زیاتر بەرهەمی تێبینی و لێكدانەوەی رۆژهەڵاتناسەكانە، كە سەردانی كوردستانیان كردووە و لەگەڵ كورد هەڵسوكەوتیان كردووە. بۆیە ئەم تێبینییانە كەسین و بە رێبازێكی زانستییانە لێكدانەوەیان بۆ نەكراوە و لەوانەیە لە سنوورێكی تەسكدا دروست بن، بەڵام زەحمەتە گشتاندنیان بۆ بكرێت.

(ئێدوارد نۆێل) لە ساڵی 1920 توێژینەوەیەكی لەسەر خەسڵەتەكانی كورد لە رێی وردبوونەوە لە پەند و قسە باوەكان لە كۆمەڵگای كوردیدا بڵاوكردەوە. نۆێل دەڵێت: كورد رەگەزێكی شاخاوییە و گشت خەسڵەتەكانی نیشتەجێی شاخەكانی تیادایە، وەك عەشقی ئازادی، سۆزێكی توند، و هەستێكی خێڵئامێزی بە شانازیكردن. بە رای ئەو، ئەم خەسڵەتانە وایان لە كورد كردووە پەنا بباتە بەر چەك، كاتێك كەمێك دەورووژێنرێت و بەگوڕ تووشی دوژمنارییەكی خوێناوی تاڵ دێت. هەروەها نۆێل بڕوای وایە كە كورد كەسایەتییەكی توندی هەیە (بە زمانی ئینگلیزی وشەی hardی بەكارهێناوە) ئەمەش لەبەر دوو هۆ: یەكەمیان سروشتی جوگرافی ناوچەكەیان و مێژووی ململانێ لەگەڵ داگیركەر. ئەم خەسڵەتانە، توندی، بۆتە هۆی ئەوەی كورد خەسڵەتی سەربەخۆییەكی مەزن و گۆشەگیری پێ بدرێت. نۆێل بڕوای وایە كە ئەزموونی درێژی كورد وەك نەتەوەیەكی ژێردەستەی حكومەتی بیانی دڕندە، بۆتە دروستكردنی هەستێكی لەم جۆرە: باشترە پارە لە دەستت بێت و گوێ نەدات بە دەنگی مۆسیقای دەهۆڵێكی دوور. وەك هەموو نەتەوەیەكی شاخاوی، كورد خەسڵەتی سەخاوەت و رێزگرتن لە میوانی هەیە . (Noel,1920)

لە توێژینەوەكەی لەسەر بنەما دەروونی و كۆمەڵایەتییەكانی خێڵە كوردییەكان، (هاشم تەها ئاكرەیی) بێ رێكەوت (ئاماژە بە چەند خەسڵەتێكی كەسایەتی كوردی دەكات. سەرەكیترین ئەم خەسڵەتانە بریتین لە ئارەزووی دەستبەسەرداگرتن، ئارەزووی ملكەچی، ئارەزووی سەربەخۆیی و ئازادی، ئارەزووی شەڕوشۆڕ، ئارەزووی سەرپێچیكردن، خەسڵەتی تموح (لا :٣٠-٤٢).

(میهرداد ئیزادی) (Izady,1992) پێیوایە خەسڵەتی نەتەوەیی کورد لە چەمکی پاڵەوان کورت دەبێتەوە. لە ژێر ئەم چەمکەدا، ئیزادی ئاماژە بە چەند خەسڵەتێکی سەرەکی کورد دەکات، کە دەشێ لەم خاڵانەدا کورت بکرێنەوە:

1– هەرچەندە کورد بە گومانە لە کەسانی بیانی، بەڵام بە خێرایی بڕوایان پێ دەکات.

2– کورد توانای کار و پلاندانانی بە گرووپی نییە و هۆیەکەشی بە بۆچوونی ئیزادی، ناوچە جوگرافییەکەیەتی.

3– کورد وریایە و ئاگاداری وردەکارییەکانە.

4– ئامادەیە قوربانی بدات بۆ کەسێك بکەوێتە بەر دڵی.

5– کورد ڕۆمانسین و لە خۆشەویستیدا زێدەڕۆن.

6– کورد لەگەڵ مێواندا بە سەخاوەتن.

7– شەرەف لەلایان (honor)، لە ژیان گرنگترە .

8– پشت بەخۆبەستن و شانازیکردن بە سەروەت و سامان.

9– هەرچەندە کورد دەرهەق ئایین دەمارگیرن (fanatic)، ئایندارى لە نێوانیاندا دەگمەنە. لا:١٨٦-١٨٨

(ئەحمەد عەبدولعەزیز مەحموود) ٢٠١٠: لا (٨٠–٩٢) بەپێی سیستەمی ئیکۆلۆجی، چەند خەسڵەتێکی کەسایەتی کوردی دەستنیشان دەکات، و بە پشتبەستن بە نووسراوەکانی هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناساندا، وەك: کورد توانای خۆگونجاندنی نییە لەگەڵ میللەتەکانی دەوروبەری، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە گۆشەگیرە، کەسایەتییەکی هەڵچووناوییە لە دۆستی و دوژمنایەتی توندڕەوە، پیشاندانی هێزی لە ڕێی چەك و حەزکردن لە جەنگ.

لە توێژینەوەکەی لەسەر کەسایەتی کوردی، ئاسۆ ئیبراهیم عەبدوڵلا (٢٠٠٣ : لا:١٥٦) ئاماژە بەوە دەکات کە بەشداربووانی ڕاپرسییەکەی، ژمارەیان ٣٠٠ کەس بوو، بڕوایان وابوو، کە ئەم خەسڵەتانە لە کەسایەتی کوردیدا هەیە:

| | خەسڵەتەکانی کەسایەتی کوردی | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| ١ | ئازایەتی و جوامێری | %٥٩ |
| ٢ | قوربانیدان | %٤٨ |
| ٣ | بەردەوام روو لە باشتر دەکات | %٤١ |
| ٤ | حەزکردن بە زانین | %٣٤ |
| ٥ | راشکاوی و روونی لە دەربڕینی را | %٣٢ |
| ٦ | رەچاوی دادپەروەری دەکات | %٢٤ |
| ٧ | هەستی ناسکە | %١٥ |

ئەوەی جێی سەرنجە کە بێجگە لە خەسڵەتی ئازایەتی و جوامێری، هیچ لە خەسڵەتەکانی تر زیاتر لە نیوەی ڕای ئەندامانی نموونەی توێژینەوەکەی بە دەست نەهێناوە ! واتە زۆربەی بەشداربووان ڕایان وابوو خەسڵەتی قوربانیدان بەردەوام هەوڵدان بۆ باشتر و حەزکردن بە زانین و ڕاشکاوی لە دەربڕینی ڕا و دادپەروەری و هەست ناسکی لە کەسایەتی کوردی کەمە !

لە توێژینەوەکەی لەسەر خێزانی کوردی، عالیە فەرەج مستەفا (٢٠٠٥) ئاماژە بە بۆچوونی چەند توێژەرێك سەبارەت بە کەسایەتی کوردی دەکات بێ ئەوەی هیچ سەرنجێکی لەسەریان هەبێت، کە هەندێك لەم بۆچوونانە زۆر سەیرن، بۆ نموونە باس لە بۆچوونی (ویگرام) دەکات کە دەڵێت: سروشتی کەسایەتی کوردی لە ١٠٠٠ ساڵ پێش لە دایکبوونی عیسا، سەلامی خوای لێ بێت، تا ئێستا نەگۆڕاوە ! باشە ئەگەر کەسایەتی کوردی بەردیش بووایە، دەبوایە بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانێکی بەسەردا هاتبایە!

نەجلا عەلی ئەکبەر (٢٠٠٦) لە توێژینەوەی لەسەر بیرۆکە کۆمەڵایەتییەکان لە کتێبی شەرەفخانی بەدلیسی، بۆچوونی شەرەفخان لەسەر کەسایەتی خێڵی کوردی بەم شێوەیە کورت دەکاتەوە": شەرەفخان ئاماژە بە ژمارەیەکی زۆر لە خەسڵەتی باش و خراپی کەسایەتی خێڵی کوردی دەکات و لە خەسڵەتە باشەکان: ئازایەتی، گەرموگوڕی (حماست)، سەخاوەت، بەغیرەتی، خۆپەسندکردن، دینداری و هاریکاریکردن. لەبەرامبەر ئەوەشدا، ئاماژەی بە چەند خەسڵەتێکی

خراپیش کردووە وەك ڕێزگرتن لە ڕێگری و تێکدان و بەپیرۆز تەماشاکردنی هێز بە هەموو شێوەکانی "(لا :٩٢). لە شوێنێکی تری توێژینەوەکە ئاماژە بە چەند خەسڵەتێکی تر دەکات وەك: ئارەزووی سەربەخۆیی و ئازادی، و ئارەزووی هەڵگەڕانەوە (تمرد)، و دڵسۆزی (لا :٩٣). بە ڕەچاوکردنی سیاقی مێژوویی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی، نزیکەی پێنج سەدە پێش ئێستا، کە شەرەفخانی بەدلیسی کتێبەکەی نووسیوە، دەکرێ باشتر لەهەندێ لەم خەسڵەتە خراپانە تێبگەین، کە ئاماژەیانی پێداوە. بۆ نموونە لە کاتی نەبوونی هێزێکی دەوڵەت، کە یاسا و ئاسایش هاوڵاتیان بپارێزێت، شتێکی ئاساییە کە ڕێگری گرتن و بەپیرۆز تەماشاکردنی هێز ببێتە خەسڵەتێکی ئەو کۆمەڵگایە.

توێژینەوەی فێنك ئەمجەد حەسەن (٢٠٠٩) هەوڵێکە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر چەشنە بڵاوەکانی کەسایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا، بە پێی مۆدێلی (ئەنگرام) کەسایەتی بۆ نۆ چەشن دابەش دەکات. ئەنجامی توێژینەوەکە دەری خست، کە چەشنەکانی کەسایەتی بەم شێوەی خوارەوە بوو لە نێو ٨٠٠ کەسدا:

| | چەشنی کەسایەتی | ناوەندی گشتی |
|---|---|---|
| ١ | بەرەنگارکار | ٧٢,٢٢ |
| ٢ | ئاشتیخواز | ٣٨.٢٢ |
| ٣ | یارمەتیدەر | ٠٣,٢٢ |
| ٤ | بەرهەمهێنەر | ٨٩,٢١ |
| ٥ | بە پەرۆش | ٥١,٢١ |
| ٦ | چاکساز | ٤٤,٢١ |
| ٧ | دڵسۆز | ٨٩.٢٠ |
| ٨ | بێ وێنە | ٩٣,١٩ |
| ٩ | توێژەر | ٣٢.١٩ |

بە پێی مۆدێلی (ئەنگرام)، چەشنی کەسایەتی بەرەنگارکار، کە بەرزترین ناوەندی وەرگرت لە چەشنی کەسایەتی لە ناو نموونەکانی توێژینەوەکەیە، دەکەوێتە ناو چوارچێوەی غەریزە و چەشنی کەسایەتیی توێژەر، کە لە نێو

نموونەی توێژینەوەکە نزمترین ناوەندی هەبوو، دەکەوێتە چوارچێوەی سەنتەری بیرکردنەوە. چەشنی کەسایەتیی بەرەنگارکار ئەم خەسڵەتانەی هەیە: ئیرادەی زیندوو و بەهێزە، پارێزگاری لە خۆی دەکات لە ڕێگای ڕەتکردنەوەی کەسانی تر، و لەخۆباییە. بەپێی ئەم توێژینەوەیە، ئەم خەسڵەتانە زیاترین خەسڵەتن لە کەسایەتیی کوردیدا. لە بەرامبەر ئەوەشدا، چەشنی کەسایەتیی توێژەر ئەم خەسڵەتانەی تێدایە، کە بە کەمی لە کەسایەتیی کوردی تێبینی دەکرێت: سەربەخۆیی و گۆشەگیری، مێشك کراوەیی، توانای وردبوونەوە و تێگەیشتنی قووڵ و پێشبینی هەیە.

سەلاح هەورامی (٢٠١٣) وەسفی کەسایەتی کوردی دەکات بە نامۆیی (مغترب)، چونکە ئەم کەسایەتییە، بە بۆچوونی ئەو، سیستەمێکی تری بەهای هەڵگرتووە، و وەرگرتووە، کە ئیسلامە، جیا لە هی خۆی کە زەردەشتییە. ئەو توێژینەوە زیاتر لە وتارێکی سیاسی دەچێت، نەك لە توێژینەوەیەکی زانستی کە توێژەر هەوڵ بدات بە قووڵی و بە بابەتی و ڕێکوپێکی لە بابەتەکەی بکۆڵێتەوە. لێرەدا ئاماژەمان پێی کرد چونکە بابەتەکەی بە ناونیشانی کەسایەتی نەتەوەیی کوردە.

- **ئامانجی توێژینەوە:**

بە شێوەیەکی گشتی ئامانجی ئەم توێژینەوەیە زانینی خەسڵەتە سەرەکییەکانی کەسایەتیی کوردە بە بۆچوونی مامۆستایانی زانکۆکانی هەرێمی کوردستان، هەروەها توێژینەوە ئامانجی تایبەتی هەیە، کە بریتین لە:

١_ کام لە خەسڵەتی کەسایەتی کورد زیاتر دووبارە بۆتەوە؟

٢_ ئایا خەسڵەتە سەرەکییەکانی کەسایەتی کورد بە بۆچوونی مامۆستایانی زانکۆ دەگۆڕێت بە گۆڕانی، تەمەن، ڕەگەز، پسپۆری، بڕوانامە ، شوێنی وەرگرتنی بڕوانامە.

- **ڕێبازی توێژینەوە:**

سەبارەت بە کەسایەتی عێراقی، (قاسم حوسێن ساڵح)، لە توێژینەوەیەکیدا لە ساڵی (2007) ڕا و بۆچوونی هەندێ لە مامۆستاکانی زانکۆی وەرگرتووە

دەربارەی خەسڵەتە باش و خراپەکانی کەسایەتی عێراقی، ئەویش بە ئاراستەکردنی یەك پرسیار بۆ نموونەی توێژینەوەکەی. هەرچەندە ئێمەش لەم توێژینەوەیە هەوڵمانداوە ڕا وبۆچوونی مامۆستایانی زانکۆ وەربگرین، بەڵام پاش ئاراستەکردنی پرسیاری کراوە، ڕاپرسییەکمان ئامادەکرد لە وەڵامەکان (لەسەر شێوەی خەسڵەتی کەسایەتی) پاشان ئەم ڕاپرسییەمان ئاراستەی کۆمەڵێکی تر لە مامۆستایانی زانکۆ کرد.

- **زانیاری سەبارەت بە سامپڵی توێژینەوە:**

تەمەن: تەمەنی ئەندامانی سامپڵی توێژینەوە دەکەوێتە نێوان 24 ساڵ تا 61 ساڵ. و ناوەندی تەمەن بریتی بوو لە 38 ساڵ (بە لادانی پێوەری 8.43).

بڕوانامە: زیاتر لە نیوەی ئەندامانی سامپڵی توێژینەوە (59.3%) هەڵگری بڕوانامەی ماستەر بوون و ئەوانی تر هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا بوون ، تەنها یەکێکیان هەڵگری بڕوانامەی دبلۆمی باڵا بوو. دوو لە بەشداربووان ئاماژەیان بۆ بڕوانامەکەیان نەکرد.

**خشتەی ژمارە ١**

**دابەشبوونی سامپڵی توێژینەوە بەپێی بڕوانامە**

| بڕوانامە | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| دکتۆرا | 63 | 38.9 |
| ماستەر | 96 | 59.3 |
| دبلۆمی باڵا | 1 | .6 |
| نادیار | 2 | 1.2 |
| کۆ | 162 | 100.0 |

سەبارەت بە شوێنی وەرگرتنی بڕوانامە، زۆربەی زۆری بەشداربووان (١٣٢) و بەڕێژەی (81.5%) بڕوانامەکەیان لە ناوەوەی هەرێم یان عێراق وەرگرتبوو . ئەوانەی لە دەرەوەی هەرێم یان عیراق بڕوانامەیان وەرگرتبوو، ژمارەیان 29 کەس بوو، بە ڕێژەی. 17.9% ئەندامێك لە بەشداربووان ئاماژەی بەوە نەکرد کە لە

کوێـوە بڕوانامـەی وەرگرتـووە. ئـەوی پەیوەنـدی بـە ڕەگـەزەوە بێـت، زۆربـەی ئەندامانی (سامپڵ 115)، بە ڕێژەی (71%) نێر بوون.

سەبارەت بە دابەشبوونی ئەندامانی سامپڵ بە پێی فاکەڵتییـەکانیان، کـەمتر لـە نیـوەی بەشـداربووان (46.3%) لـە فاکـەڵتی ئـاداب یـان ئـەدەبیات و زانسـتە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکان و یاسا بـوون و کـەمترین ڕێـژەش (3.7%) لـە فاکـەڵتی پزیشکی یان پەرستیاری بوون.

**خشتەی ژمارە ٢**

**دابەشبوونی ئەندامانی سامپڵی توێژینەوە بەپێی فاکەڵتی**

| فاکەڵتی | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| ئەدەبیات، یاسا، ئابووری | 75 | 46.3 |
| پەروەردە | 61 | 37.7 |
| زانست | 12 | 7.4 |
| پزیشکی | 6 | 3.7 |
| کۆ | 154 | 95.1 |
| نادیار | 8 | 4.9 |
| کۆ | 162 | 100.0 |

بەپێی خشتەی ژمارە ٣، ئەو خەسڵەتانەی کە زیاتر لـە ٧٥٪ لـە ئەنـدامانی سامپڵی توێژینەوە دەیانداتە پاڵ کەسایەتی کوردی بەم شێوەیە:

**خشتەی ژمارە ٣**

**ئەو بڕگانەی کە زیاتر لە ٪٧٥ لە سامپڵی توێژینەوە بڕوایان وایە کە بە تەواوی یان زۆرجار لەسەر کەسایەتی کوردی جێبەجێ دەبێت**

| | بڕگە | بە تەواوی/زۆرجار جێبەجی دەبێت | | هەندێ جار جێبەجێ دەبێت | | کەم جار/هەرگیز جێبەجێ نابێت | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | دووبارە بوونەوە | % | دووبارە بوونەوە | % | دووبارە بوونەوە | % |
| ١. | کەسایەتی کوردی خۆشباوەڕە. | 118 | 85.2 | 16 | 9.9 | 1 | .6 |
| ٢. | خێرایە لە بڕیاردان. | 124 | 76.6 | 27 | 16.7 | 7 | 4.3 |

| ژ | خەسڵەت | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| .٣ | ڕێز لە میوان دەگرێت. | 148 | 91.4 | 11 | 6.8 | 2 | 1.2 |
| .٤ | حەزی لە مندالی زۆرە. | 126 | 77.8 | 27 | 16.7 | 6 | 3.7 |
| .٥ | خۆبەکەمزانە بەرامبەر بێگانە. | 123 | 75.9 | 20 | 12.3 | 14 | 8.7 |
| .٦ | شانازی بە شەرەف دەکات. | 133 | 82.1 | 11 | 6.8 | 5 | 3.1 |
| .٧ | دەیەوێت بە زووترین کات زۆرترین سەرمایە کۆبکاتەوە. | 141 | 87.1 | 17 | 10.5 | 3 | 1.8 |
| .٨ | متمانەی بە کەسی بێگانە هەیە. | 125 | 77.2 | 21 | 13.0 | 12 | 7.4 |
| .٩ | بیّ قەناعەتە. | 129 | 79.7 | 19 | 11.7 | 11 | 6.8 |
| .١٠ | حەز لە قسە و قسەلۆك دەكات. | 127 | 78.4 | 20 | 12.3 | 12 | 7.4 |
| ١١ | هەست دەکات هەمیشە قوربانییە. | 130 | 80.2 | 19 | 11.7 | 11 | 6.8 |
| ١٢ | نەبوونی بڕوا بە سەرکردەکانی. | 123 | 76.0 | 22 | 13.6 | 16 | 9.9 |
| ١٣ | خۆی وا پیشان دەدات کە هەموو شت دەزانێت. | 134 | 82.7 | 16 | 9.9 | 8 | 4.9 |
| ١٤ | کاتی لا گرنگ نییە. | 146 | 90.1 | 6 | 3.7 | 8 | 4.9 |

بـە شـێوەیەکی گشـتی ئـەم خەسـڵەتانە بـە بـڕوای زۆربـەی زۆری سـامپڵی توێژینەوە لە کەسایەتی کوردیدا هەیە ئەمانەی خوارەوەیە :

ڕێزگرتن لە مێوان، گرنگی نەدان بە کات، کۆکردنەوەی سەرمایە بە زووتـرین کات، خۆشباوەڕی، خۆبە زانا پێشاندان، شانازیکردن بە شەرەف، هەسـتکردن بـە قوربانی، بیّ قەناعەتی، حـەزکردن لـە قسـە و قسـەلۆك، حـەزی لـە منـداڵی زۆرە، متمانەی بە کەسی بێگانەیە، خێرایە لە بڕیاردان، خـۆی بەرامبـەر بێگانـە بـە کـەم دەزانێت.

ڕێژەی ( 91.4% ) لە بەشداربووان پێیان وابوو، کە خەسڵەتی (ڕێز لـە مێـوان دەگرێـت) خەسـڵەتێکی بـە تـەواوی یـان زۆربـەی جـار لەسـەر کەسـایەتی کـوردی

جێبەجێ دەبێت. ئەم خەسڵەتە زیاترین هاودەنگی لەسەر بوو لەلایەن بەشداربووان. ئەم خەسڵەتەش بە خەسڵەتێکی باش دادەنرێت.

ئەو خەسڵەتانەی کە زۆربەی هەرە زۆری مامۆستایانی زانکۆ هاودەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە بە تەواوی و زۆر جار لەسەر کەسایەتی کوردیدا جێبەجێ دەبێت، خەسڵەتی (کاتی لا گرنگ نییە) . نزیکەی 90% لە بەشداربووان پێیان وابوو کە گرنگی نەدان بە کات خەسڵەتی کەسایەتی کوردییە. جێگای داخە کە ئەم خەسڵەتەخەسڵەتێکی خراپی کەسایەتییە . هەروەها ڕێژەی 87.1% بڕوایان وایە کە کەسایەتی کوردی (دەیەوێت بە زووترین کات زۆرترین سەرمایە کۆ بکاتەوە). هەرچەندە دەکرێ ئەم خەسڵەتە باش بێت یان خراپ، واپێدەچێت کە مامۆستایانی زانکۆ بە خەسڵەتێکی باشی دانانێن.

ڕێژەی 85.2% لە بەشداربووان بڕوایان وابوو، کە کەسایەتی کوردی کەسایەتییەکی خۆشباوەڕە. خۆشباوەڕی خەسڵەتێکی خراپی کەسایەتییە کە خاوەنەکەی تووشی کێشەی جۆراوجۆر دەکات، بە تایبەتی لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ کەسان و میللەتانی تردا.

هەروەها 82.7% لە بەشداربووان بڕوایان وابوو کە خەسڵەتی (خۆی واپیشان دەدات کە هەموو شت دەزانێت) بە تەواوی یان تا رادەیەکی زۆر لەسەر کەسایەتی کوردی جێبەجێ دەبێت. ئەم جۆرە لە غرووری زانستی خەسڵەتێکی ناپەسەندە لە ڕوانگەی مامۆستایانی زانکۆدا. ئەگەر کەسێك خۆی واپێشان بدات کە هەموو شت دەزانێت، ئەوا پێویست ناکات لە کەسانی تر فێری شت ببێت، ئەگەر ئەو کەسەش خوێندکار بێت، ئەوا ئەو جۆرە خەسڵەتە دەبێتە ڕێگر و ئەستەنگ لەبەردەم فێربووندا.

ڕێژەی 82.1% لە بەشداربووان هاودەنگ بوون کە کورد (شانازی بە شەرەف دەکات). ئەم ڕێژەیە بڕوایان وابوو کە ئەم خەسڵەتە بە تەواوی و تا ڕادەیەکی زۆر لەسەر کەسایەتی کورد جێبەجێ دەبێت. ئەم خەسڵەتەش لە ڕوانگەی کەلتووری کوردیدا، خەسڵەتیکی باشە.

هەروەها ڕێژەی 80.2% بڕوایان وابوو کە کەسایەتی کوردی (هەمیشە هەست دەکات کە قوربانییە). ئەم خەسڵەتە لە ڕووی دەروونییەوە باش نییە،

